رۆمان

# زامەکان دەکولێنەوە

بەهـرام محەمەد

ناوی کتێب : زامەکان دەکولێنەوە
بابەت : ڕۆمان
نووسەر : بەهرام محەمەد
پیتچنین : نووسەر
هەڵەچنی : نووسەر
نەخشەسازی ناوەڕۆك : شاخەوان جەعفەر
نەخشەسازی بەرگ : ئامانج ئەمین
تیراژ : ٥٠٠ دانە
چاپ : چاپی یەکەم - چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر/ ٢٠١٨
نرخ : ٤٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردن (١١١)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە

# پێشخۆرێک

خاوەنی کەللەیەکم دووچاوی زەق ودووگوێی قیتی تێدایە. هەر لە سەرەوە تا خوارەوەم هەموو خەسلەتەکانی پیاوەتیم هەیە، ئەوە هەر قسەی خۆم نییە ژنەکەشم وا دەڵێ و بە هەر دە پە نجان ئەوشایەدیەم بۆدەدا،خۆشم بە تەنها لە دادگاکاندا بە شایەتحاڵێک دەچم، شایەتحاڵی بەسەرهاتێک کەساڵانێک لەمەوبەر روویداوە.. لاتان گرنگ نەبێ من کێم و کوڕی کێم، من نە پاڵەوانی ئەو بەسەرهاتەم و نە کلکی پاڵەوان، ڕۆڵی من لە پشتی پەردەوە تەنها زیندووکردنەوەو گێڕانەوەیەتی بۆتان.. من چەندە خۆم بە پیاو دەزانم، لەوەش زیاتر کۆمەڵایەتیم و حەزم لە تێکەڵبوونە هاتوچۆی مەجلیس و دیوەخان و کۆڕو کۆبوونەوەی هەموو جۆرە پیاوان دەکەم، مێشکیشم ساف و بێ گەردە و هیچ گرێ و گۆڵ و کەلێن و کەلەبەروخوارو خێچیەکی تێدا نییە،هەر کۆمپیوتەرێکی بێ ڤایرۆسە. وەک چۆن لە ناویدا تۆمارو پاکنووس کراوە. بە هەمان دەق و بەنەگەچراوی تێیدا دەردەچێت:

ڕۆژێک چەند هاوڕێیەک پێکەوە دانیشتبووین، مشتومڕگەرم بوو، هەر یەکە و بە جۆرێک باسی ژیانی دەکرد، ژیان بەگشتی نەک هەر تەنها ژیانی تایبەتی خۆی، یان نەک ژیان ناوێک. هەموویان ببوونە تیۆرسازو بەکەیفی خۆیان ڕەوسەی ژیانیان شەنەبا دەکردو هەردەنکەکیان بەلایەکدا دەبرد.

یەکێک لەوان بەجۆرێک وەسفی ژیانی دەکردو دەیفەرموو: ژیان وەک مەنجەڵی ساواریە لەسەر سێکوچکەی (بەخت- پارە- هێز) دەکوڵێ و دەبێتە دانوولە و دەیخۆین، هەروەها ئەو دەیگۆ: هێزت هەبێ رێزت دە بێ، بەختت هەبێ تەختت دەبێ، پارەش مۆرە، مۆر لای کێ بێ ئەو پاشایە. دیاربوو بۆ هەر تیۆرێک دژە تیۆرێکی دیکە هەبوو..ئەوەی بەرامبەری هەستایەوە سەر پێیان و لووتی بە لووتییەوە نا: ئەوەندەبە

سادەیی سەیری ژیان مەکە، مەنجەڵی ساواری چی وحاڵی چی- ژیان پەشماڵە، یەک ستوون بەرزی کردۆتەوە ئەویش (عەقڵ)ە- هەروەها دەیگو:عەقڵ هێز پەیدا دەکا، هێزیش پارە بەدەست دەهێنێ، هێزو پارەش بەخت پەیدا دەکەن.

من هیچ تیۆرێکم شەنەباو شەن و کەو نەکرد. ناوی هیچ پیتۆڵ و بیردۆزێکم نەهێنا. تەنها چیرۆکێکی دوورو درێژم بۆباسکردن کەلە دەوی پاڵەوانەکانی ئەو چیرۆکە خۆیانم بیستبوو.. هاورێکانم کە زانییان ئەوچیرۆکەدرێژەی دەیگێڕمەوە پەیوەندی بە باسەکەی ئەوانەوە هەیە،ژیرانە دانیشتن و گوێیان لێگرتم، بەڵێنیشیان دا شەوانە کتڵی چای و جەزوەی قاوە لەسەر پەنگری ئاگری داری قەراشکەری بەردەوام بێ. منیش لە بەرئەوەی چیرۆکەکە زۆر درێژ بوو بە شەوێک و دووان تەواو نەدەبوو. بەچەندین شەوو قۆناغ بە قۆناغی چیرۆکە درێژەکەم بۆ کردنە مێوژو گوێزو بادەمی شەوچەرەی ئەو شەوانە و چۆنم بیستبوو وام بۆ گێڕانەوە:

# ١

ساڵی ١٩٥٣ بوو ئینگلیز ماوەیەک بوو عیراقی داگیر کردبوو.عیراق خاکێکی پڕ خێری هەبوو، ئەو لیکاوو خوێنی بۆ ڕشتبوو.فەرمانڕەوایەتی لەو وڵاتەدا بنەماڵەیی بوو، ئەو بنەماڵەیەبەخت یاوەریان بوو،بەختیان لە ژێر تاجێکی زێڕین دابوو. تەختیان هەبوو، تەختیش لە ناو کۆشکێکی مەزندابوو.کوڕی بەر مەمکان، لە جێی باوکی مردووی، لە سەر تەختی پاشایەتی وەک پەیکەرێک داندرابوو. هەرچی بڵێی لەو وڵاتەدا هەبوو: ئەنجومەنی وەزیران و پەرلەمان، پۆلیس وسوپا، دادوەرو دادگا، سەروەت و سامان و نەوتیش هەبوو. لە هەموو دەڤەرو شاران، لە هەرێم و ناوچە جیا جیاکان، پیاوی ماقول و ناماقول ئەندام پەرلەمان بوون، هیچیان هیچ نەبوون ئینگلیز ئەو وڵاتەی بەڕێوە دەبردو هەموو شتێک لە دەست و مست و ژێر فەرمانی ئەودابوو. بەغدا پایتەختی ئەو وڵاتە بوو، هەموو جۆرە ڕەنگ و ڕەگەزێکی تێدابوو، کوردیش دەنگ و ڕەنگ و سەنگی هەبوو،لەو پایتەختەداپشکی بەرکەوتبوو، کارگێڕو لێپرسراوی گەورەو وەزیری پایەبەرزو سوپاسالاری شیاوی هەبوو، نەزان بوو لچکە عەبای ڕزیوی عوسمان پاشای بەرنەدەدا ئەگەرنا پاشاشی دەبوو. سەرەڕای ئەوانە مەلای مزگەوتی کۆڵانێک لە کۆڵانەکانی گەڕەکێک لە گەڕەکەکانی ئەو شارەش کورد بوو. کەوێ و سەڵتەی لەبەردابوو، جوبە و عەمامەشی هەبوو، بە کوردییەکی پەتی و پاراوی لای خۆمان دەدواو عارەبییەکی فەسیحیشی دەزانی. ئەو مەلازادە بوو کەمێک فارسی و تورکیش لە مەلای باوکی فێرببوو، لە عیلمی کەلام و بەلاغە و سەرف و نەحو لەبلەبان بوو، ئایەت و فەرموودەکانی ئەزبەر بوو، لەحینجەیی وشەکاندا هاوتای نەبوو، ڕووخۆش و بە مەشرەف بوو، دۆست و ئەحبابی زۆر بوو، سەروەت و سامان و دایک و باوک وخوشک وبراو کەسی نزیکی لەو پایتەختەدا نەبوو، ئەوەی هەیبوو چەند کتێبێکی ناو حوجرەی مزگەوتێک و باوەشێک خەم بوو. ڕۆژەکانی بە نوێژو نزاو پاڕانەوە و پێشنوێژو وتار خوێندنەوە، گاڵتە و گەپ ودەمەتەقێ بەسەردەبرد، شەوەکانیشی هەندێکیان لێی دەبوونە زڕەخەونی جڕناو فڕنا، هەندێکیشیان دێوو دەعبا. شەوان تەنیایی لوولی دەدا، فڕێی دەدا، بێ هۆش وبێ مێشک وسەنتەر بۆت شکاو دەڕۆیشت و دەکەوت،

دەڕۆیشــت و دەگەڕایــەوە، دەبــووە پەرەســێلکە قــوڕو ئــاوی تێکەڵدەکــرد، لــە بنمیچــی خانــووی ماڵێــک هێلانــەی دروســتدەکرد، ئــەو دروســتیدەکرد لاسارێک لێــی تێکدەدا،ناچــار دەگەڕایــەوە. شــەوان تەنیایــی بایــدەدا بەمــلاو بەولایــدادەدا، دەکەوتــە دەشــت و دەر گێــژ دەبــوو تاکــو بەیانــی نەدەگەڕایــەوە، شــەوان بیــری دەبــووە چەقۆیەکــی ژەنــگاوی کــول، زەینــی کۆلــەوار. دەبــووە کۆترێکــی شــین بەنــاو دارە ســووتاوەکاندا دەگــەڕاو دەســووڕا، بــۆرو چلکــن و ڕەشــهەڵدەگەڕا.

مــەلا دوو زامــی گــەورەی لــە جــەرگ و دڵــی دابوو،نــاوە نــاوە یــەک لــە دوای یــەک بــە نــۆرە دە کولانــەوە، دەچزانــەوە، ژانیــان دەگــرت و دەتلانەوە.دەســتی بــۆ ئاســمان بەرزکــردەوە وەک بێدەســەڵاتیک دەیکــردە نــووزە نووزودەنزایــەوە، دەپاڕایــەوە..دوو زام، دوو خەمــی گــەورە خەویــان لێــزەوت کردبــوو، مێشــکیان دا بــووە بــەر نووکــی دەرزییــان- خەمــی (نیشــتمان) و (نیشــتمان)- نیشــتمانی دایــک و نیشــتمانی هاوســەری.

شــەو ڕاشــکا دێوەزمــەی بێدەنگــی چــوار دەوری تەنی.هەســتیکرد قورسایيەکی قــورس ســەر ســینگی دەگری،دیســان دەســتی بــۆ ئاســمان بــەرز کــردەوە و منــە منێکــی کــرد، هــەورە تریشــقەی دەروونــی تاوێــک بارانــی بارانــدە هەنــاوی، هــەوری ڕەش پــەرش و بــڵاو بــووەوە و دنیــای جەســتەی برینگانــدی.. کتێبەکــەی بــەلاوە نــاو بــە پەلــە پفێکــی پــڕ بــە گوپــی خێوانــدە چــرا ڕەشــکەی تەنیشــتی، کــورژەی کــردو قــەد قــەد بــووەوە. وەک کەروێشــکی چــاو کــراوەی نــاو لانــە بــە هەســت و خوســت بــۆرژا، هــەوارو جێنەزەرگــەی باپیــران بــەری شاشــەی چاویــان گــرت و بەریــان نــەدا، بــووە تیســکە خورییــەک بــە شــانەی تەونــی مێشــکە جاڵجاڵۆکییەکــەی خــۆی دایهێنــا، کەللــەی بــوو بــە تەشــی و بایداو ڕستی، بــوو بــە گلۆلــەی (بــا)-گلۆڵــەی بایــە و هەڵیدایــە و قــەت نەبڕایــە- شــەقشــەقە و کۆترۆکــە و گۆڵمێــک مــۆرووی ڕەنــگاو ڕەنــگ و چەنــد جێیــەک ڕەحەتــە لوقــم وشــەکرۆکەی کەســک و ســۆری شــاری خســتە نــاو چەنــد کیســەیەک، سوســکەڕۆ پێــی لێنــاو بــە ڕێکــەوت: ئەوانــە هەندێکیــان بــۆ بەرخەکەم،هەندێکیشــیان بــۆ منداڵانــی گونــدی، بەرخەکــەم کۆرپەلــە بوو،لــە نــاو زگــی دایکیدابــوو بەجێمهێشــت، ئێســتا فەراقــە و خــەم ڕەوێنــەوە بــووە.. ئۆخــەی خەپەتۆڵەکــەم لەوانەیــە نەمناســییەوە. کــە دەچمــەوە ئەگــەر لــە نــاو لانکــێ دابــوو ســەرچاوکەکەی لادەدەم و حەمایلۆکەکــە و دەســترازەکەی شــل دەکەمــەوە، دوو ســێ جــار شەقشــەقەکەی بــۆ ڕادەوەشــێنم،

چەندجارێک قدیلانەی دەکەمەوە، گدی گدی و چەپان چەپانی بۆ دەکەم دەزریقێتەوە، پەنجەکانی قژ دەکاتەوەو دەست بە چەپڵە لێدانێک دەکات هەر مە پرسە، منیش تێر ماچی دەکەم.. ئەگەر لە ناو لانکێش نەبوو لە باوەشی دەگرم و ماچی دەکەم، هەندێک لەو شەکرۆکە و لوقمانەی دەدەمێ عەمی دەکات. دڵنیام پرچی بەگروازەیە بە خۆم دەچێت،چاویشی قەزوانییە کتومت دایکیەتی.. هەر لەو کاتەیماڵەکەی خۆمانم بەجێهێشتووە لەوانەیە هاوسەرەکەم خۆی و کورەکەی گەڕابنەوە گوندی و لە گەڵ دایک و باوکم نیشتەجێ بووبن. قەوم وقیلەش چاوەڕێمن بەینێکە نەیانبینیوم.

هەر لەو خەوە و بەو شەوە گەیشتە نزیک گوندی، تۆزێک سەنگرایەوە و زیاتر تێفکری: نێوان گوندو ڕووبارەکەی بەرماڵان چرکەڵان بوو، بەرە و خوارتر چەولگ و زیخەڵان بوو، لەوێش بە دواوە و تا بەرە و خوارتریش دەچووی نەورایی و سەیناغێکی هەمیشە تەڕ بوو، ناو گوندیش لە بەر پێخوستی خەڵک و مەڕو ماڵاتان خۆڵە پۆک بوو، بەشی ئە و دیوی ڕووبارەکەش خاکێکی زەنە کاوی و مەیلە و زێلاق بوو، بۆق و قرژاڵ و سلحەواشی زۆر بوو. قازو قوڵینگ و قاژقاژە و تیترواسکیش لەو ناوەدا پیاسەیان دەکرد.

مەلا پێی چەقاند وبیری خەست ترو چڕتر کردە وە: هەوە هەونییەی پێ ناوێ هەر خۆیەتی... بە هەردوو چاوی هێلێکی ڕاستی بەرە و شوێنێکی ڕووبارەکە کێشا وخۆشڕۆیانە ڕێی گرتە بەر، بە سەر بەردەبازی ڕووبارەکە پەڕییەوە: ماڵی ئێمە سەرپەڕگە بوو، سەری خانووەکەمان بە دارئەسپیندارو کەبەرگیرابوو، وەستا بۆرە هەردوو ژوورە لابیانیەکەی دواوەی قیناج و لاخوار دروستکردبوو، خەڵکی گوندی ناویان لێنابوو- پاقلاوەکەی ماڵی مەلای -ئای وەستا بۆرە خەفەتت چەند زۆرە، لە سەر شەڕە سەگێک زەلامێکت کوشت و گوندت بەجێهێشت و لێتدا ڕۆیشتی، خانووەکەی ئێمەشت سەقەت کرد، چەند پیاوێکی خراپ بووی دارو بەرد لە دە ستت بە دادە داد بوو، هەی ڕوو زەردی دنیاو قیامەت بی وجێی خۆشیت ناوەندی دۆزەخ بی، بووە لە سەر قوڕانەوەی سەگێک- حەمە بەردێکی خێواندبووە تەنگەی- پیاوێک بدەیە بەر خەنجەران و فەراقی لێببڕی. دەی حەقمان چییە بزن بە پێی خۆی و مەڕیش بە پێی خۆی.

هەر لەو خەون و خەیاڵەدا گەیشتە ناو گوندی هەستێکی دیکەی ڕاگرت و چەقوولەی بیری خۆی لە ڕەندە داو زیاتر تیژی کردەوە: دیواری حەوشەمان نەزۆر نزم و نەزۆر بەرزیش بوو، چەند ڕیزێک خشتی هیشکە کەڵەک لە سەر یەکدی داندرابوون. یاخوا حەمە جێت ناوەندی بەهەشت بێ، خشتەکان بە خشتبڕی ئەو بڕابوون، لە ئێمە سوێندو لەوی سوێند دەیگوت: چۆن پارەی لە ماڵی مەلای وەردەگرم... مەلای باوکم خەڵک خۆشیان دەویست، لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانیاندا ڕدێن سپیاتی بۆ دەکردن. مەلاژنی دایکیشم لە لاچەپی دەرگای حەوشە کۆلیتێکی خنجیلانە و چاڵاوگێکی پڕ ئاوی بۆ مریشک و جووجەڵەکان ڕێکخستبوو، کە ئێوارە دادەهات دەچووە بەر دەرگای کۆلیتەکە، سێ چوار جار- تی تی- لێدە کردن و لە ترسی دزو حیزو چەقەڵ و ڕێوییان لە کۆلیتێی دەکردن و هە تا سبەینێ دەرگای لەسەردادەخستن و خشت کلیلی دەدا. گۆرە سەگێکی مرە مرکەری گەورەشی وەکو دابەستی دابەستابوو، لە بەرامبەر کۆلیتی مریشکەکان سەخۆرکێکی بۆ ڕێکخستبوو، چ نان وچەورایەتی ئەو ماڵە لە خۆیان زیاد دەبوو دەیهاوێشتە بەری و سەگەکەش شەوانە دەبووە پاسەوانی ماڵ ومریشک وجووجەڵەکان. دایکم لە حیسابان زۆر کۆڵەوار بوو هەموو جارێ هەر بە سوحبەت پێم دەگوت: دایە چەند مریشک و جووجەڵەت هەیە؟ دەیگوت: کوڕم جووجەڵەکان وردن قەت نەمژماردینە. بۆ مریشکەکانیش پێنج بەنجەی دەستێکی دەنووشتاندنەوە وسێ جار بەرزو نزمی دەکردنەوە و دەیگوت: پێش ڕەمەزانێ پێنج و پێنج و پێنجمان هەبوو، بەخۆت دەزانی مەلا نەوسنن، هەرلە ناو سێ چوار ڕۆژان جارێک باوکت مریشکێکی پێ لە عاردی دەدام و دەیگوت: مەلاژن قیرە بڕی بکە با بۆ ئێوارێ بە چەلاوی خۆی بیخۆین بەڵکو شنگمان دێتەوە بەرێ و بەرگەی ڕۆژووەکان دەگرین، منیش قەت بێدڵی باوکتم نەکرد. مەلای باوکت دڵی فراوان و چاو تێرە خوداش بە دڵی دەکا، هەتا ئەمڕۆش هەستمان بەناگزووری نەکردییە و نازانین نەبووە چییە. خەڵکی ئەم گوندەش زۆر مەردن و بەرامبەر ئێمە کەم و کورییان نییە، پارچەیەک زەوییان پێداوین و لەبۆمان دادەچێنن، هەربەخۆشیان بەزبارە خەلەو خەرمانەکەمان لەبۆ بەناو دەهێنن و ئێمە بەس بە حازرەکی بەرەکەی دەخۆین.ساڵانەش ئەوانەی زیاتر لە چل سەر مەڕو بزنیان هەیە، هەر یەکەو قلێکمان لەباتی زەکات بۆ بە

لاوەدەنێـن، خەریکـە ببنـە کوتـە مێگەلێـک، بەخێوکـردن و شوانیەکەشـی هـەر مانگـەی ماڵێـک دەیخاتـە ئەسـتۆی خۆی.سـەرەڕای ئـەوەش باوکـت لێـرە بێـزارە.
کـوڕم مـەلا قورئـان خوێنـە، حوجرەیەکـی پـڕ کتێبـی هەیـە وسـینگی پـڕە، ئـەو وەکـو مـن نییـە هەسـت بەخشـپەی پێـی پشـیلەش دەکا. شـەوان کـە پێکـەوە دەبیـن-خـۆ هـەر شـەوان دەگەینـە یـەک، بـە ڕۆژ لەبەرنوێـژو خوێندنـەوە و بەڕێکردنـی میوانەکانـی یـان لەمزگەوتـە یانیـش لـە حوجرەکـەی خـۆی- جارجـارە هەنـدێ شـتم لـەلا دەدرکێنـێ. ئـەو شـارەزام بـووە دەزانـێ مـن دەوێ خـۆم بـەدەرزی دلیـوان قەمامرێـژ کـردووە، وەکـو هەنـدێ ژنـان نیمـە دەمشـرو بـێ لغاویـم.. باوکـت دەیگـوت: بـرا گـەورەی گونـدی مەلایەکـی دەوێ ڕۆژانـە سـەردانی دیوەخانەکـەی بـکات و لـە تەنیشـتە خـۆی دابینـێ ویەهەمـوو ڕاسـت ودرۆیەکانـی بڵـێ ئەشـەدوو. کـوڕم، مـەلای باوکـت پیاوێکـی سـرپۆش بـوو، جەسـتەیەکی پـڕ لـە نهێنـی هەبـوو، هەمـوو نهێنیەکانـی زەمانـە، ئەوانـەی هەریەکەیـان کتێبێـک بـوو، لـە سـەر ڕەفەکانـی کەللەیـدا ڕیـزی کردبـوون، تۆزیـان گرتبـوو، لـە خـۆی زیاتـر کەسـی دی نەیخوێندبوونـەوە. کەللـەی ژووری نهێنیـەکان بـوو، ئـەو ژوورەی تەنهـا یـەک قوفلـی هەبـوو، قوفلەکـەش تەنیـا یـەک کلیلـی هەبـوو، کلیلەکـەش تەنهـا لـە یـەک شـوێن بـوو، ئەویـش باخەڵـی خـۆی بـوو. ئـەو نهێنیانـەی هـەردوو لێـوی بەسـەریاندا قەمامرێـژ کردبـوون بڤـە بـوون، ئەوانـەی نەدەگوتـران، ئەوانـەی نەدەبـوو کـەس بیانزانـی، ئەوانـەی ئەگـەر بکەوتوونایـە زاری کەسـانی دی دەبـووە حەشـر، خوێـن دەڕژا و بـرا بـرای دەکوشـت، خەڵکانێـک شـوێنبزر دەکـران، زیندانـەکان پـڕ دەبـوون.. زۆر جـار لـە نێـوان خـۆی و خـوای خۆیـدا ئـەو نهێنیانـەی ورد دەکردنـەوە، قـل قـل ئاودیـوی دەکـردن، لـە بچووکـەوە بـۆ گـەورە، لـە بڤەکانـەوە بـۆ هـەرە بڤـەکان، لـە ترسـناکەکانەوە بـۆ ترسـناکترینەکان دەیژمـاردن. مـەلا لـە فیتـە فیتـی تـووڕ تـوورەی حەسحەسـەکان بـە ئـاگا هـات، کـە لەسـەرمان و لەترسـان دانەدەسـەکنان: ئـای بەنەفـرەت بـن نەیـان هێشـت دیشـلەمە شـیرینەکانی دایکـم لەنـاو چایەکـەی منـدا بـە تـەواوی بتوێنـەوە و ژانـە سـەرەکەم لاببـەن.. ئـای دایـە گیـان چەنـد خۆشـم دەویسـتی تـۆ هـەر دایکمـان نەبـووی، باشـترین و بەوەفاتریـن هاوڕێـی مـەلای باوکمـان بـووی..

دایکـم ئافرەتێکـی بەهێـز بـوو، ئـەو وا هەسـتی دەکـرد هەمـوو ئەندامەکانـی جەسـتەی کارو فرمانەکانـی خۆیـان بەتـەواوی جێبەجـێ دەکـەن و هـاوکاری و

هاوسەنگییەکی ڕێک وپێک لە نێوانیاندا هەیە. دایکم لە ناخیدا هێزێکی لەڕادە بەدەرو توانایەکی بێ سنوور هەبوو، بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەیتوانی هەر شتێکی بوێ بیکات،ئەو لە هەر شانەیەک لە شانەکانی جەستەیدا تەوژمێکی خوێنی گەش هەبوو، هەست و سۆزی متمانە بە خۆکردنی پێدەدا، بڕوا بە خۆکردن بە درێژایی تەمەنی لە گیانیدا چەکەرەی کردبوو، ئەو بەبێ هۆ تووڕە نەدەبوو، ئەگەر بەهەر هۆکارێکی نابەجێش تووڕە بووایە هەر ئەوچرکەیە و ئەو دەمەبوو، ئەو تووڕەیی و هەڵچوونەی بە فوێک بە بایدەدا و نەیدەکردە ژەهرو نەیدەخستە هەناوی خۆی، سەرنج و ڕای هەموو کەسێکی بە سینگی فراوان وەردەگرت، درێژەی بەگفتوگۆیەکانی نەدەداو چەند و چۆنی بەدوادا نەدەکردن، ئەودەیگوت: کێشەکانی خەڵک بە من چی خۆیان چارەی دەکەن، بیکەن نەیکەن هی ئەوانە بە من چی؟ کەس بیر لە کێشەکانی من دەکاتەوە. نەخێر ئەگەر کێشەکانم گرد بن ئەوان دەیکەنە چیا، بەڵام من کوا کیشەم هەیە، پارووەنانێکی ڕەق و گۆڵمە ماستێکی ترشاوم دەست کەوێ شاژنم، شاژن چییە؟ لە ترسی خەڵکەکەی خۆی نەوەک بیکوژن، وەکو مشک بۆ هەر کوێ بڕوا گوێی قیتە. سوپاس بۆ خوا نەخۆش نیمە و پێویستیم بە دکتۆران نییە، نەخۆشیش بم ناچمە لایان. گوریسکێشکانێم پێدەکەن، گوریسەکانیشیان زۆر درێژە و کۆتایی نایێ، ئەمڕۆ بڕۆ سبەی وەرەوە درێژە دەکێشێ، نەخۆشییەکت لێ دەکەنە سێ و چوار. بۆ نەخۆش بم ئەوەی خەم بێ لەکەللەمدا نییە، ئەوەی دوێنێ ڕۆی بە- با- م داو سەد بەردم بە دوادا هاوێشت، کیری ئەمڕۆش بە قوونی سبە ی، هی سبەینێش بە هی دووسبەی و بەمجۆرە هەتا ماوم. هەموو کە سێکیش دەمری بۆ خەمی لێبخۆم.زۆر بخۆی و کەم بخۆی، چ لە کۆشکێک و چ لە کەلاوەیەکدا بژی هەر دەمری، مردن براگەورەی هەموومانە. مادام هەموومان دەمرین و هەمووشمان تەنها دوو گەز جاوی سپی دەکرێتە کفنمان و وەکو یەکدی دەخرێینە ناو گۆڕی تەنگ و تاریک بۆچی خەمی لێ بخۆم. خەم و جغارە بکوژن، چاک نییە جغارە دوور مەودایە تا زۆری لێ نەخۆی و بە ناو ساڵ نەکەوی کارت لێناکا، خەم وانییە کە مێکی لێ بخۆی گێژو وێژت دەکا، زۆری لێ بخۆی شێتت دەکا،سیس وپووت و لەڕو لاوازت دەکا، ڕەنگت دەکاتە هەناری زەرد.

مـەلا قسـەکانی دایـک و باوکـی ئـەوەی لـە بیـری مـا بـوو سـەر لەبـەر گێڕایـەوە، کوتـە کوتـی هەنـاوی دامرکایـەوە... بـەڵام کەسـێک بـا هـەر مـەلا بیـت، بـا دکتـۆرای لـە فەلسـەفە و دەروونناسیشـدا هەبێـت، هەرچـی بێـت، هەرکـێ بێـت ئەگـەر کۆلێـک خەمـی لـە پشـتی خـۆی بارکردبێـت، چـۆن بـە گێڕانـەوەی ئـەو گۆڵمـە یادگارییـە تاڵانـە واز دەهێنێـت، بێگومـان واز ناهێنێـت، ئـێ بـۆ واز بهێنێـت؟ ئـەوە نییـە شـەوان خەفـەت قوڕقوڕاگـەی دەگـری، ناچـار خـۆی بـە هەمـوو لایەکـدا دەدا بـۆ ئـەوەی نەخنکـێ، بـۆ ئـەوەی لـەو چرنووکـە ڕەشـانەی خنخناگەیـان گرتـووە ڕزگار بێت، بـۆ ئـەوەی هەمـوو شـەوێ یـەک قومـە نەفـەس، یـەک پشـیە هـەوا بـە گەروویـدا بچێتـە خـوارەوە، لـە پێنـاو ئـەو تـۆزە هیوایـە، بـۆ کەمێـک فەرامۆشـی و ئاسـوودە بـوون. بـووە پەڕەسـێلکەی بەهـاران هێلانـەی کۆنکریتـی لـە نێـوان دەسـتەک و کاریتەکانـی بنمیچـەی ژووره کۆنەکەیـان دروسـتکرد، بـە باڵـە مەقەسـییەکانی لـە نـاو هـەواو بۆشـایی ژوورەکـەدا مەلەیکـرد و هەمـوو کـون و قوژبنەکانـی پشـکنی. هەمـوو یادگارییەکانـی چەنـد سـاڵ لەمـە و بـەری لـە تاخچکـە و هـەرزارە و دەلاقـەو بوخچـە بووکینیەکـەی نـاو سـندووقە دارەکـەی خـۆی و هاوسـەرەکەی بەرجەسـتەکرد: هەرتەنهابـۆ شـەوێکیش بێـت بگەڕابوومایـەوە نـاو ئـەو ژوورەی سـتەمکارێک داگیریکـرد، کلیلـی سـندووقەکەیم لەلایـە، کراسـە بووکینیەکەیـم دەردەهێنـا تێرتێـر بۆنـم دەکـرد.

مـەلا کۆنـە داسـی کولبـووی بیـری هەرچەنـدە دەمـی چـەور دەکـرد و لـە هەسـانی دەدا، قرشـەی ویسـت و ئارەزووەکانـی نەدەبڕی: خانووێکـی بەسـەریەکدا ڕووخـاوی ماتەمبـار بشـیگەمێ ژوورەکـەی خۆمـان نادۆزمـەوە. بیرۆکەیـەک لـە نـاو مێشـکیدا بـە دوای دەرفـەت و پەنجەرەیەکـی کـراوەدا دەگـەڕا لێـی دەربـاز بێـت بـۆی نەدەڕەخسـا: کـەواو جوببـەو عەمامەکـەم فڕێـدەدەم دەچمـە ریـزی ئـەو گروپـە چەقۆکێشـە چەتەگەرییانـەی ئـەم شـارەیان هەراسـانکردووە، ئـەو بەسـەر هاتەمیـان بـۆ دەگێڕمـەوە و داوای هاوکارییـان لێدەکـەم، مەگـەر هـەر ئـەوان بتوانـن یارمەتیـم بـدەن.

سـەری ببـووە مەنجەڵێکـی ڕەش بـە بـێ سـاوار لەسـەرئاگرێکی گـەش دەکوڵا، ناوچەوانـی لـە گرژییـان قـەد قـەد ببـوو، کۆنترۆڵـی لەسـەر مێشـکی نەمـاو لەپـڕ سـەری وەک گاشـەبەردێک بەسـەر سـەرینەکەیدا بەربـووەوە. ئەوەنـدەش

کفتـی نووسـتن بـوو هـەر بـە گلۆڵەکـراوی بـۆرژا، بۆرژانـی چەنـد چرکەیـەک لێـی بـووە زنجیـرەی ئەلقـە ئەلقـە پچـڕی فلیمێکـی بـێ کۆتایـی. هەمـوو ئـازارو ئەشـکەنجە و دەردەسـەرییە دەروونییەکانـی درێژایـی تەمەنـی لێـی بوونـە مـارو دووپشـک و هەترەشـیان بـرد، خـۆی ڕاپسـکاند دەربـاز نەبـوو، فیزارێکـی تونـد ڕزگاری کـردو دەرپـەڕی: سـەرەڕای ئـەو تاوانـە قیزەونـەی ئەنجامیانـدا بـەدوای منیشـدا دەگەڕێـن، مـن ناوچەوانـی خـۆم بـاش خوێندۆتـەوە بـۆ هـەر کـوێ بـڕۆم نەهامەتییـەکان گڕگـڕ بـە دوامـدا دەگەڕێـن و دەمدۆزنـەوە.

ئاسـمانی شـەوە خامۆشـە بـێ مانـگ و ئەسـتێرەکان لـە مـەلای بـووە باڵـی مێشـەکەرانییەکی ڕەش: ئـای خودایـە دیسـان شـەو هـات هـەر تەنهـا یـەک کاتژمێـر خـەوم بەسە...فشـاری خوێنـی بـەرز بـووەوە خـۆی دوانـد: هـەی ترسـنۆک خـۆت لـە کونێکـی مزگـەوت شـاردۆتەوە هەسـتە بـە دوایـدا بگـەڕێ و بیـدۆزەوە، ئـای دەنـا بەدەسـتم بکەوتایـە چـۆن ئـەوی سـەربڕی، گۆشـاوگۆش سـەرم دەبـڕی.

تفـە وشـکبووەکەی قوتدایـەوەو خـۆی دایـە دەسـت ئـەو ئـازارەی هەنـاوی دەپسـاند. دەسـتی درێژکـرد بـە فرێـک ئـاو گـەرووی خـۆی تـەڕ کـردەوە، تۆزێـک هێـور بـووەوە: خودایـە تۆبـە لێـم بەعەتـەب مەگـرە، بـا ئـەو سـەربڕینە بەدەسـتی خـۆم نەبـێ بـەڵام بـە دڵـی مـن بـێ، ئـەدی بـە خـۆت نافەرمـووی ﴿وَمَـن يَقْتُـلْ مُؤْمِنًـا مُتَعَمِّـدًا فَجَـزَاؤُهُ جَهَنَّـمُ خَالِـدًا فِيهَـا وَغَضِـبَ اللهُ عَلَيْـهِ وَلَعَنَـهُ وَأَعَـدَّ لَـهُ عَذَابًـا عَظِيمًـا﴾.. نوێنەکانـی لەخـۆی پێچایـەوە، هەتـا چاوەکانیشـی شـاردنەوە، چەنـد خولەکێـک بـۆرژا و ڕاجفـری: ئـای لـەو خـەوە دەعەجانییـە پـڕ مەینەتییـەی، ئـەوە خـەو نەبـوو مـار بـوو بـە دڵییـەوە دام، پێویسـتە سـەری پـان بکەمـەوە.

## ٢

نــە شــەوێک و نــە دووان و نــە دە، بەڵکــو چەنــد جــارەی دەیــان مــەلا ئــەوە حاڵــی بــوو، بــەڵام جــار جــارەش لــە شــەوە بــێ مانــگ و ئەســتێرەکاندا کــە چــاو چــاوی نــەدە دیــت. ئــەو لــە ســەر پشــت پاڵدەکــەوت و گورزەیــەک رووناکــی دەبینــی. بــە ســواری ئەپۆللــۆی ورەیــدا بــەرە و ئــەو پارچــە رووناکییــەی ئاســمان ســەردەکەوت، چەپکێــک بیرۆکــەی ئەندێشــاوی دەچنــی و تێــر بۆ ی دەکــردو مەســت دەبــوو، رۆمانســییەت دەیگــرت و رووبــاری یادگارییەکانــی وپۆلێــک چیرۆکــی خــۆش بەســەر لێوەکانیــدا بــە خــوڕ دەهاتنــە خــوارەوە. فشــاری خوێنــی- بــە هەمــان ئــەو خێراییــەی کــە شــەوانی پێشــتر بــەرز ببــووەوە- ئــەو جــارە دەهاتــە خــوارەوە، بــەرە بــەرە خوێــن لــە دەمارەکانیــدا فیچقەیــان دەکــرد و لــە ژێــر پێســتی ڕوخســاریدا دەزان، دەم و چــاوی دەبــووە تەماتەیەکــی خــڕو پــڕی ســوور هەڵگــەڕای. شــەوێکی خۆشــی بــەم جــۆرە لــە نێــوان دەیــان شــەوانی مەرگەســاتیدا، بــۆ مــەلای هیــوا بەخــش بــوو. خەونێکــی مــوژدەدەر لــە نێــوان دەیــان خەونــی تۆقینــەر ژیانــی نــوێ دەکردەوە..شــەوێ لــە شــەوە دڵخۆشــکەرە دەگمەنەکانیــدا، خەونێکــی دەگمەنیــش بەســەر پشــتی- بــا- بــە نــاو (بــە غدا) یــدا گەڕانــدی و ســووڕاندی. ئەفەندییەکــی چاکــەت و پانتــۆڵ لــە بــەری ملپێــچ لــە مــل ســەرنجی راکێشــا، لێــی چــووە پێــش: ئــەو ئەفەندییــە زۆر خاوێــن و خــاوەن شــکۆ دیــارە پێویســتە بیدوێنــم: ئــەم کاتــەت بــاش ئەفەندی.ئــەم کاتــەت باشــتر بەڕێــز.. ئەفەنــدی وەڵامــی مــەلای دایــەوە.

بەڕێز دەکرێت یەکدی بناسین.. مەلا بە ئەفەندی گوت.

_ بەڵــێ، بەڵــێ چــۆن ناکرێــت، ئەگــەر دەتــەوێ بمناســی و بتناســم مــن هاوڕێــی ڕەش و ڕووت و پێخواســم، خاوەنــی چەکــوج و داســم.

ئەفەنــدی ناســنامەیەکی تایبەتــی لــە باخەڵــی خــۆی دەرهێنــا، ئــەم دیــوو ئەودیــوی پێکــردو نیشــانی مــەلای دا: فەرمــوو ســەیری بکــە ئــەوە چەکــوج و داس نییــە؟ بێگومــان دەزانــی چەکــوج بــۆ چییــە و داســیش هەروەهــا، ئــەم ناســنامەیە خاوەنــی هەیــە هەربانگــی بکەیــن دەمانگاتــێ، ناســنامەیەکی لــەم جــۆرەش بۆتــۆ دروســت دەکــەم وەک مــن لــە باخەڵــی خۆتــی دابنــێ.

مــەلا تیچاوێکــی دابــوێ و خوێندبوویــەوە، بــە ئەفەنــدی گــوت: مــن مــەلام مــەلا،

قورئـان خوێـن و مـەلای مزگەوتـم، ئـەوە بـۆ مـن دەسـت نـادات.
_ باشـتریش، خـۆ تـۆ تاکـە مـەلا نیـت ببیـە خاوەنـی ئـەم ناسـنامەیە، هـەزاران مەلاودەروێـش و جوتیـاری هەژارمـان هەیـە هەڵگـری ئـەم ناسـنامەیەن، بـۆ نـا؟ ئەوانیـش دەزانـن هەرچـاو قوچانێکـی مـاوە، سـوخرە و بێدادیـان لەسـەرلادەبەین و دەیانکەینـە خـاوەن زەوی و زاری خۆیـان.
هەرچەنـدە گـەردە لوولـی مشـتومڕەکانیان دڕک و داری لەگـەڵ خۆیـدا هەڵگرتبـوو، بـەڵام ئەفەنـدی کۆڵـی نـەدەداو هـەر بـەردەوام بـوو: ئـێ هـاوڕێ ئینجـا کێشـەکەی خۆتـم بـۆ بـاس بکـە.
_ ئەفەندی چیت بۆ باس بکەم !؟ هاوسەرەکەم و کۆرپەلەکەی ناو زگی...
_ بەسـە بـەس تێتگەیشـتم، هەرکەسـەیرم کـردی زانیـم کەسـێکی خۆشەویسـتت لـە دەسـتداوە، بۆیـە وەک پلینگێکی برینـدار ڕەفتـار دەکەیـت. ئـەو بەسـەرهاتەی تـۆ بـە مانشـێتێکی گـەورە لەڕۆژنامەکـەی ئێمـە نووسـراوە (بەسـەرهاتێکی دڵتەزێـن)، دواتـر وەرەلام پێـت نیشـان دەدەم.
مـەلا بـێ چەنـدو چـۆن هـەر- دە- پەنجەکانـی قیتکردنـەوە مـۆر بـکات، لـە گـەڵ جوولـە جوولکردنـی، دەسـتی بـە چـرا ڕەشـکەی تەنیشـتی کـەوت، بـووە تەقەتـەق و بەئـاگا هـات، بـە تووڕەیـی هـەردوو دەسـتی بـەرز کـردەوە: خودایـە ئەمجـارە ناهێلـم خەونەکـەم لـێ ببێتـە هەڵـم، بـا هـەر مـەلاو مـەلازادە بـم، نـان ئـەو نانەیـە بیکەیـە پـاروو بیخـۆی. بـە دوای ئـەو ئەفەندییـەدا دەگەڕێـم هەتـا دەیدۆزمـەوە.
پارچـە هەورێکـی سـپی ئـاوس بـە کـزە بایەکـی کـز، بـە نـاو جەسـتەیدا گـەڕا. نەرمـە بارانێکـی بارانـدە نـاو کەللـەی، چەنـد دڵۆپـە ئاوێکـی سـوێری گـەرم لـە کـۆدەرەی مێشـکی دەربـوون تـک تـک بەسـەر ئاگـری ناخـی دەڕژان و دەیانکوژانـدەوە، خەنیلکەیـەک ڕوخسـاری سـوور هەڵگەڕانـد: بیـرم سـواری جۆلانـەی مێشـکم بـووە و بـەرزو نزمـم دەکاتـەوە، یـان دەردەچـم یـان تێدەچـم، سـواری ئەسـپی کـە حێلـی ورەم دەبـم بـە دەشـت و کێوانـدا، بـە دۆڵ و بیابانـدا، بـە کەلێنـە شـاخاندا دەگەڕێـم، بەسـەر بـەرزە پردانـدا بـاز دەدەم، سـواری پشـتی- بـا- دەبـم و بـە نـاو هەورانـدا دەڕۆم، دەبمـە تیشـکی خـۆر سـەر بـە هەمـوو کـون و کەلەبـەری ماڵانـدا دەکـەم. ئـەوەی بینیـم خـەون و زڕەخـەون نەبـوو، زینـدە خـەون بـوو، وازناهێنـم دەیدۆزمـەوە، دەڵێـن-ئەگـەر

لـه بـاران ترسـای بـڕۆ بـەری و خۆتـی پـێ تەڕبکـە - قەلـە ڕەشـەی خەمەکانـم لـە هەنـاوم پـووش و پەڵاشـی دانـاوە و لەسـەر هێلکەکانـی کـورک بـووە، ئەگـەر لێـی تێکنـەدەم هـەر ڕۆژەی فەرخەیـەک هەڵدەهێنـێ، ئەگـەر بـەو ئەفەندییـە فریـاد ڕەسـە نەگـەم، مـن لـە بـەردەم نەهەنگـی ترسـدام ئەمـڕۆ نـا سـبەی قووتـم دەدا، کەواتـە بـۆ تۆڵەسـەندنەوە پێویسـتە هێزیـک پشـتم بگـرێ، چونکـە هەمیشـە ئـەوەی بەهێـزە سـەردەکەوێت، ئـەو تاوانبـارە ژیانـی لـە خۆشەویسـترین کەسـی مـن دزی، ئـەو ویژدانـی نییـە- خـودا گیانێـک دەبەخشـی چـۆن دەبێـت مـرۆڤ لـە نـاوی بەرێـت- هەرگیـز ناوەسـتم دەبـێ خاوەنـی ئـەو چەکـوچ و داسـە بدۆزمـەوە، بـا مـەلای مزگەوتیـش بـم، مـەلاش مرۆڤـی خوایـە، وەک هـەر مرۆڤێـک ئێسـقان و خوێـن و گۆشـتە. لـەو ژیانـەدا هـەر کەسـە و قارەمانێکـی هەیـە، قـارە مانـی منیـش ئـەو ئەفەندییەیـە، بەڵـێ ئـەو ئەفەندییەیـە - بـۆ ئـەوەی بتوانـی سـەری خـۆت بخورێنـی دەبـێ نینۆکـت هەبـێ-نینۆکـی منیـش ئـەو ئەفەندییەیـە.

کەمێـک ئـارام بـووەوە، پـەردەی پێلوەکانـی داخـران و هـەردوو چاویـان داپۆشـت، لـە پـڕو لەچەنـد چرکەیەکـی خەوەکوتکەیەکـدا دەنگێـک زۆر بـە میهرەبانییـەوە. وەک ئەکتەرێکـی شـارەزا کۆتایـی بـە فیلمەکـەی پێشـتری هێنا،دایکـی ئـەوەی لـە مێشـکیدا بـوو هەڵیرشـت:

کـوڕم.. لەوانەیـە دەرفەتێکـت بـۆ بڕەخسـێ و بەرێکـەوت لـە باوەشـی بەختـی بەختەوەرێـک بحەسـێیتەوە، بۆچـی هەمـوو ژیانـت بـە پەتێکـەوە دەکـەی. هەوڵبـدە خـۆت بـە قـەدو بـاڵای بـەرزی دار ئەسـپیندای بەختـی ئـەو بەختـەوەرە هەڵواسـی یـان دەردەچـی یانیـش تێدەچـی. مـەرج نییـە لـە دەسـتدانی هاوسـەرێک، منداڵێـک، سـامانێک هێمـای بەدبەختـی بێـت، ڕەنگـە بێوەژنێـک دەرگای خێـرو خۆشـیت بـۆ بکاتـەوە، دەکـرێ کەسـێکی نزیکـت کلیلـی کردنـەوەی ئـەو دەرگایـەی لـەلا بێـت. کـوڕم خـودا هاوسـەرەکەت بـە شـەهید دەنووسـێ و جێـی ناوەنـدی بەهەشـتە، چیـدی چاوەڕێـی مەکـە واخەریکـە تەمەنـت بەسـەر دەچێـت، چ زۆرە ژن زۆرە لێفـە دڕاوەکـەت نـوێ بکـەوە.

دوو شـەو، دووخـەون لـە هەمـوو خەونەکانـی دیکـەی زیاتـر لـە مێشـکیدا چەسـپ بـوون- خەونـی ئەفەندییـە خـاوەن چەکـوچ و داسـەکە و، ئـەو شـەوەی دایکـی لـە خـەوێ بینـی.. خـۆی بـە دوو لقۆکـەی لەرزەکـی داری ئـەو دوو خەونـەدا

هەڵتەک هەڵتەک شۆڕکردەوە.. هەستایەوە بە پەرداخێک و دووان ئاو، مێشک وجەستە و هەناوی خۆی فێنک کردەوە. بیری بە دەوری مزگەوت و دەورو بەری خەست بووەوە: ماوەیەکی زۆرە لە کونی ئەم مزگەوتە گرمخام، قرچە قرچی گە رماو بۆن قیرِی ئەم شارە تاوگازوگێژیان کردووم.ماوەیەکی دی لێرە بمێنمەوە دەبمە داری سووتاوی رەشەهەڵگەڕای. ئەگەرچی خەڵکێک لێرە دەمبینن لەوانەیە ئیرەییم پێ ببەن. بۆ نا؟ مەلای ئەم مزگەوتە گەورە وخاوێنەم، خۆشم رێک و پێک و پڕخۆرو پڕگۆشت و پۆشتەم.
پریق پریق لە پریقەی پێکەنینی دا: بە ناو شان و ملەستوور، هەر باریەندێکم گەرەکە تەنگەم پێ ببەستم، کە دەڕۆم ڕپە ڕپی پێم خەلکی هەرچوار دەورم سەرسام دەکات، تۆزێک پرچم بۆز بووە ئەوەش بەعەیب ناچێ و نیشانەی ویقارە. دەیان موسلمانی خواپەرست پێنج فەرزە لە کێبڕکێدان بۆ ئەوەی بگەنە پۆلی یەکەمی نوێژکەران و لە دواوەی من نوێژیان دابیەستن.ڕۆژانی هەینیش خەڵکەکە وەک مێرووڵە بەرە و مزگەوت رێچکە دەگرن و مزگەوت مۆنجەی دێت، بەبێ دەنگی گوێ لە وتارەکانم دەگرن.. بەڵێ بەغدا شارێکی گەورەیە حەشاماتێکی زۆری تێدایە و جمەی دێت، پیاوی خوا ناس و باشیشی زۆرە رێزم دەگرن، بەردەوام داوەتم دەکەن و ناهێلن دەست لە باخەڵم بنێم، سەردانم دەکەن و دەیانەوێ غەریبیم لە بیر ببەنەوە- حەجی عەبۆش- ی تەنیشت مزگەوت و- عەم زە ید- ی دراوسێی و هەرسێ چوار دراوسێکەی ئەولا تریان و- حەجیە فەتحیە-ی بێوەژن و ئەوانەی بەرامبەر مزگەوت و دراوسێکانی ئەملاو ئەولای و چەندی دیکەش زەکاتی ماڵی خوا دەردەکەن و منیشی لێ بێ بەش ناکەن، بەو کەواو سەلتەیە بۆ هەرکوێ دەڕۆم بە- مولـلا هات مولـلا هات-پێشوازیم لێدەکەن. بەڵام من وا هەستدەکەم ئەگەر سەد ساڵی دیش لەو شارە بم هەرغەریبم.
بیردانی خۆی کۆڵییەوە و بە تەواوی پشکنی، خەونەکەی شەوێی دایکی هاتەوە یاد. بە دەورو بەری بێوەژناندا گەڕا: (فەتحییە) ژنێکی چاوتێرو بەرچاوە، شاژنە نەک گەمە، بەکەلافەت و تێکچەقیوە، ماشەڵلای لێبێت شاقەڵێکی هەیە دەڵێی دارئەسپیندارە، ڕووی سپی بێت ئەسمەرێکی خوێن شیرینی زۆر کراوەی ڕێکە، هەرخۆشی زۆر ڕووخۆش و کراوەیە، فامیدە و

قسـه ڕەوانـە. بەسـتە زمانـەی لـە بەهـاری تەمەنیـدا ئەسـتێرەی- ئەختـەری -بەختـی کوژایـەوە و لێـی تێکچـوو، هێشـتا بەبەریـەوە مـاوە، کچێـک وکوڕێکـی ژیکەلـەی یـەک لـەدوای یەکـدی هەیـە، هەردووکیـان لـە خەمـێ دەرچوونـە، خـوا هەڵناگـرێ ڕوحـی لـە سـەر سـەریانە. ئافرەتێکـی چـاو لـە دەرو زۆر بێـژو هەڵـەوەڕو پاشـدوو نییـە، خوانـاس و بەحەیـاو حورمەتـە، لـە جـل و بەرگیـدا پۆشـتەیە و بـە دەلینـگ شـۆڕەکانی لای خۆمـان دەچێـت، مەگـەر بـۆ سـەردانی خزمـان نەبـێ ئەگەرنـا بـڕوا ناکـەم لـە ماڵـەوە دەربچـێ، قەتیـش نەمبینیـوەو نەمبیسـتوە ونەمزانیـوە زگوڕتـی و پیـاوی خـراپ و چاوحیـز سـەردانی بکـەن، یـان بـە دەورو بەریـدا بگەڕێـن و مـۆزە مـۆزی بـە دوادا بکـەن. بـۆ ڕاوێـژ پێکـردن و ئامـۆژگاری وەرگرتـن لـە مـن، جارجـارە لـە گـەڵ کـوڕە نۆبەرەکـەی سـەردانم دەکات و بـە شـەرمەوە لـە لام دادەنیشـێ. ئـەو ئێسـتا لـە سـەر دەسـت و مسـتی خۆیەتـی، پیاوەکـەی چەنـد مانگێـک لـە مەوبـەر، شـەوێکی درەنـگ دارو دە سـتەی پاشـا بـە فیتـی ڕەگەزپەرسـتان لێـی بوونـە چەتـە و ڕێگـر، دەرگای ماڵیـان لێگـرت ودایانـە بـەر قۆنداغـەی تفەنـگان و قونکـی دەمانچـان و هەناویـان پسـاند، هەرچـی پـارە و پـوول و زێـڕو زیـوی لەماڵێیانـدا هەبـوو بردییـان و بەنیوەمـری بەجێیـان هێشـت، ژان لـە هەنـاوی بـووە مـارو پێوەیدا، .پێوەدانێکـی ئەوتـۆ نەیهێشـت پـەل بکوتـی. هـە تـا (فەتحییـە) خەبـەری دامـێ و مـن گەیشـتمە سـەری، خـودا ئەمانەتـی خـۆی لێـوەر گرتبـووەوە. پیاوەکـەی سـەروەت و سـامانێکی زۆری کۆکردبـووەوە هەمـووی لـە دوای خـۆی بۆبەجێهێشـت. (حەجی کـەرەم) ی هاوسـەری (فەتحییـە) پیاوێکـی پیاوانـە و مـەرد بـوو، هەویـری هەراتەبـوو لەگـەڵ قوزەلقورتیـش دەگونجـا. لەبنەڕەتـەوە لـە کـوردە فەیلییەکانـی شـارۆچکەیەکی ڕۆژهەڵاتـی بەغدایـێ بـوو، بـاوک و باپیرانـی بـەر لـە هاتنـی ئینگلیـز، ئـەوان هاتبوونـە ئـەم شـارەو ئـەم خانـووە یـان کڕیبـوو، هەرلـە باپیرانـەوە زۆر کاسـب بوونـەو سـامانێکی زۆریـان پێکـەوە نـاوە.. حکومەتـی عیـراق لەبـەر چەنـد هۆیـەک ڕەگەزنامـەی عیراقـی پـێ نـەدەدان. (فەتحییـە) سـەرقاڵە و پێویسـتی بـە پیاوێکـی باشـە ئـاگای لـە خـۆی و سـەروەت و سـامان و منداڵەکانـی بێـت.

دوو سـێ جـار هەسـتاو لـە شـوێنی خـۆی دانیشـتەوە، دەیویسـت زەینـی لـە سـەر (فەتحییـە) لابکـەوێ لانەدەچـوو، زەینـی ببـووە قیروبنێشـت پێـوەی

نووسابوو، گرناگەی لێداگرتبوو وازی لێنەدەهێنا: گریمان ئەو بێوەژنەحەزیشی لە مێردکردنەوە بێت، بڕواناکەم ئەو جۆرە پیاوەی ئەو دەیەوێ بە ئاسانی بۆی ڕێک بکەوێ، لەوانەشە بۆی ڕێک بکەوێ و هەر خۆشی لەقەی لێبدات، دڵی بەروەست نایێ ئەو دوو منداڵە باخۆش و فەراقە بووەی خۆی بداتە بەر ڕەحمەتی هەموو زڕباوکێک، کە لەوانەیە هەر تەنها لە بەر خاتری سامانە کەی بیخوازێ، مێردەکەشی زۆر خۆشدەویست وابەئاسانی لە بیری ناکات. ئەو ژن و مێردە وەکو دوو کۆتری نێرەو مێیە، هیلانەیەکی خنجیلانەیان لەسەر لیسێکی پڕ پووش، ماوەی چەند ساڵێک گمە گم و بووغە بووغی خۆیان تێکەڵ کردبوو.

ئاخێکی زۆر گەرمی لە هەناوی خۆی کرد: چاک نییە ئەو پیاوە مەردە چەند ساڵێک بەری عیشقە پیرۆزەکەی چنی و چەند سێوێکی لاسۆری لە دوای خۆی بەجێهێشت. من نەچیم دی و نەهیچیشم بۆکەس پێکرا لەدوای خۆمدا بیگێڕنەوە، زەوییەکم بە ئارەقەی ناوچەوان دەستکەوت، کێلام و تۆم کردو ئاوم دا، بووە قەرسیل و تەبارە و هاتە بەرداس، لە پڕ تەزرەکوت و قەلداسیان کرد، دەزانم دەشمرم زلکە گیایەکی سیسی هەڵوەرییویش بۆ کەس بەجێناهێڵم، بۆ کێی بەجێبهێڵم؟ تازە ڕۆی !! دەی با ئەوەندە بیرم سەرقاڵ نەکەم، بیرم هێشتا زۆر کول نەبووە، عەقلیشم لەجێی خۆیەتی، دەمینێتەوە بەخت و ناوچەوان.

مەلا ئیرەیی بەو کوڕە برد کە لە مزگەوت حەواندبوویەوە: ئەو کوڕەی ماوەیەکی زۆرە لە لامە، لەبەر هەژاری ونەداری حەواندمەوە، ئەوەندە هەژاربوو پینەی ڕەنەگاو ڕەنگ بەرو پشتی شەرواڵەکەیان کردبووە ڕەنگاڵە. ئێوارە دادێ نانەکەی دەخواو پاڵدە کەوێ، یەکسەرخەو دەیکاتە تەرمێکی وشکبوو، تا بەیانی چرچەی ناکات، لە خەمی ئەو عەرەبانەیەی زیاتری نییە، کە ڕۆژانەچەند عانەیەکی پێ پەیدا دەکا.

# ٣

رۆژێک-یان ڕاستتر بڵێم، چێشتەنگاوێکی زوو- ژنە بەغدابیەکی تێکسمراوی سۆرمسی بەر گوزیدەی لەخۆ خەفتی،بەلەک و باهو وەک پیفۆک سپی، بالەقێنێکی لە پووش و نەرمە حەسیر چێنراوی ڕەنگاو ڕەنگی بە دەستی ڕاست و، جانتایەکی بچووکی مۆرووداری بە دەستی چەپەوە گرتبوو. پشتی خۆی لەگەڵ بالولکێکی چەقیوی ئەو ناوە کردبووە ڕکە و ببووە پاسەوانی هەندێ کەلوپەل، کەلەو بازاڕەی کڕیبوون.. ژنە چاوی بەملاو بەولادا دەگێڕا، لە پڕ دیمەنە سەرنجڕاکێش و ئاسنکێشییەکەی عەرەبانچییەکی شەرواڵ لەبەرو خورت بە هێز پەلکێشی کرد، چەند هەنگاوێک بالولکەکەی بەجێهێشت، بەبێ چەندو چۆن و مشتومڕ ڕازیکرد کەلوپەلەکانی بۆ بگەیەنێتە ماڵەوە، ژنە پێشتر ئەوەی دەزانی کە هەر میللەتەو تایبەتمەندییەتی خۆی هەیە،بۆیە هەر خۆشی بەخۆی دەگوت: گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەی لەهەر میللەتێکدا هەیە زمان و جل وبەرگە، کورد بەشەرواڵ، عەرەبیش بەعەگاڵ دەناسرێنەوە. ئەگەرچاوم درۆم لەگەڵدا نەکات و ئەم کوڕە عەرەبانچییەش بە دیمەنی خۆی بەسەهوم نەبات، بێگومان ئەم کوڕە کوردە، بە شەرواڵە دەلینگ تەسکەکەشی دەردەکەوێ سۆرانییە نەک بادینی. ڕوخسارە سپیوازییەکەی و چاوو برۆشی بە گەرمەسێرییەکان ناچێت: خودایە بەدڵی من بکەی، چۆنم مەزەندەکرد وادەربچێ، مرۆڤی ئازاو مەرد و سادەو ساکارو بە وەفان.

ئەو لەلێواری شەقامەکە و ئەویش لە پێڕێی تەنیشت شەقامەکە شان بە شانی یەکدی ڕۆیشتن. ئەو بە زمانی عەرەبی و ئەوی دیش بەو شڕە عەرەبییەی دەیزانی یەکدییان دواند. ژنە بەر لەوەی ئەو بدوێنێ نیو هە نگاو خۆی دواخست، هەرلە تەوقی سەری تا پاژنەی پێی دایە بەر نەشتەری چاوی. چاوی بە قەدو باڵا و ڕوخساریدا گێڕا:دووبرۆی چڕی لێکدی نزیک، سمێڵێکی پان و پڕی وەک کەوانە کووڕ، سەرو کەللەیەکی پتەوو بازوێکی بە هێزی هەیە، پێناچێت تەمەنێکی زۆریشی هەبێت.

چاوی لە سەری لابرد و سەیری ئەملاو ئەولای کرد: باچیتر تەماشای نەکەم هەروەک دەڵێن-ئەگەر بە تەماشاکردن بووایە ئەو پشیلانەی سەیری گۆشت دەکەن دەبوونە قەساب- تەنها بە سەیرکردنێکی سەرپێیی زۆر

زەحمەتە بتوانم تەمەنی بخوێنمەوە، وا پێدەچێت ڕوخساری چەند ساڵێکی لە تەمەنی شاردبێتەوە.
سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە: خودایە ئەرکێک مەخەرە سەرشانم نەتوانم هەڵیبگرم...
هەردوو لێوارە پەمەییە داخراوەکەی دەوری جولاند و بەو بڕە کوردییەی دەیزانی چەند دانە گەوهەرێکی لێکەوت:
_ تەمەنت چەندە؟ ژنە بە کوڕەی گوت.
کوڕە ئاوڕی لێدایەوە و دانە گەوهەرە کەوتووەکانی ژنەی هەڵگرتەوە:بە تەواوی نازانم، تەنها ئەوە دەزانم کە هاتمە ئەم شارە چوار ساڵ بوو خۆم ناسیبوو، سێ ساڵیشە لێرەم،سێ و چوار وابزانم دەکاتە حەوت، ئەو شەوەی خۆم ناسی و ئەو ڕۆژەی خۆم تێیدا بسمیل کرد، هەردووکیانم بە تەواوی لە بیرە و ڤەتیش لەبیریان ناکەم، ڕاستیت دەوێ شەوەکەیم پێ خۆش بوو، بەڵام ڕۆژەکەی نا. چلەی زستان بوو، ئەو شەوە ساماڵ بوو تفت بهاوێشتبووایە دەیبەستا، ئەو تک تکە ئاوانەی لە سواندەی خانووەکان تکابوون، بەرلەوەی بکەونە سەر زەوی هەر لە هەواوە سەرما بەستا بوونی.
زەوی و دارو دیوار تەڕبوون، لە ناو هۆڵێکی لە قوڕو خشت دروستکراوی گەورەی پڕ لە بۆنی قشپل و گنجی دەورو بەری دونگی مەڕان،بۆ پاسەوانی کردنیان خۆم لە ناو قاپوتێکی خوری لوول دابوو. مەڕەکان وا مۆل ببوون مشکێک، مێروولەیەک بە نێوانیاندا نەدەچوو. برکی مەڕان گەرمە، گەرمایەتییەکەی ئەوان کاری لە منیش کردبوو، دوای ماوەیەک ئاگام لە خۆم نەماو خەوتم.. هەندەی نەبرد ژنێکی ڕووخۆش- نازانم کچ بوو یان ژن- بە بێ لە دەرگادان لێم هاتە ژوورەوە، دەتگۆ دیبووم و نەمدیبوو، دەمناسی و نەمدەناسی، شەرمم لێدەکردو نەمدەکرد، دەترسام و نەدەترسام.
ئەو بێ شەرم و بێ ترس بوو، قدیلانەی دەکردمەوە وڕایدەپەڕاندم، کڵاو شارکێی لە گەڵدا دەکردم، چاوی پێدەچوقاندم، کڵاوی خۆی لە ناو لنگانی من دەشاردەوە، پشتەڕەقێ و لنگە قوچێمان دەکرد، ئەو شارەزابوو من یەکەم جارم بوو ئەو جۆرە یارییانە بکەم، نەمدەزانی زۆر پەلەم دەکرد، لوولەی مەسینەم دەخستە ناو لنگانی و ئاوم پێدا شۆڕدەکردەوە، کەچی کە لەخەو هەستام ئاوەکەم هەمووی بەخۆمداکردبوو، ئاو چ ئاو دەتگۆ

شـیلەی شـەکراوی پەیتـە، بەجۆریـک بەدەرپێکەمـەوە نووسـابوو بـە ئامـان و زەمـان لێـی نەدەبـووەوە، کـە بیـرم کـردەوە زانیـم چیـم بەسـەرهاتووە، ئەوانـەی لەمـن گەورەتـر پێشـتر وایـان بـە سـەرهاتبوو، بـۆم گێڕانـەوە ئەوانیـش تێیـان گەیانـدم.

بـراژن سـەرت نەیێشـێنم،زوو لـە گـەڵ گـەردی بەیانـی بـەر لـەوەی مـەلا بانـگ بـدا خـۆم ڕێکخسـتەوە. شـوانی مالێـک بـووم شـەرممکرد پێیـان بڵێـم هەنـدێ ئـاوم بـۆ گـەرم بکـەن. مەڕەکانـم ڕادان قەدبـڕ ڕێـگام گرتـە بـەرو گەیشـتمە دووڕیانێک،بـە ئانیشـکە ڕێیـەک بامدایـەوە و خـۆم گەیاندەگۆمـە ئاوێکـی دەورو بـەری گوندی،هەمـوو گـۆم و ئـاوە وەسـتاوەکان شـەختەیان بەستابوو،شـەختە چ شـەختە، ڕەق ڕەق، ئەسـتوور ئەسـتوور، بـاز بازانێـت بـە سـەریدا بکردبوایـە نەدەشـکا، ئـەو چیلکـە و چـەواڵ و قـرش و قاڵـەی بـای شـەوێ هێنابوویـە سـەر شـەختەی گۆمەئاوەکـە هەموویـم لادان و ئاشـتەبام لـە سـەری نەهێشـت،بە ئاشـتاوی ئـەو ئاوماڵـک و لیتـاوەی دەوروبەریشـیم بـەلاوە نـا، کـە پەنـگاوەی دابـووەوە. بەردێکـی دەسـکە جۆنیانیـم دەسـت دایـێ وسـەبر سـەبر شـەختەی لێـواری گۆمـە ئاوەکـەم شـکاندو بەقـەد ئەسـتوورایی خـۆم کوناوێکـی وەک کونـە ڕێویـم دروستکرد.سـەیری ئەمـلاو ئـەولای خـۆم کـرد لەمەڕەکانـم زیاتـر زیروهێـک لـەو نـاوە دیـار نەبـوو، یەکـە یەکـەی جلەکانـم داکەنـد.. ئـای چ تۆفانێـک بـوو، لەسـەرمان چەقـە چەقـی ددانەکانـم بـە قرچـە قرچـی شـکانی دارە ناوپووکـەکان دەچوو،گڤـە گڤـی بایـە سـوو سـاردەکەش سەروەشـێنی کردبووم،لـەو کاتـەدا -برایمـی مـەلا زێندیـن-م بەبیـر دەهاتـەوە کەلەڕۆژێکـی وەک ئـەو ڕۆژە سـاردەدا بەفـر بەسـتابووی و جەسـتەی کردبـووە داری وشـک، ئەگەرچـی ئـەوەی لەبـۆ ئـەو پیـاوە کرابـوو بـۆ منیـش بکرابوایـە لەدڵـەوە پێـم خـۆش بـوو هەمـان بەسـەرهاتم بەسـەر بهاتبوایە،خۆهـەر نەبوایـە دەکەوتمـە سـەر زاران و پشـتاو پشـت دەیانگێڕایـەوە. ناچاریـش بـووم دەبوایـە هـەر ئـەو ڕۆژە خـۆم بسـمیل بکـەم و لـە لـەش پیسـیەکەم ڕزگار بـم، مـەلای گونـدی بەبۆنـەو بـێ بۆنـە بـە خەلکـی دەگـوت- ئەگـەر بەلـەش پیسـی بەسـەر زەویـدا بـڕۆی، زەوی لەبـەر لـەش پیسـیەکەی تـۆ زیروهـۆڕی دەگاتـە عەرشـی عەزیـم.. سـەرت نەیێشـێنم، پێشـتر دووسـێ لەپـە ئـاوم لەگۆماوەکـە دەرهێنا،لەشـی خـۆم پێـی چـەور کـردو تەزیـم شـکاند. یاتێدەچـم یـا دەردەچـم بەختـی خـۆم هاوێشـتە باوەشـی هـات و

نەهاتی ئەو کونە شەختەیەی شکاندبووم. ئای چەند خۆش بوو!! ئەوەی من مەزەندەم دەکرد ئاوەکە وا دەرنەچوو، نەزۆر گەرم و نەزۆر تەزیش بوو،لەرزە لەرزی هەرلوولا کارپژم و قرچە قرچی ددانەکانمی گۆڕی، ئارامی سەر تاپای لەشی داگرتم و هێوربوومەوە،بەو ئاوە شلەتێنەی بن شەختەکە کونەکانی پێستم کرانەوە کە پێشتر لەجیاتی ئارەقە دۆنیان دەردەداو بنە قۆڵ و پشتە ملی کراسەکەمیان وەک چرێش بەرنەدەدا.دوو سێ جار خۆم بە تەواوی نقومکردو بەتەواویش بسمیل بووم. بە هانکە هانک هاتمە دەرێ و دڵم ئاوی خواردەوە، دەرپێیە سپیەکەی بن شەرواڵەکەشم، کە ئاوە پەیتەکەی شەوێی پێوە نووسابوو، چەند جارێک خستمە ناو ئاوی گۆمەکە،هەڵمپشافت وبەجوانی شووشتم. دوای ئەو خەونە گەشکەییەم هەستم دەکرد بەرە بەرە کچانی گوندی خۆیان لێ دەپاراستم و لێم دەرەوینەوە. پشتە ڕەقەو مێروانێ و پێنجوکانێیان لەگەڵدا نەدەکردم، خزم و برادەران بە سەیری سەیریان دەکردم و دەیانگوت زۆر گۆڕاوی، یەکێک دەستی بۆ کەپووم دەبردو بەگەورەی دەزانی، یەکێکی دیکە بە پەنجەی ئامازەی بە قوڕگم دەکردو دەیگوت ئەو گرێیە گەورەیە چییە؟هی واش هەبوون پێیان وابوو سمێلم بۆر کردییە، بابایەکیش کە قسەیان لەگەڵمدا دەکرد دەیانگوت دەنگت نێر بووە.دایکم زۆر بە سەیری سەیری دەکردم، پفێک بۆ لای ڕاست و پفێک بۆلای چەپ نزای بۆ دەکردم- خودایە کوڕەکەم زیخۆ بووە لەچاوی چاوپیسان بیپارێزە. ئەگەر لاملیەکیشم بکردبوایە باوکم پێی دەگوتم -کەلافەتی خۆت دیتییە بوویە (عووج). خۆشم هەستم دەکرد گۆڕانکارییەک بەسەر گونەوێڵەمدا هاتبوو، باتۆم پەندمابوو وامدەزانی زەردەواڵە پێوەیدایە.. دایکم منی زۆر خۆشدەویست، زۆرجار دەستی بەسەرمدادەهێناودەیفەرموو: دەچمەسەر گۆڕی خدری زندە لەبەری دەپاڕێمەوە نزام بگەیەنێتە عەرشی خودا، لەتەمەنی من وەریگری بیخاتە سەر تەمەتی تۆ، بەردە ڕەشەکەی سەر زگی ماچ دەکەم، بەدەم و چاوو دەست و پل و لەشی خۆمی دادەینم، بەڵکو خدری زندە لەلای باری تەعالا نێوانگیریم بۆ بکا، منداڵەکانم لە نەخۆشی و ناخۆشی، لە دەرد و بەڵا دوور بخاتەوە، پارچەیەک لە پەڕۆیە کەسکەکەی لێدەکەمەوە لەباسکی خۆمی دەئاڵێنم، دێمەوە لەماڵەوە پارچە پارچەی دەکەم، هەر پارچەیەکی لەباسکی منداڵێکم دەکەم، بەڵکو

منداڵەکانم لەهەموو گرفتێکی ئەم دنیایە دوور دەکەونەوە، چەنگە بەردێکی رەنگاورەنگیش فڕێ دەدەمە ناو جۆلانە بچووکە هەڵواسراوەکەی تەنیشت کێلەکەی، ئەگەر هاتو چەند جارێک بهەژێ ئەوە دڵنیا دەبم کە مرازەکانم لەلایەن خوداوە جێبەجێ بووە. براژن دایکم دڵی زۆر ساف بوو بە گوێرەی باوەڕی خۆی قسەی دەکرد، هەموو جارێ خاڵیشم پێی دەگوت- خوشکم واز لەو ناوەندگیرییە بهێنە خودا پێویستی پێی نییە، هەر خۆت لەبەری بپاڕێوە ئەو قبوولی دەکا.
ژنە، بە زمانی عەرەبی لێی پرسی: ماڵت لەو شارەیە؟
کوڕە بە ژنەی گوت: نە خۆم ماڵم لێرەیەو نە کە سێکی نزیکیشم.
ژنە وازی نەهێنا لێی پرسییەوە: ئەدی چی، لە ئوتێلان دەخەوی !؟
کوڕە وەک مۆمێکی داگیرساوی گڕگرتوو شەرم ئارەقەی پێکرد وتک تک دەتوایەوە، ویستی خۆی لەگێلی بدات و راستییەکەی لێ بشاریتەوە، کەچی ژنە وازی نەهێناو دیسان پرسییەوە: گوێت لێ نە بوو، گوتم لە ئوتێلان دەخەوی؟
کوڕە بە شەرمەوە بە ژنەی گوت:نەخێر،لە مزگەوتێک دەنووم مەلایەکەی پیاوێکی باشە.
ژنە بە تووڕەیی لێی پرسی: ئەگەر هیچ ناسیاوو جێگە پێگەو شوێنێکت لەم شارە هەزارە زیلەیەدا نییە،چی پاڵی پێوەنای و تۆی گەیاندە ئێرە؟لە شوێنەکەی خۆت نانێکت پێ پەیدا نەدەکرا بیخۆی؟
کوڕە ویستی نهێنییەک بدرکێنی دواتر زمانی خۆی گەست:براژن ئەو هەویرە ئاوێکی زۆر دەکێشی. کەئەو وای گوت، ژنە بە ئامارە کردنی بۆ باڵاخانەیەکی دوو نهۆمی ئەو ئاوەی لێبڕی کە دەیویست هەویرەکەی پێ بشێلی،ئەلقەی زنجیرەی بیرەوەرییەکانی پچڕاندو ئاراستەی رەوتەکەی بۆ بەردەمی باڵاخانە بەرزەکە گۆڕی..کوڕە سەری بۆ باڵاخانەکە بەرز کردەوە و چاوی بە تۆقەرەیدا گێڕا و چەند ورتە ورتێکی کرد: ئای خودایەبەهەندێکان دەدەی گەنج و بە هەندێکیش رەنج، باوکم هەتا مردیش نە پیتێکی خویندو نە هێشتی ئێمەش بخوێنین، نەشاری دی و نە وایکرد ئێمەش شاران ببینین، وەکو گاجووت لە بن نیری کردین هەتا هیچمان بە هیچ نەکرد، دونگی شەکە بەرانێک و گوانەکانی بزنێکی گەلێک لە منداڵەکانی لەلا باشتربوو.

ئـەو کەلـو پەلەکانـی بـۆ هێنایـە خـوارەوە، ژنـەش هەندێـک پـارەی بـە زیـادەوە دایـێ. کـوڕە پارەکـەی ژمـارد زیـاد بـوو،دوو سـێ جـاری دیکـەش ژماردیـەوە هـەر زیـاد بـوو. زیادەکـەی بـۆ گەڕانـدەوە، پێـی گـوت: لەسـەر ئـەوەی رێکەوتبوویـن ئەوەنـدەی زیـادە، فەرمـوو وەریبگـرەوە.

ژنـە پێـی سەرسـام بـوو لـە گـەڵ خـۆی دووا: هەژاریشـە پـارەی حەرامیـش ناخوا.-پێـی گـوت: بانـەوەش بـۆ خـۆت بێـت دیـارە نسـیبی تۆیـە.

سـوێندێک لـەم و دوو سـوێند لـەوی، ژنـە پارەکـەی لێوەرنەگرتـەوە. ئـەو بـڕە پارەیـەی وەریگرتبـوو لـە باخەڵـی خـۆی نـا: سـەفتە پارەیەکـی باشـە بەشـی هەفتەیەکـم دەکات، دیـارە ژنێکـی خانـەدان و دەسـتکراوەیە.. پارەکـەی دەرهێنایەوە،لێکـی کـردەوە و ژماردییـەوە، دیسـان خسـتییەوە باخەڵـی، ناولەپـی بـە باخەڵـی خۆیـدا هێنـاو بـە نەرمـی پەسـتایەوە:خۆزگە هەمـوو ڕۆژێ نێچیرێکـی ئەوهـام دەسـت بکەوتایـە.

لەگەڕانەوەیـدا بـۆ هەمـان بـازاڕ کرێیەکـی دیکەشـی دەسـتکەوت: بـەو سـەفتەیەی ئـەو ژنـە و بـەو سـووکە کرێیـەش پارەیەکـی باشـم دەسـتکەوتووە دوای نیـوەڕۆش کرێیەکـی دیکەشـم هـەر بـە نسـیب دەبێـت، خـودا بـە خێـری بگێـڕی یاخـوا. هـەر وەک خەلکـی ئێـرە دەڵێـن، منیـش هـەر وا دەڵێـم- ئەللاهوممـە زیـد وە باریـک.

پـارەی هـەردوو کرێیەکـەی دەرهێنایـەوە و تێکەڵـی یەکـدی کـردن، ژماردییـەوە: ئـای بەزیـاد بـی چ عەیبـی نییـە، دیـارە ئـەو ژنـە ناوچەوانیشـی بەخێـر بـوو... پاڵـی بـە عەرەبانەکەیـەوە نـا: بـا ئەمـڕۆ نانێکـی بـاش بخـۆم و شـەربەتێکی (زیالە)شـی لەسـەر بکـەم، بەخـوا بەتامە،هەمـوو ڕۆژێ بـە نـان و ماسـتاوەکەی (لبـەن ئەربیل)هەنـاوم پـووچ بوویتـەوە. ئـەو ماسـتاوە گزگزایـە دەڵێـی تیزابـە، نـە هـی (ئەربیـل) ە و نـە هیـچ.. دەسـتی بـە زگـی خۆیداهێنـا: هەنـاوم بـە پشتمەوە نووسایە بـا ئەمڕۆ زگـم خەنـی بکەم..هەڵوەستەیەکی کرد:ئێسـتا زگـم خەنـی دەکـەم، خەمـی بـەر زگـم دەمینـێ ئـەوی چ لێبکـەم؟.. جوولـە جوولێـک کەوتـە نـاو بیردانـی، کۆتـرە کیویلکـەی بیری،لـە نـاو لیسـی کەللەیدا، لەشـەقەی باڵـی داو لەکەنـدو لەندەکانـی دەورووبـەری گوندەکـەی خۆیـان نیشـتەوە:خۆزگەم بەوکاتـی چەنـد خـۆش بـوو.

کـوڕە عەرەبانچییەکـە ڕۆژانـە دەقـی پێـوە گرتبـوو، کاتژمێـر حـەوت و نیـو

پاڵــی بــە عەرەبانەکەیــەوە دەنــاو بــەرەو ئــەو بــازارە دەڕۆیشــت کــە ڕۆژانــە لێــی ڕادەوەســتا. چەنــد ڕۆژێــک دوای ئــەو ڕۆژە لــە هەمــان شــوێن وەســتابوو بــە مەزەنــدەی خــۆی کات زۆر خێــرا دەڕۆیشــت. لــە پێشــە خــۆی منــە منێکــی کرد:ئەمــڕۆ نەگبەتییە،بازاڕێکــی چــڕو پــڕ، خەلکێکــی زۆرو بــێ کار تێیــدا دەســووڕێنەوە، کەسێک بارێکی سووکیشــی نییــە، هــەر بــای نــان و ماســتاوەکەی نیــوەڕۆم بــکات.

ســەیری ســێبەرەکەی خــۆی کــرد: ســێبەرەکەم زۆر کــورت بووەتــەوە، بانگــدەری مزگەوتیــش خەریکــە قوڕگــی خۆشــدەکات، حــال وا بــڕوا قەللــۆش دەبــم. وەک قاناتــی بیرێکــی ڕفۆکــی وشــکبووی بەنــاو یەکــدا ڕووخاو،ناچــار ســەری بــەرەو ئاســمان بــەرز کــردەوە و نــزای کــرد: خودایــە هــەر بــای نــان و ماســتاوەکەی نیــوەڕۆم. چەنــد جارێکــی دیــش ســەری بــەرز کــردەوەو بــە نهێنــی پاڕایــەوە، بــە ئاســتی خەلکــی نــاو بازاڕەکــە ســەری نــزم دەکــردەوەو چــاوی دەگێــڕا. لــە پــڕ شاگەشــکە بوو،کــزە بــای تۆزێــک هیــوا، تۆزێکیــش خەمەکانــی دەروونــی فێنــک کــردەوە: ئــای خودایــە چ ڕێکەوتێکە،ئەســمەرە خوێنشــیرینەکەی جــاری پێشــترە، بەلــێ دەق خۆیەتــی بــەرەو ئێــرە دێ.

_ سڵاو چۆنی؟ ژنە سڵاوی لێکرد.

_ سڵاو باشم... کوڕە وەڵامی دایەوە.

_ دەستت بە تاڵە؟ لە کوڕەی پرسی.

کوڕە وەڵامی ژنەی دایەوە:بەڵێ بێکارم.

پێکــەوە بــە نــاو بازاڕەکــەدا گــەڕان، بــای چەنــد ڕۆژێــک پێداویســتی خــواردن و کەلوپەلــی پێویســتیان کــڕی و باریانکــردە ســەر عەرەبانەکــە. دیســان پــێ بــە پــێ و شــان بــە شــان و نــەرم نــەرم ڕێیــان گرتــە بــەر.

ژنــە ڕووی خــۆی بــۆلای کوڕەکەوەرســووڕاند و پێــی گــوت: دەبــا ملــی چەنــد قســەیەک بشــکێنین.

کــوڕە دەرفەتــی بــۆ ڕەخســا و بــە هەلــی زانــی لــە ژنــەی پرســی:ڕۆژانە لــەو بــازاڕەی چــاوم دەگێــڕا دیــار نەبــووی؟... تــۆ ڕۆژانــە لــەو بــازاڕەی کار دەکــەی؟ ژنــە لــە کــوڕەی پرســی.. کــوڕە وەڵامــی دایــەوە: مــن لەوەتــی هاتیمــە ئــەم شــارەی ڕۆژانــە لەبەیانییــەوە دێمــە ئــەم بــازاڕەو لــەو شــوێنەی پێشــتر منــت بینــی، لەچاوەڕێــی کرێیەکــدا تاکــو ئێــوارە ڕادەوەســتم.

هەریەکەو بەلایەکدا ڕوانی،یەکێک بەلای ڕاست و ئەوی دی بەلای چەپ، لە پڕدوو ئاوێنەی ڕوخسار لەبەرامبەر یەکدی شەوقیان دایەوە، ڕاستە لە چەپەی پرسی:جاری پێشتر کە کەلوپەلەکانت بۆ بردمەوە پرسیارێکم لێکردی وەڵامت نەدامەوە، گوتت ئەو هەویرە ئاوێکی زۆری دەوێ، نەمزانی مەبەستت چییە-ژنە مەرەقی بوو ئەو وەڵامە وەربگرێتەوە. کوڕە دیسان ویستی هۆکاری هاتنەکەی بدرکێنی، کەچی زمانی خۆی گەستەوە: ئەگەر بڵێم فیراری عەسکەریم و خۆم لەم شارە جەنجاڵەدا شاردۆتەوە خراپە، نا ئەوەی ناڵێم. بەجۆرێکی دی وەڵامی دایەوە: ڕاستیت دەوێ ئەوەی منی گەیاندە ئێرە نەهامەتییە، لەو گوندەی تێیدا نیشتەجێ بووین مەڕو ماڵاتمان نەبوو، ئەو بستە زەوییەی هەشمان بوو گەورەی گوندی زەوتی کردبوو،باوکم سەپان و دایکم تێلەکێشی تەبارەی خودا پێدراوەکان بوون. لە بەیانی تاکو ئێوارە غارەیان بوو نانی ئەو سێ چوار سەرکەو بنکە و پیرەوکە،یەک لەدوای یەکدییانەی خۆیان پەیدا بکەن پێڕانەدەگەیشتن. ساوا بووم دایکم شەوان لەناو لانکێی دەپێچامەوە و دەستزاڕەی لانکەکەی شەتەک دەدا، لە حەژمەتان دەمکردە زیرو هۆڕ، دوو سێ شەپی لەلانکەکەم دەدا و هەندێک لای لایەی بۆ دەگوتم هەرکڕ نەدەبووم و مێشکم دەبرد، ناچارخۆی کووڕ دەکردەوە و لامەمکێکی دەپەستایە دەوم، قوریەسەرەی بەڕۆژ ئەوەندە هیلاک وماندوو بوو پێش ئەوەی من بخەوم ئەو سەری دەبووە بەرد و بەردەبووەوە بن گۆمی خەوێ. پیرەوکە بووم دایکم لە قیلمقازێی دەکردم و لە گەڵ خۆیدا دەیبردمە پەرێزێ، لەوێ لە سێبەری گیشەی جۆ، یان گەلاوێژی گەنم دەیخەواندم،ئەویش خەریکی کۆکردنەوەی ئەو سوارەو مەرۆیانە بوو کە سەپانەکان وەک لێمشت لە دوای خۆیان بە جێیان دەهێشت (ئەم قسانە هەمووی هی دایکم بوون کە گەورە بووم بۆی دەگێڕامەوە). هەراش بووم باوکم کردمیە بەرخەوانی ماڵێکی خوا پێدای گوندی. هەراش تر بووم گالۆکێکیان دایە دەستم و گاگەلێکیشیان دایە پێشم. هەر بە نانانە کردمیانە گاوانی گوندی، رۆژانە زیاتر لە بیست گاو مانگای ئەو گوندەم بە پێشە خۆم دەداو دەمبردنە دەرەوەی گوندی و دەملەوەڕاندن، ئەگەر ڕۆژێکیش خاوە خاوییەک یان خۆ گنخاندنێکم بکردبوایە باوکم دەیدامە بەر پێلەقان. کە گەورەش بووم و تازە تووکە حەرامەم لە ڕدێنێ دەهات و

سمێڵم بۆر کردبوو، نه بەیانیان و نه ئێواران زەردەپەڕی خۆرم لە ماڵی خۆماندا نەدیت. شەو دەڕۆیشتم و شەویش دەهاتمەوە،مێگەلە مەڕو بزنێکم لە ئەستۆ دابوو دەبوایەشەوان شەوین و شیوە خواریان پێ بکەم و بە ڕۆژیش بیانلەوەڕێنم. بۆیە لە بەر ژیانی پڕ لە شەکەتی خۆم و ترسی ئەملاو ئەولاسەرم هەڵگرت و ڕووم لەم شارە کرد. لەوانەشە بپرسی و بڵێی- ئەوە گریمان بێزار بووی و هەر دەبوایە ئەو گوندە بەجێ بهێلی، بۆچی بۆشارێکی لای خۆتان نەچووی کە لێتان نزیکەو بە زمانی خۆتان دەدوێن و خەڵکەکەشی لەخۆتانن، بۆچی ڕووت بەرەو ئەم بەغدایە وەرگێڕا کە چەندین قۆناغ لە ئێوە دوورەو زمانی تۆ نازانن و خەڵکەکەشی نامۆن -براژن بچوومایە هەر شارێک لەو شارانەی لای خۆمان دەیاندۆزیمەوە، کەچی لەم شارەدا نامدۆزنەوە، هەر وەک گوتت شارێکی دوورەو ئەوانیش نە زمانی ئەم میللەتەی ئێرە دەزانن و نە پارەی هاتوچوونی بەغدایان هەیە،یان لەوانەیە دیسان بپرسی وبڵێی-ئەدی تۆ بەنەشارەزایی وبێ پارەیی و نەزانینی زمانی خەڵکی ئەم شارە، چۆن توانیت بگەیە ئێرە- ئەوەش بە هونەری خۆم نەبووە، بە هۆی خاڵێکمەوە بوو، ئەو شارەزای ئەم شارە بوو.

کوڕە دووکەڵی خەمە سووتاوەکانی هەناوی پەیتا پەیتا لە دەوی دەردەچوو. ژنەش جەستە پڕ گۆشتەکەی ماندووی کردبوو، ئەویش پەیتا پەیتا بەدوا دەکەوت، کوڕە هەستی پێکرد لێی پرسی: براژن ماندوێتیت پێوە دیارە فەرمووبا تۆش سواری عەرەبانەکە بکەم. ژنە حریت حریت پێکەنی گاڵتەی پێهات، بە گرژی پێی گوت: ئەی خوا ڕووت ڕەش بکا، تۆ بەڕەکەت کورتە و پێشت درێژە، ئەگەر خۆت نەیبرییەوە من دەیبڕمەوە، نە تۆبارگینی ونە عەرەبانەکەشت پەیتوونە ڕاییکێشی،لێرەبوەستە با تۆزێک بحەسێینەوە.

کوڕە کەوتە بن گۆمێکی قوولی هوڕینان، شەوین و شیوە خواری زوورگ و تەلان و ڕەقەن و کەند و جۆمەکانی هاتەوە یاد:براژن مادام هەر ڕاوەستاین با دەست بە تاڵ نەبین و دەم قوت نەوەستین، تاکو تۆ تەواو دەحەسێیتەوە هەندێکی دی باسی ژیانی خۆمت بۆ دەکەم، هەر ئەوەی گوت و بەبێ مۆڵەت وەرگرتن دەستی پێکرد:بە جوتێ کڵاشی خوری و بەلەکپێچێک و کورتەک و شەرواڵێکی عەمبارە سۆت و نیو عەلبە مزاشی

چەرخـوز، شـوانی ماڵـی (مـام خـدر)ی بـووم،ڕۆژە سـاردەکانیش کەپەنێکـی خـوری بێ وەجیـان دەدامـێ، کـە شـوانی پێشـە مـن و پێشـووتریش بەکاریـان هێنابوو،سـێ ژەم خواردنـی مەمـرەو مەژیەشـم لـە سـەریان بـوو، کـە هـەر بـە نـاو ژەمـە خـواردن بـوون. ماڵنوسـتنان (پلکـە خەجـێ) ی خێزانـی مـام (خـدر) ی بـە پەلکوتـان خـۆی دەگەیانـدە چرادانەکـە، دایدەگیرسـاند و لـە گـەڵ خـۆی دەیبـردە نـاو ناندینەکـە، لەپێـک کاوکـۆت یـان پـووش و پەلاشـی دەخسـتە نـاو ئاگردانەکـەو بـە چەنـد پفێـک ژیلەمـۆی بـن خۆڵەمێشـی ئاگردانەکـەی دەگەشـاندەوە، هەنـدێ جـار بـە سـێ چـوار پفـان دەگەشـایەوە، کەچـی جـاری وا هەبـوو هەتـا ئاگرەکـەی دادەگیرسـاند هێنکـە بـڕای دەبـوو، کـە ئاگرەکـە دادەگیرسـا ئەویـش کەلوپەلـی نانکردنەکـەی ئامـادە دەکـرد و دوو ئەسـتوورکی خاوەبـرژ دەکـرد، ئەسـتوورکی چـی؟ هـەر لـەو پەپۆکـە خـاوە برژانـە دەچـوون کەبـۆ سـەگەکان نیوەبـرژی دەکـردن، هەمـوو جارێـش کـە ئەسـتوورکە خاوەبـرژە بنملییەکانـی دەدامـێ دەیگوت:پۆیـف، ئەوەنـدە بـە تامـن پێخۆریـان نـاوێ، هەردووکـی لوولـدەداو لەگـەڵ دوو سـەلکە پیـازو گۆڵمێـک شـەکرو دوو مـلاک چـای وشـک و چادانێـک و قۆغەیەکـی فافۆن،هەمـووی دەخسـتنە نـاو توورەگەیەکـی پـەڕۆ. ئەوانـە بـۆ دوو ژەمـی چێشـت و فراوینـم بـوون، منیـش هـەردوو ژەمـم دەکردنـە یـەک. چێشـتەنگاوێکی درەنـگ سـێ چـوار بزنـی گـۆردی پـۆش و مـەڕە کەویسـارم دیـار کردبـوون، کـە لەوانـی دیکـە چچکگرتـر و پـڕ شـیرترو خۆشـدۆتر بـوون، پیسـایی و بەرمیزەکانـی پاشـەڵیانم لادەداو پـڕ بـە قۆغەکـە دەمدۆشـین و هـەردوو ئەسـتوورکم پـێ دەخـوارد. شـەوی واش هەبـوو (مـام خـدر) باتـۆی دەجـوولا وەکـو کەڵەشـێربالی هەڵدەشـەقاند و خـۆی گیـف دەکـردەوە، (پلکـە خەجێـی) دەکـردە مریشـکێکی بـاڵ شـۆڕ، کلکـی پـێ قیـت دەکـردەوە و بەسـەریدا دەفسـی. نوێژییـان (پلکـە خەجێ)لـە خـەو ڕادەپـەڕی، هەتـا دوو مەسـینە ئـاوی بـۆ خـۆی و بـۆ (مـام خـدر)ی مێـردی گـەرم دەکـرد و خۆیـان بسـمیل دەکـرد و نوێژیـان دەکـرد درەنگدادەهـات، ناچـار نانێکـی نەرمـی دەخسـتە سـەر ئاگـری قوناگردانەکـە و بـە شیشـەی ئاگرەکـە نانەکـەی دەهێنـاو دەبـرد، نانەکـە سـۆرو ڕەق دەبـووەوە. ئـەو نانـە ڕەقـەی دەخسـتە نـاو نانێکـی نـەرم و دەیکـردە بابۆڵـە. منیـش هـەر لـە بـای غـارێ دەمدایـە بـەر قەمپـاران و کـرم کـرم دەمخـوارد. ئـەوە دەربـارەی خواردنـی بەیانیـان و نیـوەرۆم بـوو.

ئێوارانیش مەگەر هەر خوا بزانی چی دەرخوارد دەدام. لەگەنە نیسکێک و نانێکی تیری. یان شلەساوارێکی بە ڕووتی، یانیش دوو ئەستوورکە تەندووری و کۆتکە دۆیەکی دەدامێ. هەندێجاریش کفتە درۆزنەی دروستدەکرد کەلە بێ چەورییان بە دیوارت دابدابوایە نەدەشکا،بۆی لەناو ئەشکەلکێک دەکردم مەگەر هەر لەبەردەمی سەگ و تاژییان دابندرابوایە، زۆر جاریش پیرخەنی بۆ دەکردم دەیگۆ- لێدە عەلۆ بیخۆ برنجە- پیاو هەقی خواش بڵێ زۆر جاریش سەلکە توورێکی بەلاسکەوەی، یان دووسێ کەڵە تەرەبیازی لەگەڵ خواردنی ئێوارە دادەنا. باسی گۆشتیش هەر مەکە، ئەگەر بەرێکەوت نەبوایە ئەگەرنا پشیلەیەکمان لەماڵ و سەر دیواری ئەو ماڵە نەدەبینی، جەژنەو جەژنەو بەرێکەوتیش کاورێک، یان گیسکێک، یان مریشکێکیان بە عاردی دادەدا، جار جارەش مەرێک یان بزنێک، چ بە پسکەی، یان بە دانکەی، یان بە هەر نەخۆشییەکی دیکە بکەوتایە حەلاوەلایێ،ئەگەر چەقۆی بگەیشتبوایە سەری،سەردەبڕاو ئەو ڕۆژەشمان دەبووە جەژن.. براژن ڕاستیت پێ بڵێم ئەوەندەی شوانی ئەو ماڵە بووم، ڕۆژێ لەڕۆژان و ژەمێک لە ژەمان، لەبەر غارە غارم لە دوای مەڕو بزنان،پڕ بەزگی خۆم و بە تێری تێرم نە خوارد.

ژنە هەستایەوەو بەڕووی کوڕە عەرەبانچییەکەدا گرژییەوە:مـن حەسامەوە با بڕۆین.

ئەویش لەگەڵیدا هەستایەوە و پاڵی بە عەرەبانەکەیەوە نا و زەردەیەکی بەسەر لێواندا هات: براژن تەنیا چەند قسەیەکم ماوە تاکو دەگەینە ماڵەوە تەواوی دەکەم، دیسان بەبێ مۆڵەت وەرگرتن دەستیپێکرد: با بێینەوە سەر ماڵنوستنان و پلکە خەجێ و خۆم.. هەتا ئەو کەلوپەل و شتەکانی ئامادە دەکرد، منیش کەرێ شینم کورتان دەکرد و جەوەندەیەکی پڕ ئاویشم بە بن زگیەوە دەکرد، کەرێ شین هاوڕێ و هاودەم و دابینکەری پێداویست و مەبەست و ئارەزووەکانم بوو،ئەوەندە متووی یەکدی بووین نە من جارێک نەقیزەیەکم تێوەژاند، نە ئەویش لووشکەیەک یان جۆتکەیەکی لێدام. ژنە چەند هەنگاوێک خۆی دواخست بۆ ئەوەی چیدی گوێی لە قسە بێ سەروبەرەکانی نەبێ. لەو خۆ بەدوور خستنەوەیە بواری بیرکردنەوەی بۆ ڕەخسا خۆی بدوێنێ: کاتێک تەم و مژێکی چڕو سەخت هەستەکانی مرۆڤ دادەپۆشن و گەردەلوولێکی تۆزاوی بەری چاوی دەگری، زۆر لەو شتانەی

سەيريان دەكات بە پێچەوانەوە دەيانبينێ، لەوانەيە ڕوخساری مەيموونێك لەبەرچاوی ببێتە دەموچاوی فريشتەيەك. هەندێ ديمەنی وا هەيە،كەتاكە ديمەنی ئەو شوێنەيە، زۆرجار لەزەينی مرۆڤدا دەچەسپێ و لێی جيانابێتەوە و خۆی بەسەر هەستەكانيدا دەسەپێنێ، ئينجا ئەو ديمەنە هەرچۆنێ بێ. مرۆڤ هەر چەندە خۆی لە تەپ و تۆزو پيسايی ئەو شوێنە داوەشێنێ شوێنەواری لەكەيەكی هەر پێوە ديار دەبێت. هەروەها لە ڕاشكاوی ئەو ساويلكەيە دڵگران نەبوو. پەندێكی كۆنی هاتەوە بير: دەڵێن ئەو كەرەی لەسەر پشتی خۆی بەباشی هەڵدەگری لە ئەسپێك باشترە كەسواری پشتی بووی لووشكان داوێ و دەتخاتە خوارەوە.. وەك خوێندەوارو عەقلمەندێك،وەك ڕابەرێكی كۆمەڵايەتی، وشە بە وشە،ڕستە بە ڕستەی قسەكانی كوڕەی لێكدايەوە: لەقوڵايی ناخی هەر كەسێكدا گردێك خەمی گەورە و شاراوە و جێلەق هەيە چاوەڕێی دەرفەتێك دەكات بۆ ئەوەی بەرەو سەرەوە هەڵكشێ و دەرپەڕێتە دەرەوە،لەوانەشە خاوەنی ئەو ناخە پڕە،ئەو گردە خەمەی ئێمەبەخەمی دەزانين،لای ئەو خۆشی بێت. ئەو كوڕە چاوەكانی لە پەنا چاويلكەيەكی ڕەش شاردۆتەوە و بەو چاويلكەيە سەيری خەڵك دەكات، سووچی ئەو نييە،ئەوە دوای ئەوە جامی ڕەشترو ئەستووتر دەخەنە سەر ئەو چاويلكەيە، بۆ ئەوەی ئەويش بە ڕەشتر خەڵك ببينێ، دەڵێن -ئەگەر كۆيلەيەكت بينی نووستووە لێی گەڕێ با بخەوی بەڵكو خەون بە ئازادييەوە دەبينێ- من دەڵێم كۆيلە خەون بە ئازادييەوە نابينێ، چونكە قەت نەيديوەو تامی نەچەشتووە.ئەو وەك مرۆڤە ئازادەكان خەون نابينێ، ئەو خەون بە ئازارو ئەشكەنجەی كۆيلايەتييەكەيەوە دەبينێ، خەون بەوە دەبينێ ئايا خاوەنەكەی لە مەيدانی كۆيلە فرۆشان بە كێی دەفرۆشێ، ئەو خەون بە ويژدانی ئەو كڕيارە نوێيەيەوە دەبينێ، ئەو خەون بە چڕنووك و قەمپاڵەكانی ئەو مرۆڤانەوە دەبينێ كە وەك با شووكە لێی گير دەكەن و وەك كوندەپەپو هەڵيدەپچڕن.

ژنە خوێندەوارو ژيرەكەكە خەريك بوو خوری كوڕە عەرەبانچييەكەی دەكردە ڕيس و ڕيسەكەشی دەكردە گوريس، كوڕە گوريسە نيوە ڕێسەكەی لێ كردەوە ڕيس و ڕيسەكەشی لێ خاو كردەوە.لە پڕ بەردێكی هاوێشتە ناو قوڵايی بيرە وێڵبووەكەی: بڕاژن گەيشتينە جێ؟. ژنە سەری بەرزكردەوە

خـۆی دوانـد: ئـای چەنـد زوو گەیشـتین!!.
کەلوپەلەکانـــی بۆهێنایـــە خوارەوە،پارەکـــەی لێوەرگـــرت و بـــەرەو بازاڕەکـــە گەڕایەوە.چەنـد هەنگاوێـک ڕۆیشـتبوو ئـاوڕی دایەوە:ئـەو ژنـە هـەروا بـە دیـار کەلوپەلەکانیـەوە وەسـتاوە.. چەنـد مەترێکـی دی لـە ڕۆیشـتن بـەردەوام بـوو ملـی بـۆ دواوە سـووڕاندەوە: دیـارە مانـدوو بـووە دەیـەوێ بحەسێتەوە،ماشـەڵڵای لێبێـت پـڕ گۆشـت و تێکچەقیـوە.. عەرەبانەکـەی ڕاکێشـاو لـە ئاوڕدانـەوە بـەردەوام بـوو: ئـای لـەو سـەیرەی هێشـتا دەڵێـی دەسـکەجۆنییە لـە نـاو جۆنـی قیـت بووەتـەوە و ناجوولـێ!!.
ڕووی عەرەبانەکـەی سـووڕاندەوە: واباشـە بـۆ دواوە بگەڕێمـەوە دیـارە کەسـیان لـە ماڵـەوە نییـە دەرگای لێبکاتـەوە. بـە پەلـە خـۆی گەیانـدێ: بـراژن ماوەیەکـە لەبـەر دەرگا وەسـتاوی ئەگـەر گرفتێکـت هەیـە بـا یارمەتیـت بـدەم؟
_ سـوپاس ئەزیەتـت خـوارد، کلیلـی دەرگای حەوشـەم لەبیـر چـووە، چاوەڕێـی مێـرد منداڵێکـم دەکـرد ئاودیـوی ئـەو دیـوی بکـەم و لـە ژوورەوەڕا دەرگاکـەم بـۆ بکاتـەوە. کـوڕە سـەرکەوت،ئاودیو بـوو کردییـەوە: فەرمـوو تـۆ بـڕۆ ژوورەوە منیـش کەلوپەلەکانـت بـە دوادا دەهێنـم.
مرپەنـدی میهرەبانـی کـوڕەی عەرەبانچـی چەقوولـەی بیری ژنـەی تیژکردەوە:**کوڕێکی** سـادەو دڵپـاک ومیهرەبانـە، لـەو دووریـەوە گەڕایـەوە یارمەتـی دام، **لـە ناویانـدا** ژیـاوم دەزانـم میللەتێکـی چەنـد دڵسـۆزو بـە وەفـان.. **ژنەخـۆی بـۆ چەمانـدەوە** و خونچـەی لێوەکانـی گەشـاندەوە:زۆر سـوپاس.
وەک مێروولەیەکـی پەشـموورەدەی سـەر کزۆڵـە بـەرەو مزگـەوت پاڵـی بـە عەرەبانەکەیـەوە نـا: ئەمـڕۆ زۆر ماندووم،هـەر لـە کلێنجەمـەوە تاکـو پاژنـەی پێـم زیـڕو هـۆڕو دادو فیغانیەتـی، بـا بگەڕێمـەوە مزگـەوت و بحەسـێمەوە.

# ٤

ئێـواره داهات بانگـی مەغریـب درا، نوێـژی بـه جەماعـەت کـرا، مـەلا کـوڕه گەنجەکـەی بانـگ کـرده حوجرەکـەی خـۆی: بـرام مـن لـه بەیانییـەوه چەنـد ڕۆژێـک ئێـره بەجێدەهێلـم، ئـەو ماوەیـه بـه دوای ئەفەندییەکـدا دەگەڕێـم، دەمـەوێ بیدۆزمـەوەو چاوپێکەوتنێکـی لەگەڵـدا بکـەم، تـۆ لـه جیاتـی مـن لێـره دەبـی و بـۆ هیـچ شـوێنێک ناجولێی،ئـاگات لـه مزگەوتەکـه دەبێـت، بـه تایبەتیـش لـه ژوورەکـەی مـن، بانگدەری مزگەوتەکـەم ئـاگادار کردۆتەوه،ئـەو ماوەیـه هـەر پێنـج فـەرزەی خـوا پێشـنوێژیتان لـه بـۆ دەکات. مـەلا دەسـتی بـۆ باخەڵـی خـۆی بـرد گۆڵمێـک خـوردەی ئاسـن و هەنـدێ پـارەی کاغـەزی دەرهێنـا: برالـه ئـەم پارەیـەم لێوەربگره،ئـەو ماوەیـه بـۆ خۆتـی خـەرج بکه،نەکـەی قجـی و فجـی بکـەی و نەوسـی خـۆت بگری،زگـت بـه مـن نەسـووتێ سـوپاس بـۆ خـوا مـن زۆرم هەیه،هـەر لـەو دوکانانـەی تەنیشـت مزگـەوت هەمـوو شـتێک هەیـه، ئەمـلاو ئـەولا مەکـەو لـەو دوکانانـه زیاتـر مـەڕۆ.

مـەلا دوو ڕۆژی تـەواو بەکـەواو سـەلته، بـه جوببـەو عەبـا بـه ژووری چایخانـه و قـاوه خانەکاندا،بـه لای بـازاڕه گـەوره و بچووکەکاندا،بەنـاو پاسـه درێـژو دوو قاتەکانـدا گـەڕا، ئەفەنـدی زۆری دیـت دەویـان دەبـرده بـن گوێـی یەکـدی و بـه فسـکه فسـک یەکدیـان دەدواند، کـه ئـەو ئـاوڕی لێدەدانـەوه، ئـەوان لێی دەسـلەمینەوەو بـه ئاشـکرا ئایـەت و حەدیسـیان دەخوێندەوه،کـه لێیـان نزیکدەبـووەوه خۆیـان لغـاو دەکرد،ئەویش وەک تەنەکەیەکـی ڕۆح تۆتیـا دەقۆپایـەوه و قەبـارەی دەگـۆڕا. تەماشـایەکی سـەرو بنـی خـۆی کرد،هـەر خۆشـی بـه خـۆی گـوت: (ئەگـەر تەشـی ڕێـس تەشـیرێس بـێ دەزانـی چـۆن دەیرێسـی) لـەو بچـم و شـەپ و شـۆڕیەی مـن دەرەونـەوه واچاکـه بیگۆڕم. بـه نـاو کـۆگاو موغـازه گەورەکانـدا گـەڕا، قاتێکـی قوماشـی فەتـاح پاشـاو کـراس و ملپێچێکـی گونجـاوو جووتـه پێڵاوێکـی کامیچـی کـڕی و هـەر لـەوێ خـۆی گـۆڕی. لەسەرتاشخانەیەکیشـدا پرچـی پوختـه ڕێکخسـت و بـه شـانه دایهێنـا، خـۆی واسـازدا بـوو شـەیتان شـەرمی لێدەکرد.هـەروەک چـۆن ئـەو خـۆی گـۆڕی هەمـوو شـتێکی دەوروبەریشـی گـۆڕا. ئـەو جـۆره ئەفەندیانـەی ئـەو بـه دوایانـدا دەگـەڕا لـه شـەقامەکاندا سـڵاویان لێدەکرد. لەبازاڕەکانـدا دەیاندواند،لـه چایخانـه و قاوەخانەکانـدا چایـەو قاوەیـان بـۆ دەکڕی،هەتـا کار گەیشـته ئـەوەی لـه دانیشـتنەکانی خۆیانـدا بەشـدارییان پێدەکـرد، بـه ئاشـکرا دەیبیسـت ئەفەندییـەک دەیگوت:چـۆن شـێرو

پلنگ و دەعبابە خواردنی کەلەش و خوێنی ئاژەڵەکان بەهێزدەبن،دەسەڵاتدارانی ئەم شارەش بە برسیکردن و چەوسانەوەی ئێمە...سمێڵ بابرێک قسەکەی لە ئەفەندییەکە وەردەگرتەوە:بەڵێ قسەکەت شەکرە، شەکرەکەشت قەندە، ئەوانە پێویستیان بە گوێ ڕاکێشانێک هەیە.
ناولەپ قەڵەش قەڵەشێک ئەو قسەیەی ڕەتدایەوە:گوێ ڕاکێشان دادمان نادا،ئەو زاڵمانەقەسابن چەقۆی سواوی تیژیان بە دەستەوەیە، هەتا ئێمە مەڕبین ئەوان سەرمان دەبڕن.پیاوێکی سمێڵ ستالینی دەستحۆشی لێکرد:ئەی ئافەریم قسەکەت دوڕو گەوهەرە، هەروەک گوتویانە -قەساب خەمی گۆشتیەتی و مەڕیش خەمی سەربڕین.هەموویان بەبێ ترس سەیری مەلا یان دەکرد و دەیان دواند:ئەوە چییە بۆ زمانت ناگەڕێ؟پشەکە خواردوویەتی؟
مەلا لێیان هەستایەوە، بەرپەرچی دانەوە:ئەو قسانەی ئێوە دەیکەن هی بێدەسەڵاتانن، ئەگەر ئەو زاڵمانە چەقۆیان بەدەستەوەیەو سەرمان دەبڕن، دەبێ ئێمەش خۆمان بە هێز بکەین، پشتی یەکدی بگرین، لە چەقۆیان گەورەتر پەیدا بکەین. ئەوەی تەنیشت مەلای هەستایەوەو بە قیتی ڕاوەستا:بەڵێ ڕاست دەکا، هەروەک دەڵێن- چاوی ڕاستت سوودی بۆ چاوی چەپت نییە- دەبێ خۆت هێز بۆ خۆت پەیدا بکەی. ئەفەندییەکی پۆشتەی تێر عەقل کە پێدەچوو ڕۆڵی لێپرسراوێتی هەبێت، ئەویش تەکانی دایە خۆی و لێیان هەستایەوە، بە تووڕەیی گوتی:نابێ تەنها لە گۆڕەپانی جەنگدا بجەنگین، دەبێ سەرەتا لە مێشکی مرۆڤەکاندا بجەنگین، ئێمە باوەڕمان بە ئاشتی هەیەوئاشتیخوازین، ئەگەر پاشای وڵاتیش دەستی ئاشتیمان بۆ درێژ بکات دەستی دەگرین، ئەگەر دەستمان گرت چەقۆکەی دەستی لێوەردەگرین و ناهێلین چی دیکە سەرمان ببڕی. ئەگەر لە گەڵماندا بسازێ دەبێتە هاوڕێمان و پشتی پێدەبەستین. هەر هەمان ئەفەندی دانەنیشتەوە بە توندی گوتی: ئەوە قسەی من نییە، هی گەورەمانە.
مەلا نەک هەر کێچ دەمی تیژی ئاخنییە پێستی یان هەر وەک دەڵێن- کێچ کەوتە کەوڵی- بەلکو خەریک بوو کێچەکەئەوەی ناو کەللەشی بخوات، ناچارخۆی دواند: ئەگەر ئەم ئەفەندییە پاڵەوانی خەونەکەم و قارەمانە ئاواتخوازەکەم بێت، مەلا ناوێ بێنەو دەستت بشۆ. ئەو لەبەرامبەر ئەفەندی ڕاوەستا و بە عەرەبییەکی فەسیح ڕەتیدایەوە: ئەفەندی قسەکەت شەکرە بەڵام، شیرین نییە،پاشات پێناکرێتەئاشتیخواز، ئەو بە سواری ئەو حوشترە هاتۆتە سەر تەختی پاشایەتی،

کە داگیرکەران کەژاوەکەیان بۆ ریکخستبوو، بە لغاویش لغاویان کرد بوو، هەتا کاویژ کردنیشیان لێ بڤە کرد بوو. بەڵێ داگیرکەران پاشایەکی تەشریفاتییان دەوێ، بێ دەسەڵات، بێ بیروڕا،بێ زمان و گوێ، هیچ بیرۆکەیەک بە کەللەیدا نێ،بۆ دامەزراندنی خزمەتگوزارێک بڵێ واستەی دەوێ، زۆرخۆری دایم خۆربێ،وەک کوندەبۆ کەس نەبینی و کەس نەیبینێ، سەردولکەی کوڕ کوژراوێک نەیگرێنێ. چواردەوری بەستەڵەک بێ کەس نەیگاتێ، کەلەشێرێکی دەنگ نوسای بێ هەرکە ویستیان قوڕگی بگرن قیرەی ببڕن، ملی پەلدەن هیچی پێنەکرێ.
ئەفەندییەکی ملپێچ سووری لە مل پێچرای،لە عەرەبییە فەسیحەکەی مەلای سەری سوڕما،چووە تەنیشتی و بە گوێیدا فسکاندی: بەرێز تۆ مامۆستای زمانی عەرەبی؟
_ بەڵێ جەناب. مەلا بە ئەفەندی گوت. ئەفەندی سەری بۆ مەلا دانەواند: ڕاپۆرتێکم هەیە دەمەوێ بەرێزت بە عەرەبییەکی فەسیح بۆم بنووسی.
مەلا سەرو ملی خۆی بۆخوارەوە شۆڕکردەوە و خۆی نواند: ئەوەی پێشتر ئەو ئەفەندییە نەبوو کە لە خەوێ بینیم، ئەوەیان خۆیەتی، سەرو ملی بەرز کردەوە و سەیری ئەفەندی کرد، هێمای ڕازی بوونی نیشان دا: فەرموو بڕۆ بیهێنە.
ئەفەندی بە مەلای گوت: لێرە نابێ، دەبێ بچینە شوێنێکی بێدەنگ.
لەشوێنێکی بێ چاوو بێ گوێ، دوور لە دووڕووان،لەپشتی پشتەوەی سیخوڕان. کاغەزێکی سپی خەتخەتی لە ئەفەندی وەرگرت،لە قولینچکی سەرەوەی لایەکی پەڕە کاغەزەکە وێنەی چەکوچ و داسێک کێشرابوو، مەلا پێی وابوو ئەوە هەمان ئەفەندی خەونەکەیەتی. ڕاپۆرتەکەی نووسی، زانیاری تەواوی لە ئەفەندی وەرگرت، خۆیان بە یەکدی ناساند، بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتەوە کەخۆی تێدا گۆڕیبوو، کەواو سەلتەو جوببە و عەباو مەندیلە سپیەکەی لە ناو کیسەکە دەرهێنا و خۆی کردەوە بە مەلایەکەی جاران، جلی ئەفەندییاتەکەشی خستە ناو هەمان کیسە و گەڕایەوە مزگەوت، کەگەڕایەوە نوێژی مەغریب کرابوو. ژوورەکەی خۆی کردەوە خاولییەکی گەورەی هەڵگرت و چووە ناو گەرماوەکە و جوان خۆی شوشت. لە هەمان کاتدا بۆ نوێژی عیشاش دەستنوێژی هەڵگرت. هەندەی نەبرد بانگدەری مزگەوت بانگی نوێژی عیشایدا، مەلا پێشنوێژیەکەی بۆ کردن،بەڵام بۆ ئەوەی لێی نەپرسن لەکوێ بووی و لە کوێوە هاتووی مەلا بە پەلە چووە ژوورەکەی خۆی و نووست.

# ٥

زیاتر لەنیوەی خەلکی بەغدا بەدوای زنجیرو بەرداندا دەگەڕان. بۆ ئەوەی بەیانی ودوو بەیانی و ڕۆژانی دواتر سینگ و پشت و گوێلاکی خۆیانی پێ بکوتن. ئەو ڕۆژە ژنە سۆرمسەکە زۆر بە پەلە، بۆکڕینی کەرەستەی هەریسە، بەناو بازاڕدا دەگەڕاو چاوی دەگێڕا: ئەوە هەمان بازاڕە، ئێرەش هەمان ئەو شوێنەیە کە کوڕە عەرەبانچیەکە ڕۆژانە لێی ڕادەوەستی. چاوی زیاتر گێڕاو سەیری هەموو لایەکی کرد: دیارە کرێیەکی دەستکەوتووە و بەلایەکیاندا بردووە، هەندێکی دیش چاوەڕێی دەکەم. گلەیی لەچلوەکانی خۆی کرد بۆ بەجوانی وێنەیان نەگرت: دەترسم نەیناسمەوە بۆنیشانەیەکم لەڕوخساری دیاری نەکرد، لەوانەیە چاوەکانم هێزی جارانیان نەمابێت. هەر خۆی خێرا پەشیمان بووەوە: چۆن نایناسمەوە تەنها ئەو تاکە عەرەبانچی بوو لەم بازاڕەیدا شەروالی لە بەردابوو. دیسان سەیری هەرچوار لای خۆی کرد: عەرەبانچی زۆرن، با بە بەردەمی هەموویاندا بڕۆم نەوەک ئەمڕۆ شوێنی خۆی گۆڕیبی، لە نزیکەوە بیبینم بە شەرواڵەکەیەوە دەیناسمەوە بە نائومیدی گەڕایەوە شوێنەکەی جارانی: کێ دەڵێ شەرواڵەکەی بە پانتۆل نەگۆڕیوە، هەموو شتێک دەبێ، ئەگەر وایکردبێ هەر نایناسمەوە سەیری کاتژمێرەکەی کرد: سعاتەکەم پێم دەڵێ درەنگە و بڕۆ لەو عەرەبانچییانە یەکێکی دیکە بەگەڵ خۆت بدە. پەشیمان بووەوە و گوتیە خۆی: نەخێر،نە پەلەی بکە و نە بەگوێی سعاتەکەت بکە، ئەو کوڕێکی باش و ساویلکە و بێ زیان بوو. سەری بەرەو ناوەندی بازاڕەکە بەرز کردەوە: پیاوێک جەنجاڵی خەڵکەکە دڕ دەدات و هەر هەنگاوێکی کردۆتە چوار. زیاتر تێی ڕاما، سەرنجی دایێ: دەق هەوە شەرواڵەکەی بەرین و فشە لەگەڵ بادا دەلەرێتەوە، ئەویش هەر وابوو. کوڕە زۆر نزیک بووەوە بە هانکەبڕایی سڵاوی لێکرد، ژنە بە گرژی وەڵامی دایەوە و بە توندی پێی گوت: کوا عەرەبانەکەت؟

کوڕە بەجۆرێک سەری بۆ نزمکردەوە هەروەختبوو قوڕگی بە سینگییەوە بنووسێ: چەند ڕۆژێک بوو لەمزگەوت دەرنەهاتبووم.مەلایەکەی سەفەری کردبوو. ئەمڕۆ ئەو هاتەوە، منیش لەو هەموو دانیشتن و کارنەکردنەم

بێـزار ببـووم و تامـەزرۆی دیتنـی ئـەم بـازارە بـووم، پێشـم عەیـب بـوو لـە یەکـەم رۆژی گەڕانـەوەی مـەلای عەرەبانەکـە دەربهێنـم و کاریکـەم.
ژنـە سـپیاتی لـە روخسـاریدا نەمـا، ئاخێکـی قوولـی لـە هەناوییـەوە هەڵکێشـاو بـە نهێنـی لـە نێـوان خـۆی و خۆیـدا کردییـە منـە مـن: ئـەم کـوڕە هـەژارەو لـەم شارەشـدا غەریبـە، دووجـار منـی بردۆتـەوە شـارەزای بوویمـە. لەبـەر هیچـم نییـە تەنهـا ئـەوە نەبێـت نامـەویَ کەسـێکی ناکـەس بەچـە شـارەزای ماڵەکـەم بێـت.. دۆش داماوییەکـەی ژنـەی سـەرنجی کـوڕەی راکێشـا: بـراژن خەمـی مەخۆمزگـەوت دوور نییـە. هـەر ئێسـتا بـە غارەکـی دەچـم عەرەبانەکـەم دێنـم و دەگەڕێمەوە..کەمتـر لـە نیـو کاتژمێـر بـازاڕی خۆیـان کـردو بـە هەمـان ڕێگـەو بـۆ هەمـان مـاڵ دیسـان پـێ بـە پـێ و قسـە بـە قسـە رۆیشـتن. ماوەیـەک بـوو یەکدییـان نەبینیبـوو، بـەڵام گفتوگۆیەکانـی پێشـتریان لـە یـاد مابـوو، هـەر یەکەیـان، بـۆ ئـەوەی دووری ریگاکـە کـورت بکاتـەوە، خـۆی بەدەسـت هوڕێنەکانیـەوە دابـوو، دەیویسـت شـتێک لـە یادگارییەکانـی بـۆ ئـەوی دیکـە بگێڕێتـەوە، بەتایبەتـی کـوڕە بابەتێکـی لـەو جـۆرەی لەمێشـکیدا هەبـوو بەقـەد مـاوەی رێگاکـە درێژبـوو، بابەتێـک کـە پێشـتر و لـە هەمـان ئـەو رێگایـەدا بـە نیوەچڵـی وازی لێهێنابـوو. ژنـە وەک مـەڕە دونـگ شـۆڕو پـڕ گۆشـتەکان نـاوە نـاوە دوادەکەوت.کـوڕەش وەک ئـەو تەگـە بەهێـزەی لەبەرایـی مێگەلـی بزنـان بەفیـزەوە دەڕوات، ئـەو پێشـدەکەوت و ژنـەش دوا دەکـەوت، هەرجـارەش کوڕەکـە یـەک دوو هەنـگاو پێشـدەکەوت، یـەک دوو ئـاوڕی دەدایـەوە و یـەک دوو قسـەی بۆدەکـرد، دوا جـار پێـی گـوت: رێگاکـە کەمێـک بـۆ تـۆ دوورە بـە قسـان نەبـێ نابڕێتـەوە.
_ بەڵێ ڕاستە چیت ماوە بیڵێی؟ ژنە لێی پرسی.
ماوەیـەک لەمەوبـەر وەکـو ئێسـتا بـەو رێگایـەدا دەمبردییـەوە، پرسـیارت لێکـردم چۆن گەیشتییەئەم شـارە، گوتـم بەهـۆی خاڵێکمـەوە بـوو، زوو گەیشـتینە ماڵـەوەو پێـم تـەواو نەکـرا، ئێسـتا بـۆت تـەواو دەکـەم.. بـراژن، خاڵـم لەبلەبانـە، هەرچـی تـۆ بیـری لێدەکەیـەوە ئـەو لێـی مەعلانـە، باسـی عـەرش و قورشـت لەبـۆ دەکا زۆر لێزانـە، پیـاوی شـەوان و سـواری نـاو سـوارانە، جەندرمـە و زەفتییـە و هەیتـەکان بـەو هەمـوو هێزانـەی هەیتیـان دەرهەقـی نایـەن، گـۆردەو چەلاوخـۆرو کلکـی کلکان بەدوایدا دەگەڕێـن زەفـەری پێنابـەن، زۆر بـە هەسـتە چرپـەی پێـت

بێ دەزانی کێی، لە دوورەوە بۆنت دەکا دەزانی دۆستی یان دوژمن. خالّم زۆر شتی بۆ دەگێڕامەوە، ئەو دەیگوت: زۆربەی خەڵک بە سادە و ساکاری دەژیان، لەدەنگوباسی گوندەکەی خۆیان و چەند گوندێکی نزیکی خۆیان زیاتریان نەدەبیست، ئەو قسەیەم بۆ پێشترو بۆ ئیستاش هەر ڕاستە. خەڵک بارە گەنم و جۆیان لە ئێستران باردەکردو لە گوندەکانی خۆیانەوە بەرەو شاری خالس و دەوروبەری و تاکو نزیک شاری بەغدا بەڕێدەکەوتن و لەوێ گەنم وجۆیان بە قەسپ و خورمادەگۆڕییەوە و بە بارەوە دەگەڕانەوە، لەو هاتوچوونەیاندا چەندین شەوو ڕۆژ بە ڕێگاوە دەبوون، چەندین جاریش لەودیوی تخوویی جەبەل حەمرین بەلای بەغداوە، بەرەنگاری چەتەو ڕێگران دەبوونەوەو دەبووە شەڕی دەستەو یەخەی نێوانیان و بریندارو کوشتاریشیان دەبوو. خەڵکی ئەو گوندانە بۆیە ئەو کارانەیان دەکرد چونکە پارەی هیشکەیان نەبوو پێویستییەکانی خۆیانی پێ بکڕن، ئەگەر خەڵکی هەموو گوندەکانی لای خۆمانت کۆبکردبوایەوەو هەموو کون و کەلەبەری ماڵ و باخەڵیانت بپشکنیبوایە و ئەوەی تێیاندابوایە کۆتبکردبوایەوە و بتژماردبوایە لە-دە، پازدە- دینار زیاترت دەست نەدەکەوت.
هەڵوەستەیەکی کردو بۆدواوە ئاوڕی دایەوە، ژنە بە چەند هەنگاوێک بە دواکەوتبوو،عەرەبانەکەی ڕاوەستاندو ژنەش گەیشت. چەندخولەکێک هەر بە وەستانەوە بای پێی خۆیاندا و تۆزێک حەسانەوە، کوڕە گێڕی ڕۆیشتنەکەی گۆڕی لە دوو کردییە یەک و بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتن، دیسان بەردەوام بوو: خانم، خالّم زۆرجار باسیدەکرد چۆن شارەزای بەغدا بووە، ئەو دەیگوت: پێش ئەوەی ئینگلیزەکان بێنە ئەم وڵاتە و داگیری بکەن، عوسمانییە تورکەکان بە ناوی ئیسلام داگیریان کردبوو، باپیرم لەسەردەمی ئەو عوسمانیانە، لەبەر مەمرەو مەژیەی باری کوزەرانی و بۆ ئەوەی خۆی لەمەترسی ئەو ڕێگا دوورو درێژ و ناهەموارەی نێوان گوندەکەی خۆیان و ئەو شارو شارۆچکە دوورانە ڕزگار بکات، بە خۆی و ماڵ و منداڵی بارو بارگەیان تێکدەنێن و لەگوندێکی دەوروبەری شاری بەغدا ئاگردانی گەرمدەکاتەوە و لەوێ بەکاری کاروانچیەتی خەریک دەبێت، دوای ماوەیەک بە تۆمەتی قاچاخچیەتی لە یەکێک لەکۆرە ڕێگەکانی نێوان شارەبان و باقوبەو بەغدا دەیگرن و بە کەلەپچەکراوی دەیبەنە بەغداو لەوێ ماوەی ساڵێک لە

بەندیخانەی (ئوچ قەلا) ی دەپەستن، کە ئەو کاتی ئەو بەندیخانەیە لێرەلەم شارەدا بووە. خاڵم ئەگەرچی ئەو کاتی منداڵ بووە. بەڵام بۆ سەردانی باوکی، لەگەڵ دایکی و داپیری وخەڵکی شارەزای هەرێمەکە دەچووە شاری بەغدا، بەمجۆرە شارەزای ئەم شارە بوو. دەم و لووتی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە، پشیەکی قوولی بە قورقوراگەو سورینچکیدا بردە خوارەوە. هەردوو سییەکانی گەشاندەوەو سینگی دەرپەڕاند: من پیاوێکی ئەوەندە بەسەروبەرنیم. گوێش بە ژیان و گوزەرانم نادەم،ئەو دنیایە هی ئەوەی نییە بیکەمە بارو بەسەر شانی خۆمیدا شۆڕ بکەمەوە،لە کوێش بپسێ - ئەگەر بگونجێ- لەوێ گرێی دەدەمەوە، ئەگەرنا وازی لێدەهێنم با هەر پسپس بێ، سیاسەت و میاسەتیش هەر هیچ، ئەبەد تخوونی نەکەوتیمەو لێشی نزیک نابمەوە، ئاگرە پەڕو باڵم دەسووتێنی. خاڵم چەندین جار خەوی خۆشیان لێ تار کردییە، بەکەلەپچەیی ڕەوانەی بەندیخانەی شارانیان کردییە، نینۆکەکانیان دەرکێشایەو لەشیان شوو شوو کردییە، بە کەلاکی و لاکەلاکی گەڕایتەوە هەر وازیشی نەهێنایە. ئەو مەکتەبلی بووە و خوێندەواری هەیە، کتێبان دەخوێنێتەوەو مێشکی پڕە. براژن خۆزگە خاڵمت بدیتبوایە دەتزانی چ جۆرە پیاوێکە، ئەوەندە پیاوانەو چاو نەترس و بە غیرەتە لەبەرامبەر فیلیش چاوی خۆی بەرناداتەوە.

ـ پێویست بە دیتنی ناکات واتۆم نەدیت،هەروەک دەڵێن: خاڵان ببینەو خوارزایان بناسە،دیارەتۆش بە خاڵت دەچیت.....ژنە وای پێگوت.

کوڕە تەماشای سەرو بنی خۆی کرد، منگە منگێکی کرد: چ حەدم هەیە بە خاڵم بچم.

گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی ژنەکە، ژنە جانتاکەی دەستی کۆڵییەوە، ویستی کلیلی دەرگای دەرەوە بدۆزیتەوە، لە پڕ هەرزەیەک پەیدا بوو پڕی دایە جانتاکەی و فڕاندی. دزە وەک کەروێشک و کوڕەش بووە تاژی،تاوی دایێ و کردییە گرمۆڵە. ژنە بیری پەرتەوازە بووی گەڕایەوە ناو تخووبی کەللە سەری، مێشکی جماو گەرماییەک بە ناویدا گەڕا، حەپەساوییەکەی داسەکنا. بەرلە هەموو کەسێک لە گەڵ خۆی دوا: ئەو قۆڵبڕەتەلەکەبازە چ فاق و تەپکەیەکی بۆم دانابووەوە، چۆنی زانی جانتاکەم پارەو زێڕی تێدایە، ئای بەقوربانی سمێڵ و دەست و پێیەکانت بم پیاو، پیاوی چی

فریشتەیە خوا بۆمنی نارد، بەڕاستی کوڕێکی مەردو تەروەندە و ناوازەیە، هەرچی بۆی بکەم لە ژێر ئەو قەرزەی دەرنایەم،ئەگەر خۆم و سەرو ماڵی خۆم لەبەر دەستی پیاوی ئەوها ئازا دابنێم شایستەیەتی.. سەیریکرد یاری پشیلەو مشکانێی بیرکەوتەوە، کوڕە سەرو ملی نێچیرەکەی دەخستە نێوان هەردوو لاقی و دەیکوشی، نێچیر هاواری لێهەڵدەستا و دەیبۆڕاند، بەرەللایدەکرد واگۆد ببوو نەیدەتوانی غاربدا و لەبەر دەستی ڕزگار بێت، بە گاگۆڵە لەسەر چۆکان دەڕۆیشت، بەدوو لەپان پاشەو پاش دەیگێڕایەوە. بەدیتنی ئەونمایشە گەپاوییە ژنە بستێکی دی هەڵکشا، خەندەو گریان ئاوێزانی یەکدی بوون، فرمێسکەشادی بەخشەکانی خۆیان بۆ نەگیرا. دەستی یەکدییان دەگرت بە نەزم و ئاوازی- شمشاڵ و ڕەبابە- دەمێک چۆپی و دەمێکیش سێپێییان دادەبەستا.. ژنە ڕۆمانی- کوڕە هەژارو کچە پاشای- چەندین جار بیستبوو، زۆر پێی سەرسام بوو: کوڕە هەژارەکە دەست و بازوێکی بە هێزی هەبوو، لەزۆرانبازیدا دەگمەن و کەم وێنە بوو، هەر هەمان پاڵەوان خودا لەجەستەی ئەم کوڕە بەرجەستەی کردووە و بۆ منی ناردووە. ئەگەرچی باوکم پاشا نەبووە، بەڵام خۆمنیش هیچم لە کچە پاشایان کەمتر نییە.

ژنە لەناو شەپۆلەکانی ئەو ڕووبارە بە خوڕەدا، باسکە مەلەیەکی لێدلو لە کەناری دڵنیایی زیاتر کەوتە ناو خەیاڵ و بۆ خۆ بێژی:کەس نییە بڵێ وەک ئەم کوڕەم، دەتۆش ژن بەو مەیدۆڕێنە..

کوڕە نێچیری هێنایە بەردەمی ژنەو خۆی بۆ نوشتاندەوە:تۆ میرو من گزیر، فەرمان بکە بیکوژم. ژنە هەردوو چۆکی لەسەر زەوی نوشتاندەوە، کرنۆشێکی تەواوی برد: تۆ پاشاو من گەدا، کرنۆشم بردووە بۆ خودا، نەکەی تۆوخودا،با ون بێ و بڕوا.. بەرەڵلای کردو هەستایەوە، شەپ شەپ خۆی داوەشاند، بەدەنگە نێرەکەی باسکە مەلەیەکی بە بیرە وێلبووەکەی ژنەی لێداو لە گێژەنی دەریای بیرکردنەوەو چرپە چرپ و سرتە سرت ڕزگاری کرد، پێی گوت: بە یارمەتیت من دەڕۆم. ژنە بە نەرم و نیانی و بە تیچاوی ئەفسوناوی پێی گوت: نەخێر ناڕۆی، کەلوپەلەکان بە عەرەبانەوە ببە ناو حەوشەی.

بە پەلە پاڵی بە عەرەبانەکەیەوە نا و گەیاندییە بەر دەرگای داڵانی

ژوورەوەی خانووەکـــە، هەتـــا ئـــەو کەلوپەلەکانـــی هێنایـــە خـــوارەوە، ژنـــەش دەرگای داڵانەکـەی کـردەوە و خـۆی بـە پێشـی کـەوت و کـوڕەش کەلوپەلەکانـی بەدوایـدا بـردە ناندینەکـە، کەداینـان چاوەڕوانـی کرێیەکـەی کـرد بیداتـێ و بڕوا. کەچـی ئـاش لـە خەیاڵێـک و ئاشـەوانیش لـە خەیاڵێکی دی. ژنـە پێـی وابـوو خـودا نێرییـە مامزێکـی بـێ لانـەی لـە شـوێنێکی دوور دوور بـۆ ڕاو کـردووە و بـە تایبەتیـش بـۆ ئـەوی نـاردووە، لـە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: ئـەو کـوڕە هیچـی لـەو نێرییـە مامزانـە کەمتـر نییـە کـە سـەردانی پێدەشـت و چیاکانـی کوردسـتانم دەکـرد، دەمدیتـن بـەدوای مێگەلێـک مامـزەوە هەمیشـە دەیانبێلانـدو مرقـە مرقیـان بـوو. ئـەو دەیویسـت بـەدوو چـاوە خومارییەکانـی سێرەی لێبگری و تیرێکـی لـە زەرگ تیژتـر لـە ناوەنـدی دڵیـدا بچەقێنـی و هـەر خۆشـی ببێتـە بەیتـارو لـە نـاو بەیتارخانـەی دڵـی گەرمـی خۆیـدا بـە بەنجـی ئەبـەدی بیخەوێنـی، بەڵـێ ژنـە وایدەویسـت، هـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتەو بـۆ دانەخۆرەکردنیشـی، دەرگای ئاوتەزۆکەکـەی کـردەوە، دۆلکەیەکـی پـڕ شـەربەتی مـۆزی لـێ دەرهێنـاو پەرداخێکـی بـۆ پڕکـرد. پەرداخەکـەی بـە تـەواوی لەنـاو لەپیـدا گرتبـوو، بـۆی ڕاگـرت. تـرس و شـەرم ئاوێزانـی یەکـدی بـوون، تـرس و شـەرم لـە یەکـەم شـەوی ڕەسـیوبوونی و یەکـەم خەونـی بـە زاوابوونـی لـە پەرییەکـی نەناسـراوو یەکـەم بەیانـی خۆبسـمیلکردنی لـە گۆمـە ئاوێکـی سـەهۆڵبەندی شـەختە بەسـتوودا، تـرس لـەوەی نـەوەک پیاوەکەی (ئـەو دڵنیـا نەبـوو مێـردی هەیـە یـان نـا) لـە پڕیکـدا بـە سـەریاندا بێتـەوە و بـەم شـێوەیە بیانبینـی، شـەرم لـەوەی نـەوەک ئـەو ژنـە هەمـان خەسـلەت و ڕەفتـاری ئـەو پەرییـەی نەبـێ، شـەرم لـەوەی نـەوەک دەسـتی بەدەسـتی بکەوێـت و ئـەو پێـی سـەخلەت بـێ. دەسـتی بـۆ پەرداخـە پـڕ شـەربەتەکە بـردو نەبـرد، بەهـۆی بـە یەکدیگەیشـتنی دووجەمسـەری سـاردو گەرمـی هـەردوو دەسـتەکان،تەزوێکی کارەبایـی زۆربـە هێـز سـەرتاپای جەسـتەی هەژانـد، پێـی وا بـوو بوومەلەرزەیـەک بـە پلـەی سـەرووی شەشـی پێـوەری ڕیختـەر هەلیکسـێی پێـدەکات، لەنێـوان لەپێکـی گۆشـتنی خڕپـن و دەسـتێکی قەڵـەش قەڵەشـی لەرزۆکـدا، پەرداخـە شووشـە پـڕ شـەربەتەکە هەڵخلیسـکاو پارچەشووشـەو پشـکە پشـکی شـەربەتە تیرەکـە، هـەر یەکـەو بـە لایەکـدا پـژان. ژنـە وەک ئاوێکـی تیـژڕۆ شـێلووش نەبـوو، دۆلکـە شـەربەتەکەی لەبەردەمـی کـوڕەی دانا،پەرداخێکـی ئاوتێنەکـرا

ی خسته پاڵ دۆلکەکە، چوار بەندێکیشی بۆ راکێشا و فەرمووی لێکرد: فەرموو دانیشە، نەتبیستووە دەڵێن- ژنی شەرمن بە شارەکی، پیاوی شەرمن بە شانەکی یان بە عانەکی- تۆ شێری شێر، شەریەتەکەت بخۆرەوەو هەناوی خۆت فێنک بکەوە.
کورە بە جۆرێک دەوی بزمووک کرابوو، لێوەکانی ببوونە دوو لنگە کراش و بە لا لغاوەیدا شۆڕ ببوونەوە، هەرچەندە تانی لە خۆی دەداو هێزی دەهێنایەوە بەرە خۆی نەیدەتوانی بیانجولێنی، هەتا بیردانیشی کورت بین و کورت بڕ بوو. ژنە پێشتر هەوڵیدەدا و پلانی دادڕشت و فاقی بۆ ئەو جۆخۆرکە بێ ئاگایە دادەنایەوە بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە بیکاتە دەستکەلای خۆی و هەموو کارەکانی پێ رایی بکات، بەڵام ئازایەتی و چاونەترسییەکەی بەردەرگای ماڵ وایلێکرد گازمالوکەی فاقەکە زۆر لە ترازتر دابنێتەوە ودەنکە جۆیەکی قەڵەویشی پێوە بکات. ئەو پێی وا بوو، هەروەها بە خۆی دەگوت: چ زوو یان درەنگ دەیخەمە ناو باگەڕێکی عیشقی سەوزی ئەو تۆ لە ناویدا ببێتە کووچ کووچە و بە دوامدا بگەڕێ و بسووڕێ، من ئەم جۆرە پیاوەم گەرەکە، شەرمن و نەشارەزاو نەدیتکە. بەڵام خورت و بەوەج و ئازا. هەستایەوەو ڕۆیشت، دوای چەند خولەکێک گەڕایەوە، کراسێکی گوڵ گوڵی ناو دامانی تەنکی پڕ بە جەستەی بەسەرخۆیدا هێنابوو، بۆن و بەرامی تیرۆزێک لە ناو مووە چڕەکانی کونە لووتی کوڕەیدا هەوراز دەبووەوەو کەللەی دەتەزاند، گەزگەز بە ڕاست و چەپی دەفەی سینگیدا بەرەو خوارەوە شۆڕ دەبووەوە. کوڕە خۆی پێ نەگیرا بە تیچاوێکی تامەزرۆیی و نەدیتکەیی سێرەی لە بەلەکی سپی و نەرمی گرت، هەتا لەگەڵ خۆشیدا بە شەرمەوە و زۆر بە نهێنی و بەبێ لێو جولاندن دوا: ئەگەر خوا بیدا چەوراتی ئەم دونگە تەڕە و بەلەکە سپیەم هەتا مردنێ بەسە.
ژنە خۆی لێ نزیک کردەوە:بە قوربان هەتا ئێستا خۆت پێ نەناساندووم، ئەگەرچی دواکەوتین بەڵام ئیستاش هەرباشە. ناوت چییە؟
_ناوم (نانە خۆرەی پێنج ئەنگوستە).. کوڕە بە فشە وای گوت.
_ ئەوە چییە، حەنەکە یان گاڵتەم پێدەکەی، دیسان لێت تووڕە بم؟
کوڕە ترسا: ناچاوەکەم نەکەی هێوربەوە،تەنیا بۆ پێکەنینە، چ حەدم هەیە

گاڵتـەت پـێ بکـەم، کاتـی منداڵـی ئـەو جـۆرە سـوحبەتانەمان دەکـرد. ژنـەش هـەر بـە فشـە پێـی گـوت: کەواتـە هـەر بـۆ پێکەنیـن، منیـش (دانەخـۆرەی نانەخـۆرەی پێنـج ئەنگوسـتم).

_ واتە چی؟.. کورە پرسی.

_ بۆ خۆت تێبگە.. ژنە بە پێکەنین بەوی گوت.

بەچاوەخورماییەکانـی تیرێکـی گرتـە چـاوە ڕەشـەکانی کـوڕەو نـازی بارانـدە سـەری: کەواتـە بەڕاسـتی نـاوت چییـە؟ ژنەکـە، کـە لێـی پرسـی، ئەویـش کردییـە حیکایـەت، دوورو درێـژی کـردەوە: ئـەوەی ڕاسـتی بـێ خاڵـم نـاوی لێنابـووم (کاردۆ) ئـەو دەیگـۆ کاردۆ باپیـرە هـەرە گەورەمانـە، بـەڵام لـەلای حکومـەت و بەڕەسـمی و لـە تەسـکەرەی نفووسـمدا نـاوم بـە (کارۆ) نووسـراوە، ئـەوەش یـان هەڵـەی بەئەنقەسـتی پیاوانـی حکومەتـە لـە کاتـی ناونووسـیدا شـتێکیان لـێ قوتدایـە، یانیـش سـادەیی دایـک و باوکـی خۆمـە هـەر وایـان بانـگ دەکـردم. ژنەکـە بـە گرژینـەوە پێـی گـوت: (کاردۆ) بـی یـان (کارۆ) هیـچ لای مـن گرنـگ نییـە، تـۆ هـەر ئـەوەی کـە هـەی، مـرۆڤ بـە نـاوو ڕەنـگ و بـۆی ناپێـورێ، بەسـەنگ و هەڵـس و کـەوت و ڕەفتـاری دەکێشـرێ.من وەکـو تـۆ حەنـەکان ناکـەم. بەڕاسـتی و ڕاسـتەوخۆ خۆمـت پـێ دەناسـێنم، نـاوم (ئیبتیسـام) ە. واتـە (خەنـدە). دڵنیـام سەرسامیشـی بـەوەی چـۆن دەزانـم (ئیبتیسـام) واتـە (خەندە)یـە. پەلـەی مەکـە بـا یەکـەو پەرداخێـک شـەربەت بخۆینـەوە ئەوەشـت بـۆ دەگێڕمـەوە. تـۆ حـەزت لـە کامیانـە شـەربەتی پرتەقـاڵ، مـۆز، مێوژ،یـان کۆکتێلێکـت بـۆ بکـەم.. (کارۆ) لـە مـەی دوایـی نەگەیشـت، بەشـەرمەوە پێـی گـوت: شـەربەتی مێـوژ ڕۆژانـە لـەلای (زبالـە) دەخۆمـەوە، لێـی بێـزار بوویمـە، ئەوانـی دیـش هـەر کامیـان بـی کەیفـی خۆتـە. ژنـە تێگەیشـت لـە کۆکتیلەکـە نەگەیشـت، بـە پێکەنینـەوە پێـی گـوت: شـەربەتی مـن و هـی (زبالـە)ی وەکـو یـەک نیـن، هـی مـن تایبەتـە بـە هەمـوو کەسـێکی نـادەم، لێـرە بـە دواوە چیـدی شـەربەتی (زبالـە)ی مەخـۆوە، خـۆم ڕۆژانـە — یـان هـەر کاتـەی ئـارەزووت کـرد — بـە خۆڕایـی دەتدەمـێ بـۆ پـارەی پێدەدەی؟دڵنیـام ئەگـەر شـەربەتی مـن تـام بکـەی — نـەک هـەر هـی زبالـەی — هیـچ شـەربەتێکی دی ناخۆیەوە.بـا شـەربەتی مێوژەکـە بـۆ کاتێکـی دیکـە دوا بخەیـن، ئیسـتا مـن و تـۆ هـەر یەکـەو پەرداخێـک لـە کۆکتێلەکـە دەخۆینـەوە.

دوای نۆشکردنی شەربەتەکە: بە قوربان بە تام بوو؟.. کورە وەڵامی دایەوە: هەر باسی ناکرێ کەللەی تەزاندم.
_ ئەوە شەربەتی بە قەستی بوو، شەربەتە ڕاستییەکەت بدەمێ هەر لێی تێر نابی...
ئیبتیسام سەرکۆنەی خۆی کرد: ئەو تیرەی هاوێشتم بە خۆم کەوتەوە، ئەو ڕاستۆکی تێناگا خوارۆکی هەر هیچ، وایزانی گوێزم بۆ ژمارد. لە ناچاری خەندەیەکی بۆ کرد: گیانە با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.
هەر چوار پێنج ساڵان دەبووم دایکم بۆی گێڕامەوە و گوتی: ساڵانێک لەمەوبەر، ماڵە کوردێکی نەفیکراوی دەربەدەر، لەبەر ئەوەی بەدڵی دارو دەستەی پاشا نەبوون، لە وڵاتی خۆیان دوورخرابوونەوەو لە گوندەکەی ئێمە دەستبەسەر بوون، ئەو گوندە بۆ ئەوان زۆر ناخۆش بوو، هاوینان دۆزەخ و زستانان زەمهەریر بوو، دەوروبەری هەمووی زەلکاوو زونگاو بوو، گوندێکی دوورەدەست و لاپەڕگەی شاران بوو، غەریبگەو هەوارگەی زۆرە ملێی ئاواران بوو.. ئەوان شارستان و ڕۆشنبیر بوون، لەگوندێکی وەک ئەوەی ئێمە نامۆ بوون، پیاوی ماڵە کوردە نەفیکراوەکە مامۆستای قوتابخانە بوو، بەفەرمانی پاشا دوورخرابووەوە، ناوی مامۆستا (عەلی) بوو، خەڵکی گوندی زۆر خۆشیان دەویست، بەناوی خاوەنی دولدل و باوکی دووشەهید ناوزەدکرابوو، وەکو ئەویش ستەملێکراو بوو. بەڵام سەرەڕای ئەو زوڵمەش کەلێیکرابوو ئەو بێ باک بوو. باوەڕێکی بەهێزی هەبوو، خۆڕاگربوو. کچ و کوڕانی گوندی لەماڵی خۆی کۆی دەکردنەوە، بەیانیان و ئێواران خۆبەخشانە فێرە خوێندەواری دەکردن. بە تایبەتی لەگەڵ ئێمە یەکماڵ بووین، ماڵمان بە ماڵی یەکدییەوە بوو.
ئیبتیسام سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و پاڕایەوە: خودایە دایکم زۆر سادەو بێ گوناە بوو، بەشێک لەبەهەشتی بەرینی خۆتی پێ ببەخشە...
دوای چەند هەنسکێک و چاو سڕینەوە، ڕووی بۆ کارۆ وەرگەڕاندەوە: دایکم ڕەحمەتی خوای لێبێت دەیگوت- ئەو مامۆستایە سێ منداڵی ژێکەڵەی هەبوو، دوو کوڕو کچێک، کچەکە لە هەردوو کوڕەکان بچووکتر بوو، هەرسێکیان زۆرجوان بوون، دڵم بەر وەستی نەدەدا پڕ بە چاوم سەیریان بکەم دەمگوت- نەوەک بە چاو بچن- کچەکەیان لە جوانیدا هەر باسی

ناکریێ، هەروەک دەڵێن- مێوژی بخواردبوایە لە گەرووی دیاربوو-گوپ خڕی ڕوومەت پڕ، دەتگۆ لیمۆیە بە تۆقەرەی داڕێوە، نەبوو هی وەکو ئەو هیچ نەبوو، نازانم پەری بوو لە ئاسمانێ هاتبووە خوارێ، یان ڕەسم بوو، بەڵێ بەڕاستی رەسم بوو، بەڵام چ ڕەسمێک !؟ مەزنترین وێنەکێش وێنەی کێشابوو، کە ئەویش خودابوو.. ئەو کچە حوانە، ئەو کچە ڕووخۆشە، ئەو کوریکە بەهارییە دەو بە خەندەیە ناویشی (خەندە) بوو.. هەروەهابەردەوام بوو گوتی: دایکم بەردەوام دەیگوت- چەند لەسەر دەوی دایکی خۆی خۆش بوو کە بانگی دەکرد، من واتای ناوەکەیم نەدەزانی لە دایکیم دەپرسی، ئەو دەیگوت واتە (ئیبتیسام). ناوەکەی زۆر لەلام شیرین و خۆش بوو، ئادم لەگەڵ خوای خۆم کرد ئەگەر کچێکم پێبدا ناوی لێ دەنێم (خەندە).لە دوای ساڵێک خودا نائومیدی نەکردم و بە دڵی منی کرد تۆی بە من دا، تۆ کتومت ئەو بووی، تەنیا ڕەنگی پێستتان جیاوازییەکی کەمی هەبوو، پێستی ئەو لە هی تۆ سپیپات تربوو.. ئەولە دوای هەر ڕستەیەک لە گێڕانەوەی قسەکانی دایکی، قولپی گریان ئەوکی دەگرت، هەنسکەکانی کاریگەرییان بەسەر (کارۆ)شدا هەبوو.کارۆ بە گێڕانەوەکەی سەرسام بوو، لەگەڵ هەر وشەیەک لە بەسەرهاتەکە گونجابوو..ئیبتیسام دوو پەرداخ شەربەتی سێوی هێنا. یەکی لەبەر دەمی کارۆ دانا، ئەوی دیش بۆخۆی: فەرموو بەقوربان با لە جیاتی خەم شەربەت بخۆینەوە.

_ سوپاس.. کارۆ بەوی گوت.

_ ئەم شەربەبەتەت پێ چۆن بوو؟ دوای خواردنەوەی ژنە لێی پرسی.

بە شەرمەوە وەڵامی دایەوە: باسی ناکرێ زۆر بە تام بوو.

ژنە شێوازی جۆراو جۆری بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی سەرنجی ڕابکێشی، بەڵام بێ سوود بوو: هێشتا چیت دیوە لەوەش بەتامترم لەلایە..کارۆ فزەی لێوە نەهات و نقەی نەکرد، ئەویش دیسان ناچار بوو خۆی دواند: ئای ژنێ چەند گەلحۆی..دواتر ڕووی پرسیاری لە خۆی کرد: بە نیازی بە فرە شەربەتێکی تیرو خەستی ئەم پیاوەی هەناوی خۆت فێنک بکەیەوە؟ وەڵامی پرسیارەکەشی هەر خۆی دایەوە: وابزانم دەبێ هەر بڵێی- ئەم نانە بەو دۆشاوەی.. ناچار گرگڕ هاتەوە سەر باسەکەی پێشتر: کارۆ گیان ئەوە شەربەتەکەشمان نۆشکرد با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. دەزانم هەستی

کوردانەم ورووژاندی، دەزانم بیرت پەرتەوازەی کوێ بووە، دەزانم حەزدەکەی چارەنووسی ئەو مامۆستایە بزانی، بەڵێ هەر ئەو مەزەندانەت لێ ڕەچاو دەکەم، بۆیە قسەکانی دایکمت بۆ تەواو دەکەم- دایکم هەنسکی دەداو گریانی ڕانەدەوەستا، بۆم دەسڕییەوە سوودی نەبوو، بە هەنسک و گریانەوە ماچی کردم و منیشی گریاند. بەڵێ دایکم بە هەنسکی گریانەوە بەردەوام بوو: ڕۆڵە دوای مانگێک لە دایکبوونی تۆ، ئەو مامۆستایە باشە،ئەو پیاوە بەڕێزە چەلاوخۆرەکانی ماڵی پاشای قۆلبەستیان کردو شوێنبزر کرا- دایکم گریا گریا،گریانێک قەت دایکم وا نەبینی بوو،جۆرە گریانێک ئەگەر پیاوەکەی خۆشی، مێردەکەی، باوکی من بمردبوایە وای نەدەکرد، فرمێسک لە چاوەکانیدا دەباریـن، منیش بێ ئەوەی بزانم بۆ دەگرییێم لەگەڵ دایکمدا دەگریام، بەلام لێم دەپرسی بۆ دەگریێ؟ ئەو دەیگوت: کچم ئەوها متووی قسە خۆشەکانی و چاونەترسییەکەی ببووم ناتوانم لە بیری بکەم. دایکم دیسان گریا، گریاو ڕوومەتی خۆشی ڕنییەوە: هەر لە من چوو، هەر لە من ڕۆی. ئیبتیسام لەسەر قسەکانی دایکی بەردەوام بوو: تێیگەیشتم دایکم بۆ دەگرییێ، باوەشم خستە باوەشی، ڕوومەتم بە ڕوومەتیەوە نا، لەجیاتی ئەوەی فرمێسکی چاوەکانی بسڕمەوە فرمێسکەکانی هەردووکمان بوونە یەک جۆگەلە، لێوم بە لێویەوە ناو هەناسەم بە هەناسەیەوە، تەنها توانیم یەک ڕستە بچرپێنمە گوێیەکانی: دایە گیان ئەدی (خەندە)کەی من چی بەسەر هات؟بەو پرسیارەم برینم زیاتر کولاندەوە، دیسان گریاو هەر بە هەنسکدانەوە پێی گوتم: کچم دەبوایە ئەو مامۆستایە ناوت لێ بنێ (خەندە)، چونکە من بەڵێنم بەوی دابوو، بەلام کە ئەو بزرکرا باوکت جورئەتی نەکرد و منیشی ترساند، ئەو ناوە لەسەر دڵم بووە کەسەر، ناچار ناوم لێنای (ئیبتیسام)ئەوە خەفەتێکی گەورە بوو، بەلام لەوەش گەورە تر باوکت هەوێیەکی بۆ پەیدا کردم، ئەگەر ئەو بمابوایە ئەو کارە ڕووی نەدەدا، ئەو بەرگری لە مافی ئافرەتان دەکرد و خەڵکەکەش بە قسەیان دەکرد.

ئیبتیسام دۆشداما، ئاخێکی وەک دایکی لە هەناوی کردو دوا وتەی لە ناخی خۆی شاردەوە: باوکم منیشی کردە قوربانی خۆی، بە پیرەوکەیی بەستامیەوە.

کارۆ پرسی: ئەو مامۆستایە بۆ نەفی کرابوو؟

_ دەیانگوت مارکسییە.. ئیبتیسام وای گوت.. (کارۆ)ش پرسی: دیارە ئێوەش هەو بوون بۆیە دایکت ئەوەندە خۆشی دەویست. ئیبتیسام سەری بۆ لەقاند: هەر ئێمە نا، خەلکی گوندی هەموو لەو جۆرە بوون.

_ دایکت لە کوێیە؟ کارۆ پرسی. ئەویش وەلامی دایەوە: قوربانت بم دایکم لە کوێ بێ؟ دایکم چەندین سال لە باوکم بچووکتر بوو، هێشتا لە سەر شنگ و تاقەتی خۆی بوو خەفەت کوشتی، بە چەند سالێک دوای ئەویش باوکم، دوای باوکیشم هەموو کەس و کارەکانم وەک ئەوەی مەرگەمووش لێیدابن هەلوەرین، وەکو شەمەندەفەر فەرگۆن لە دوای فەرگۆن پشتی یەکدییان گرت و بەرەو بەهەشتی خودا رۆیشتن. هەستایەوە لەدەستشۆرکەکەی ناو چیشتخانەکە چەند مستەئاوێکی ساردی بە دەموچاوی خۆیدا کرد، بەسەردەستی کراسەکەشی دەموچاو و شوێنەواری فرمێسکەکانی سرییەوە، هەر لەوێش دوو فنجان قاوەی گرتەوە، خەندەیەکی بۆ کارۆ کرد: حەیاتم من خەمم خوارد تۆ مەیخۆ. کەواتە لە جیاتی خەم قاوە دەخۆینەوە. کورە شەرمی شکابوو:بەلێ قاوە دەخۆینەوە. ژنەش بە پێکەنینەوە: قاوە هێمن و هێورمان دەکاتەوە.

گەشاییەک لە ڕوخسارياندا ڕەونەقی دایەوە، هەردووکیان چەند خولەکێک چوونەوە ناو قۆزاخەی خۆیان و مات بوون، هەریەکەیان بیری لە شتێک دەکردەوە. کارۆ خەیالی لە کەللەیدا جیا ببوەوە، بەرەو گوندەکەی خۆیان بالی گرتبوو، تیژ تیژ، خێرا خێرا دەڕۆیشت و بە ڕوخساری (خەندە) ی کچە پووری دەگرژییەوە،خێرا خێراو بە پەلەش ئیبتیسام گەڕاندییەوە: ها خۆت لێرەو خەیالت لە کوێ؟ وەرەوە وەرەوە بە تەنیا جێم مەهێلە.

_ لێرەم، بیرم لەوە دەکردەوە، دەمەوێ بلێم ئیبتیسام ناوێکی خۆشە، بەلام خەندە خۆشتریشە، کچێکی پووریشم ناوی خەندەیە و زۆر جوانیشە، بابی ماموەستا نییە ئەگەر نا دەمگوت دەق ئەوەیە کە تۆ باستکرد، کچێکی دەسترەنگینیشە. غیرەت ژنەی هاندا لە کوڕەی پرسی: هاوسەرگیری کردووە؟

کارۆ گوتی: نەخێر.. ئیبتیسام بۆ دلنیا بوونی خۆی ئەو پرسیارەی لێکرد: مادام کچی پوورتە و خۆشت دەوێ بۆ پێکەوە هاوسەرگیری ناکەن؟ کارۆ

کەمێک دلنیایی دایێ: بۆ ئەوە نا.. بۆ زیاتر دڵنیا بوون دیسان ژنە پرسی: بۆ نا؟
کارۆ هێشتا لەوەش زیاتر دڵنیایی دایێ: من نە ماڵم هەیە و نە حاڵم حاڵە چۆن دەتوانم وابکەم. ئیبتیسام دەیویست پیازێکی سپیکرای دەست بکەوێت، پرسی: کچەکە ماڵی نییە؟
کارۆ وەڵامێکی دڵنیا کەرەوەی دیکەی دایێ: کچێک لە گوندی بژی ماڵی لە کوێ بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا پرسیاریشی لێکرد: تۆ ماڵت هەیە؟
_ بەڵێ ماڵم هەیە، نابینی؟ ئیبتیسام بە کارۆی گوت. ئەویش ویستی خۆی دڵنیا بکات، پرسی: لەگەڵ هاوسەرەکەت؟
گرمە گرم و تەقە تەقێک سەرنجی هەردووکیانی ڕاکێشا، بە مەزەندەی ئەوان لەدەرگا درا، ژنە دیشداشەیەکی ئەستووری ڕەشی بە سەرە خۆیدا هێناو بەرەو دەرگاکە چوو، کە گەڕایەوە و چاوی بە ڕەنگ و بۆی کارۆ کەوت بافرەیەکی هاتێ. لێوی بۆ ئەو جولاندو چەند کەرتە قەندێکی شکاند:مەترسە هیچ نەبوو. دوو پشیلەی نێرومێ بوون، مێیەکە گڕی گرتبوو دەهاتە بەردەمی نێرەکەو پاندەبووەوەو دەیمڕاند، کەچی نێرەکە خاوو شەرمن و ترسنۆک بوو، هەر سەیری ئەملاو ئەولای دەکردو لەشوێنی خۆی نەدەجولا،مێیەش لە حەژمەتان خۆی بە نێرەکە و بەدارو دیوارو عەرەبانەکەی تۆدادەدا، دەبووە گرمە گرم و تەقە تەق، کەمنیشیان دیت تێیان تەقاندو شەرم و ترس نەیان هێشت بەمراز بگەن، عەرەبانەکەشم دوور خستەوە، بردمە پشتەوەی خانووەکەو لەوێش تەشکە بەرەیەکم بەسەردادا و شاردمەوە. کورە بەبێ ئەوەی هیچ وشەیەک لە قسەکانی ژنەی هەست و سۆزی رابکێشی، پێی گوت: بۆ شاردتەوە؟ دەبێ هەر ئێستا بڕۆم.
ژنەکە ترساندی: گیانەکەم بڕۆ بەڵام عەرەبانەکەت لێرە بەجێ بهێڵە، تۆ شەڕت کردووە ئێستا شەقاوەکانی بەغدا کۆدەبنەوە، چەند کەسێکی وەکو خۆیان دەنێرن ڕێگەت لێدەگرن و تێرو پڕت لێدەدەن. هەر بەوەش لێت ناگەڕێن بەگرتنیشت دەدەن.تۆ لەوانەیە نەزانی شەقاوە چییە، ئەوانە بێ ئیش و کارو کاسبین، گەلۆر گەلۆر لەوێ بۆئەوێ بەدوای شەڕودزی وجەدەییدا دەگەڕێن، کەسیش ناوێری خۆی لە قەرەیان بدا، پشتیان هەیە ئەگەر ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ بگیرێن، لە دووەم و سێیەم ڕۆژدا بەرەڵلا دەکرێن. ئەو

کوڕە هەرزەیەی بەر شەق و پێلەقانتداو یاری مشک و پشیلەت پێدەکرد،ئەو بە عەرەبانەوە تۆی دیوەو بۆ عەرەبانە ناتناستەوە،کەڕۆیشتی من لەگەڵت دێمە دەرەوەوبە پەیتونێک دەتنێرمەوە، تۆش کە گەیشتی ئەملاو ئەولا مەکە با نەتدۆزنەوە، هەر ئەو پەیتونەش تێدەگەیەنم بەیانی بتگەیەنێتەوە ئێرە، با چەند رۆژێک بەمجۆرە بۆ تاکو شەقاوەکان لەبیرت دەکەن ولێت نائومێد دەبن. تۆ چاکەیەکی گەورەت لەگەڵ مندا کردووە، منیش نابێ بە چاکەیەکی بچووک تۆڵەت بۆ بکەمەوە؟..ئیبتیسام زمانی وەکو گازمالوکەی فاقێ بوو،ئەوەندە لە ترازیش بوو زوو تەیرو تەواڵی دەگرت، بە تایبەتی کوکوختییەکان، هەرچی بشیگرتبوایە بە ئاسانی بەرەڵلای نەدەکرد.. گەڕا هەندێک کێک و برێشکەو تۆخم و نوقلی دەرهێناو کردییە ناو کیسەیەک و برێک پارەشی خستە ناو کیسەکە: ها ئەوە شەپقەو چاویلکە ڕەشەکەی پیاوەکەمە لەدوای بەجێماوە، ئەم کیسەیەش وەربگرە ئەم شەوە خۆتی پێوە خەریک بکە، لەبیر نەکەی بەیانیش زوو وەرەوە پێکەوە نانی بەیانی دەخۆین، پەنیرو هێلکەو سەرتوێژو هەنگوینی خۆشم هەیە بەبێ تۆ نانی ناخۆم.
بەیانی زوو دەنگی شەق وهۆڕی سمە ناڵکراوەکانی هەر چوار پەلی ولاغە بەرزەکان لە گوێیەکانی دەنگیان دایەوە، کە ئاژوەری پەیتونەکە بەبەر قامچیانی دابوون و بە خێرایی شەقامەکەیان شەقدەکرد. لووشە لووشی ئەوان و گاسە گاسی لێخوڕەکە دەریان پەڕاندە دەرەوە.وەک ماری بێ ئیجازە بە دووسێ جلیتان گەیشتە بەر دەرگای دەرەوەی مزگەوت، سەیری کردهەمان ئاژوەرو پەیتونی دوێنییە. تۆخەیەکی کردو بەتەناش بەرەو ژوورەکەی گەڕایەوە،خۆی و نوێنەکانی رێکخست. بە پەنادزە، نەوەک مەلا بیبینی، گەیشتە پەیتونەکەو سلاوێکی گەرمی کرد و لەتەنیشت ئاژوەرەکە دانیشت. هەرکە دانیشت باپێچێک مێشکی سووڕاند و پێچی پێکردەوە، ئەوەی بە بیر هێنایەوە: کە شەپقەو چاویلکەکەی دامێ گوتی ئەمانە لە پیاوەکەم بەجێماون. پرسیاری لە خۆی کرد: دەبێ مەبەستی چی بێ، ئایا مێردەکەی چووەتە دەرەوە و ئەوانەی لەبیرچووە، یان مردووە؟
کە گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی ژنەی، کارۆ هاتە خوارەوەو لە دەرگایدا، ژنە وەک یاپراغی پێچرای بە دیشداشەیەکی ڕەش و ڕەفتەیەکی باشووریانەی

ریشەداری بە زەنگیانە چنرا و، دەرگای کردەوەو چەند پارچە پارەیەکی ئاسنی دایە کارۆ و ئامارەی بۆکرد بیداتە لیخورەکە. ژنە بە پەلە خۆی گەیاندە ژووری نووستن، رەفتەو دیشداشە رەشەکەی بەلاوەنا، بەکراسێکی کورتی نیوقۆڵی پەمەیی وەک باڵی میشی تەنک و بێ ئاوەڵکراس، لە پێشەوە نیوەی مەمکی دانەپۆشیبوو،گەڕایەوە هەردووکیان چوونە ژووری ئاشخانەکە، هەریەکەیان چواربەندێکی بۆخۆی راکێشاو لەتەنیشت مێزەکە لە بەرامبەر یەکدی دانیشتن.کارۆ لە ژیانیدا، لەو تەمەنەی چ لە گوندو چ لە شار بەسەری بردبوو، نە ئەو جۆرە خواردنانەی تام و بۆ کردبوو، نە ئەو سینگ و بەرۆکە پڕەی بینیبوو. سەرەتا نەوس تاوی دا ویستی شەلم کوێرم ناپارێزم دەستی بە ناو خواردنەکەدا بگێڕی و تێبەربێ. دواتر سلەمیەوە: با پەلەی نەکەم دەترسم بەنەدیتکەم بزانی،لە دڵی خۆیدا وای گوت.

ژنە، کەرتێک هێلکەو لەتێک پەنیرو بڕێک سەرتوێژی لەناو پارچەیەک نان کرد، هەندێ هەنگوینیشی بەسەردا کردن و کردییە بابۆڵە: فەرموو بیخۆ، ئاگاشت لێبی خۆت پیس نەکەی، تۆ شایستەی زۆر لەوە زیاتری.

_ئەوەی من کردم هیچ نەبوو.. کارۆ بە ئیبتیسام ی گوت.

_ چۆن هیچ نەبوو، تۆ سەرو ماڵ و نامووسی منت کڕییەوە، ئەگەر تۆ نەبوای دەبوایە لە نێوان ماڵ و دادگادا کەوەڕێ بم و هیچیشم بە هیچ نەدەکرد، لەوانەیە تووشی لەوەش خراپتر بوومایە. گیانەکەم ئێرە شارە گوند نییە، لەم وڵاتەشدا ئەم شارە شاری شارانە، پایتەختی وڵاتە، شارێکی وەک ئەم شارە دەریایە، سەری هارو ماری تێدایە، سەرەڕای ماسی و گوێچکە ماسی و دوڕو مەرجان و بەردی گران بەها، چەندین مارماسی و قرژاڵ و نەهەنگیشی تێدایە،ئاگات لە خۆت نەبێ دەبیە خۆراکی ئەو دڕندانە. ژنە تیچاوێکی دایێ زانی مڕ بووە، ئەوەندەی خواردووە پڕ بووە: گیانە باچایەکی شیرینت بۆ تێبکەم.

_ خراپ نییە دەڵێن- چایە بۆ ژانەسەر باشە.. کارۆ وای بیستبوو.

ژنە لە کارۆی پرسی: خوا نەکا، خۆ ژانە سەرت نەگرتییە؟

_ دوور لەتۆ لە نیوەی شەوێوە لایەکی سەرم وەختە بتەقێ.

ژنە وەرچەرخا، بەبیرو هۆش و تەواوی جەستەیەوە بۆ لای ئەو سووڕایەوە،

بۆ ئـەوەی ناولەپـی بخاتــە ســەر ناوچەوانــی، کەچــی وازوازییــەک گرتــی وازی پێهێنـا، ناچـار زەردەیەکـی بۆکـرد: تـای گەرمـت لێیـە؟ کارۆ وەڵامـی دایـەوە: بەڵـێ گەنـدە تایەکیشـم لێیـە.
هەسـتایەوە دوو قلـە حەبـی ژانبـڕی- یەکـی ژانەسـەرو یەکـی تـای-بـۆ هێنـا، هـەر لەسـەر مێزەکـەش پەرداخێـک ئـاوی بـۆ راگرت:فەرمـوو ئـەم دوو قلـە حەبـە قـووت بـدە. پفێکـی بـۆ ئەمـلاو پفێکیشـی بـۆ ئـەولای کـرد: دوعـام بەسـەریاندا خوێنـد ئێسـتا دەبیـەوە گوێـزی سـاغ. ژنـە وای پێگـوت و لەگەڵیـدا کەوتـە حەنـەک و زارگەمە:ئێسـتا نوکتەیەکـت بـۆ دەگێڕمـەوە، حەیامێـک لەمەویـەر بۆیـان گێڕایمـەوە، ئەوەنـدە پێدەکەنـی ئـەوەی ژان بێـت لـە لەشتدا نامینـێ.
هەبـوو نەبـوو ژنێـک هەبـوو مێـردی مردبـوو، هێشـتا جـوان و ڕێـک و گەنـج بـوو، ماڵـی هەبـوو منداڵـی نەبـوو، لـە سـەر دەسـت و مسـتی خـۆی بـوو، لـە ماڵـی خـۆی بـە تەنیـا بـوو، ماڵـی لـەم شـارە بـوو لـەم شارەشـدا کەسـی نەبوو، پێویستی بـە پیاوێکـی مـەردو ئـازا هەبـوو، ئـەوەی ئـەو دەیویسـت لـەم پایەختـەدا کـەم بـوو، ڕۆژێ لـە ڕۆژان بـە ڕێکـەوت تووشـی بـە تووشـی پیاوێـک بـوو، ئـەو پیـاوە هەمـان ئـەو خەسلەتانەی تێدا بـوو، بـەڵام زۆر شـەرمن بـوو.
بێـوەژن بـە ڕاسـتی بـوو دەیویسـت ئـەو پیـاوە بکاتـە هاوسـەری خۆی،سـەرو مـاڵ و سـەروەت و سـامانەکەی بخاتـە بـەر دەسـتی ئـەو پیـاوە، ئەویـش لـە دزو جـەردەو ڕێگـران بیپارێزێ،بێـوەژن ماوەیـەک خەریکـی ئـەو پیـاوەی بـوو، خواردنـی خۆشـی بـۆ دروسـت دەکـرد، پـارووی بـە هەنگوینـی بـۆ لـوول دەدا، دەیدایـە دەسـتی بیخـوا، کەچـی ئـەو نـەزان بـوو لـە جیاتـی دەسـتی بـۆ دەوی بیبـا بـۆ چـاوی دەبرد.-ژنـە دایـە قاقـای پێکەنیـن. ئەویـش فرکـە فـرک کەوتـە خوێنـی دەمارەکانـی و بـە پێکەنینـەوە بـە ژنـەی گـوت: ئـەو بێـوە ژنـە نـاوی چـی بـوو؟
ژنـە نـەک هـەر قاقـای پێکەنینەکـەی نەبڕیـەوە. بەڵکـو هەروەختبـوو زگیشـی لـە گەڵیـدا بتەقـێ، دوای هێـور بوونـەوە: ناویـت بـۆ چییە؟دیـارە حـەزت لـە بێـوە ژنانـە، دەتـەوێ بچیـە لای بیناسـی و لـە خۆتـی مـارە بکـەی. کـوڕە بـە شـەرمەوە: نـا بەخـوای هـەر وا پرسـیم.. ژنـە وەک دەرفەتێـک ئـەو قسـەی کارۆی قۆسـتەوە: بـۆ نا؟بێـوەژن بـۆ تـۆ باشـترە، تـۆ زۆر نـازداری یەکێکـت پێویسـتە بزانـی نـازت هەڵبگـری، کـچ ئـەوە نازانـی، بێـوەژن ئەزموونـی هەیـە و

شـارەزا بـووە، ئەگـەر لـە بـەر هـەر هۆیـەک لـە ئەزموونـی یەکەمیـدا هەرەسـی هێنابـێ، بـە ژیانـی خـۆی بەرگـری لـە دووەمیـدا دەکات، کەچـی کـچ بەچـاو بەسـتراوەیی دەچێتـە نـاو هۆڵـی یەکـەم تاقیکردنـەوە و هیـچ پێداویسـتییەکی ئـەو تاقیکردنەوەشـی لـە هەگبـەدا نییـە، دەبێتـە بـار بەسـەر شـانی پیاوەکـەی و هـەر ڕۆژەی کۆسـپێک بـەری دەرگای ماڵـی هاوسـەرگیریەکەیان لێدەگـری و ئاسـتەنگێک ژیانیـان تفـت و تـاڵ دەکات، سـەرەڕای ئەوانـەش بێوەژنـی وا هەیـە لەسـەر دەسـت و مسـتی خۆیەتـی و مـاڵ وحاڵـی هەیـە، دوای مێردکردنـی دەتوانـی ئەویـش بژیێنـی.. ژنـە وایلێکـرد ڕاسـت و چەپـی خـۆی نەناسـیتەوە.
کارۆ بـە شـەرمەوە بـە ڕوویـدا گرژبیەوە:لـە گوندەکـەی ئێمـەش بێوەژنێکـی زۆر جـوان هەیـە، خزمـی خۆشـمانە، گـەورە نییـە بـەڵام کوڕێکـی گچکـەی هەیـە.. ئیبتیسـام غیـرەت گەیشـتە کونـە لووتـی، بـە مـۆڕی سـەیریکرد: جوانـی چـی؟ لەوانەیـە هـەر لەبـەر چـاوی تـۆ جـوان بێت،باخزمـی خۆشـتان بێـت، کـوڕی خەڵکی بـە تـۆ چی؟لەوانەیـە لـە داهاتـوودا ببێتـە دوژمنـت، مـن گوتـم بێـوەژن نەمگـوت- مانـگای بـە گۆلـک-ئـەو هەمیشـە منداڵەکـەی خـۆی لەتـۆ خۆشـتر دەوێ. گیانەکـەم زەیـن و هۆشـت بێنـەوە سـەری خـۆت سـوود لـەو جـۆرە بێوەژنانـە نابینـی.
هەسـتایەوە بـای دوو کـوپ چـای لێنـا، یـەک بـۆ خـۆی و ئـەوی دی بـۆ کارۆ، هـەر بـە چـا خواردنـەوە ڕووی تێکـردەوە: هـا لێـرەی یـان لەوێـی؟
_ لە کوێ بم؟هەر لێرەم.. کارۆ وەڵامی دایەوە.
_ چوزانم وامزانی لای مانگا بە گۆلکەکەی.. ژنە بە گاڵتەوە وای گوت.
کارۆ لـە مانـگاو گۆلکەکـە گەیشـت بـەڵام خـۆی لێنـەزان کـرد: نـا، بـە نیـاز نیـم بڕۆمـەوە ئـەو لای.
ژنـە لـە هەوڵـدان بـەردەوام بـوو: کارۆ گیـان تـۆ پشـتت کردۆتـە خـۆر بۆیـە تەنیـا سـێبەری خـۆت دەبینـی، کەواتـە بـا بێینـەوە سـەر باسـەکەی خۆمـان، تـۆ لـە ڕێـگا لێـت پرسـیم هاوسـەرگیریم کـردووە یـان نـا، ئەوکاتـی وەڵامـم نەدایـەوە، حـەز ناکـەم دڵـت بشـکێنم ئێسـتابەدرێژی و بەپانـی هەمـوو شـتێکت بـۆ باسـدەکەم: مـن یـەک جـار هاوسـەرگیریم کـردووەو تێیـدا سـەرکەوتوو نەبوویمـە، کـە دەڵێـم سـەرکەوتوو نەبوویمـە، واتـای ئـەوە نییـە مـن هـۆکاری ئـەو شکسـتە بوویمـە، بەڵکـو هـەر سـەرەتای یـان بناخـەی بینـای هاوسـەرگیریەکە ڕفـۆک

بووه، خودی هاوسەرگیریەکە لا سەنگ بووه، بە هیچ جۆرێک هاوسەنگی تێدا ڕەچاو نەکراوه، گرێبەستێکی بەو جۆرەش کە ژیانی دوو مرۆڤی پێ دەبەسترێتەوه مەحاڵە بەردەوام بێت، گرێبەستێک بە زۆری زۆرداری و بەبێ ویستی لایەنێک لە دوو لایەنەکە ئەنجام درابێت چۆن بەردەوام دەبێت. ئەگەر بەردەوامیش بێت لە ژێر پێ نانی هەموو ماف و حەزو ئارەزووەکانی لایەنە مافخوراوەکەیە.. کارۆ گیان ئەوەی بیستت پێشەکییەکی کورت بوو دەربارەی هەر هاوسەرگیرییەک، دەربارەی هاوسەرگیریەکەی خۆشم کەمێک درێژتر باسی دەکەم: پیرەوکە بووم گەورە بە گچکەیان پێکردم، هەر لەو کاتەوە پیرەش و بەد بەخت بووم. ئەو گەورەبە گچکەیە لە جیاتی ژنی دووەمی باوکم بوو، دایکم دوای ماوەیەک بەنەخۆشی لارەشە خودا بۆ بەهەشتی خۆی بردەوه، ئەو پیاوەی من مارەبڕی بووم ژنی یەکەمیشی مابوو، باوکم لە پێناو خۆشی خۆی ئەگەر هەموومانی لە ئاوێ بکردبوایە باکی نەبوو. ڕۆژو مانگ و ساڵەکان دەهاتن و دەڕۆیشتن مەینەتییەکانم لەسەر دەستی زڕدایکم گرد گرد دەچوونە پاڵ یەکدی و دەبوونە زنجیرە چیا، تاکار گەیشتە ئەو ڕۆژەی تازە کۆتەرەی مەمکم دادەناو خەریک بوو گلێرەی دەگرت. باوکی زڕدایکەکەم داوای دەکرد بمگوازێتەوه،من دەگریام وباوکم دەیگوت هێشتا ماویەتی، کەچی پیاوە مارەبڕاوەکەم نموونەی بەوە دەهێنایەوەو دەیگوت- خۆ ئیبتیسام لە عایشەی بچووکتر نییە، ئەوە ئەو نەبوو لەتەمەنی (٩)ساڵی گوازرایەوه،بەهەزار تکاو پاڕانەوەو بە هونەری مامێکم یەک ساڵی دواخست، دوای یەک ساڵەکە هەرچەندە ڕازی نەبووم وکردمە دادو فیغان، چاووڕاوی کوشتنیان لێکردم، بە ناچاری سەرم هێنایە بەرێ و گوازرامەوە. ئەو لەلوتکەی تەمەنیدابوو منیش هێشتا حەزمدەکرد هەموو شەوێ لە جیاتی مێرد بووکە شووشە لەباوەشم بگرم. ئێمە خەلکی گوندێکی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات بووین، ئەوانیش لەبنەڕەتەوه خەڵکی هەمان گوند بوون، بەڵام ماوەی چەند ساڵێک بوو بارو بارگەیان تێکنابوو لەم شارەدا گیرسابوونەوه. ماوەیەک دوای هاوسەرگیرییە زۆرە ملێیەکەی من ژنی یەکەمی- نازانم بەهۆی نەخۆشی درێژخایەن بوو یان هەوێیاتییەکەی من بوو- بە زگیداو مرد. کابرای مێردم کاسبییەکی باشی دەکردو سامانێکی زۆری لەم شارەدا کۆکردبووەوه، بۆ ئەوەی من

لێـی ڕازی بـم و خۆشـم بـوێ هەمـوو ئـەو پـارەو پوولـەی دەسـتی دەکـەوت لەدەسـت منـی دەکـرد، لەمـاوەی چەندسـاڵێکدا توانیـم پارەیەکـی زۆر بەسـەر یەکـەوە بنێـم و بـەو پارەیـە ئـەم خانـووەم کـڕی. ئێسـتاش ئـەم خانـووە هـی منـە و تاپۆکەشـی بەنـاوی خۆمـە، جگـە لـەم خانـووەش سـامانێکی زۆری بـۆ بەجێهێشـتووم و ئەویش تـۆ خۆش..هەرچەنـدە کارۆ بـەو قسەیە کەمێک ڕسکاو دڵیشـی ئـاوی خـواردەوە و دڵنیابـوو ئیبتیسـام بێوەژنـەو مێـردی نەمـاوە، مـەزداش قدیلانـەی دەکـردەوە تاکـو بـە حیتـە حیتێـک یـان خەندەیـەک یـان هـەر نەبـێ بـە گرژینەوەیـەک، کانیـاوی چاوەکانـی لـە خۆشـییان بزێـن و بـە دوو جۆگەلـەی باریکـدا بڕژێنـە نـاو ئەشـکەلکی دەوی و لێـوارە وشـکبووەکانی ڕەبـاس بکـەن، کەچـی لـە هەمـان کاتـدا ئەهریمەنێکـی ڕەش سـاردییەکی دەخسـتە دڵـی و سـەرچیفی دەبـرد: داپیـرم بـە ڕەحمـەت بـێ دەیگـوت- ئـای لەبێـوەژن چەنـد مەکربـازە، کۆنـە دەفرۆشـی بـە نرخـی تـازە- کارۆ بـە ئیبتیسـام ی گـوت: خانووەکـەو هەمـوو سـەروەت و سامانەکەشـت پیـرۆزە و خێری لـێ ببینی،بەڵام پرسیارێکت لێدەکـەم: ڕەحمەتـی چەنـد دەبـێ مردووە؟. ئیبتیسـام بـەردەوام بـوو: هیـوادارم هەراسـانم نەکردبـی، ئەگەرپشـوو درێژبـی هـەر ئێسـتابۆت باسـدەکەم: هاوسـەرەکەم لـە بـواری کارکـردن و خۆبژێویـدا نموونـەی کـەم بـوو، لـە پێنـاوی پەیداکردنـی پـارەو خۆدەوڵەمەندکـردن هـەر لـە غـارە غـارو قۆشـمەدابوو، بـۆ ئـەو مەبەستەشـی ئاگردانـی بەتـەواوی لەیـەک شـوێن گـەرم نەدەکرد،لـەوێ بـۆ ئـەوێ گەڕیـدەی شـاران بـوو. دوای ماوەیـەک لـە هاوسـەرگیریەکەمان کۆمەڵێـک کاری بەڵێندەرایەتـی لـە شـاری هەولێـر پـێ سـپێردرابوو، لـەم کارەشـیدا لەگـەڵ کەسـێکی ئـەو شـارە هاوبـەش بـوو، دیاریـوو لـەوێ ناسـیاوی لەگـەڵ هەنـدێ بنەماڵـە و خەڵکـی بـاش پەیداکردبـوو. ئاووهـەوای شـارەکە زۆرخـۆش بـوو، لەهەمـان کاتـدا نەیدەویسـت مـن و هەوێیەکـەم پێکـەوە لـە یـەک ماڵـدا دابنیشـین، بۆیـە منـی بـردە ئـەو شـارە و ژنـە گەورەکەشـی لـە بەغـدا بەجێهێشـت. سـەرەتا پێـم وابـوو شـاربەدەرکراوم و دەکەومـە غەریبیـان، چەنـد مانگێکیـش هەروابـوو. ژنانـی ئـەو گەڕەکـەی ئێمـەی لێبـوو دوای عەسـران لەبـەر دەرگای ماڵەکانیـان بـە کۆمـەڵ دادەنیشـتن، مـن زمانـی ئەوانـم نەدەزانـی لەگەڵیانـدا دابنیشـم و بدوێـم، ناچـار لـە کونـی ژوورەوە نەدەهاتمـە دەرەوە، ژنانـی ئـەو شـارە کـەم لـە ماڵـەوە دەهاتنـە دەرەوە، هاتنـە دەرەوەشـیان بـە

عەباو پەچە بوو. مێردەکەم بەهۆی کارەکەیەوە هەندێ خەڵکی خوێندەوارو دنیادیتەو چاوکراوەی دەناسی و تێکەڵاوییەک لە نێوانماندا دروست ببوو، کەم کەمە هات وچۆی یەکدیماندەکرد، هەندێ لە ژنەکانیش دەیانخوێند، ئەوان و پیاوەکانیان عەرەبییان دەزانی بۆمن فەراموشییەکی باش بوون و خدووم پێوە گرتبوون.. لە ماوەی مانەوەمان لەو شارەدا سەدان وشەی زمانی کوردی و چەندین ئاکارو ڕەوشتی بەرز بوونە زادی ژەمەکانی ڕۆژانەم و گوارەی گوێیەکانم، کە هەتا ماوم دەزرنگێنەوە. قەت ئەو کچ و کوڕە ژیکەڵانە لە یادم ناچنەوە کەلەبەر دەمی ماڵەکان و لە ناو کۆلانەکەماندا کۆدەبوونەوە و دەستی یەکدییان دەگرت، وەک چۆلەکە دەیانکردە ویسە ویس و بە ئاوازی خۆش گۆرانییان بە گوێماندا دەچڕی، لە گەڵ ئەو گۆرانی گوتنەشدا یارییان دەکردو هەڵدەپەڕین. ئای چەندحەزم دەکرد منیش لەگەڵ ئەواندا هەڵپەڕیبام، خۆ منیش هەندە لەوان گەورەتر نەبووم. بەداخەوە ماوەی مانەوەمان زۆر درێژ نەبوو،هەروەک پێشتر باسمکردهەوێیەکەم بە زگی داو مرد،پیاوەکەشم لەبەر منداڵەکانی لەهاتوچۆی نێوان بەغداو هەولێر بە ڕووداوی هاتوچۆ گیانی لەدەستدا.من زۆر حەزم لەوە بوو لەو شارە بمێنمەوە بەڵام کەس وکارم ڕازی نەبوون..

ئیبتیسام هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و سینگی خۆی دەرپەڕاند، بە نوێنەرایەتی دڵی تیرێکی تیژی بە کەوانی چاوەکانی هاویشتە کارۆ: بە قوربان دەزانی بۆ بە کوردی قسەت لەگەڵدا ناکەم؟ هەر بە خۆشی وەڵامی دایەوە: هەتا بە باشی فێری زمانی عەرەبی بیت، چونکە لێرە پێویستت پێی هەیە.

_ ئاوها !!.. کارۆ بە سەرسوڕمانەوە وای گوت.

چاوی گێڕا کورسییەکی تەنیشت کارۆی دەستنیشانکرد، چووە بنپاڵی وبەبێ شەرم دانیشت، سەری بەسەریەوە ناو نەنا، لەوانەیە چەند داوە موویەک لەنێوان سەریاندا مابێت، چرپاندییە بناگوێی: کارێکم پێتە بەڵام با چۆلەکەکانیش گوێیان لێنەبێت، لەوانەیە سیخوڕیمان بەسەردا بکەن،بەڵێ سیخوڕی بەوانیش دەکەن، زۆر لایەن و گرووپی شەڕانگێز هەن لە شەڕی دەروونیدا ئەوان و نموونەی وەک ئەوان بەکاردەهێنن، ئێمەش بای خۆمان لەو جۆرە دوژمنانەمان هەیە.

_ ئێ باشە باوابێ، ئەدی ئەو کارە نهێنییەت چییە کەبە من دەکرێ !؟
ژنە لەبەردەم کورەی خۆی زۆر پەرپووت و بێنەوا کرد: گیانە من حورمە و زەعیفەمە، دەسەلاتی سەربڕینی مریشکەکم نییە. ئەم شارەش پڕی سەو سوارو خەلکی بەدڕەوشتە، بۆ ژنێکی تەنیای وەکو من زەحمەتە لەدەست ئەو گورگانە بەسەلامەتی دەربچم، بەچاوی خۆت یەکێک لەو دزو قۆلبڕانەت بینی. من تەنیا متمانەم بەتۆ هەیە. ناموسی خۆم دەدەمە دەستی تۆ، تۆش مەردبەو بیپارێزە، پیاوی مەرد هەر ئەوەی لێ دەوەشێتەوە مەردایەتییەکەی خۆی نەدۆڕێنی. ئەوەی من لە تۆم دەوێ کارێکی قورس و سەخت نییە،دەمەوێ هەموو بەیانیان زوو بێیەئێرە زەمبیلێک ببەی و بڕۆیە بازاڕ، ئەو خواردن و کەلوپەلانەم بۆ بکڕی کە پێویستمە، کرێی خۆشت بە دەبلی وەربگرە، دلنیام نائومێدم ناکەی لە تۆ زیاتر کەسی دیکەم نییە بڕوای پێ بکەم..
کرێی دەبل لای کارۆبووە شەکرۆکەی ترش و شیرین، مژتی مژتی تاکو کانیاوی دەوی زا: مادام ناموسی خۆت دایە دەستی من بەو چاوانە دەتپارێزم، هەر ئێستا زەمبیلێکی بە تالم بدێ و ناوی کەل وپەلە پیویستەکانم پێ بلێ، بەیانی لە بازاڕ دەیانکڕم و دەیانهێنمەوە،هەموو ڕۆژێ بەمجۆرە، نەک بەیانیان بێم زەمبیلی ببەم و بڕۆمە بازاڕو بگەڕێمەوە و دیسان بڕۆمەوە، لەو- هێن و من هێنە- کاتمان زۆر بە فیڕۆ دەچێ.
ئیبتیسام خەندەیەکی بۆ کرد و پێی گوت: دەزانی تۆ لە من و لە بابیشم ئاقلتری.
ئەستەغفیروللا، هەموو کەس لە من ئاقلترن، من کابرایەکی بێسەرو گوێم چۆنم بازێن ئەوها دەڕۆم. کارۆ وای گوت، کەچی ئیبتیسام هەلینا و پفی دا: قوربان ئەوەی تۆ ئاقلت پێدەشکێ کەس ڕێبەدەریشی پێنابا. کارۆ خۆی لەو هەلنانە زۆرە بەکەمتر دەزانی، بۆیە گوتی:خۆزگە وابوایە.
شەپقەو چاویلکەو زەمبیلەکەو پارەکەی ناو زەمبیلەکەشی وەرگرت، پارەکەی دەرهێنا ژماردی: سەفتەیەکی باشە، کرێی ڕێگاش نادەم بە پێیان دەڕۆم....
کارۆ بەمجۆرە بیری کردەوە.
ڕۆژانە زەمبیلی بە پڕی بە شانیدادەدا و- ئەگەر جار جارە سواری پەیتون بوایە ئەگەر نا- بە پێیان هاتوچۆی دەکرد. ئەو پارەیەی لە

دوای کرینی پێداویستیەکان دەمایەوە ژنە لێی وەرنەدەگرتەوە، ئەو پارەیە بڕێکی کەم نەبوو، ئەوەی لەلای ئەو دەستی دەکەوت زۆر لەوە زیاتربوو کە لە عەرەبانچییەتی و کۆلگرییەکەی دەستی دەکەوت.

بەیانییەکی سارد بوو،مانگی شوباتی (١٩٥٣) بوو، ئیبتیسام ئەو ڕۆژە لە هەموو ڕۆژەکانی دیکە زووتر لەخەو هەستابوو هورینەی دەکرد: ئەمڕۆ چلەمین ڕۆژی یەکدی ناسینمانە، چل ڕۆژ لەتەمەنی عەشقدا کەم نییە، عەشق دەبێ لە هەر ڕۆژێکدا بەلای کەمی بستێک گەشە بکات، عەشقی ساڵێک پێی لەسەر زەوی و سەری لەناو هەورەکانە، عەشقی چەند ساڵە لە ئاوێنەی مانگ ڕوخساری خۆی دەبینێ، عەشق بەهێزو نەمرە، ڕوحێکی ئەزەلییە، بەژنی ئەوەندە بەرزە هیچ ڕوحکێشێک بۆی نییە دەستی بگاتە لووتی و بە زیندوێتی بیخنکێنێ، عەشق گوللە بەندی لە پشتێیە، عەشقکوژەکان گوللەکانیان چرووکە، خەنجەرو چەقۆکانیان کولن نەک هەر عەشق هەتا جوجکەیەکیشیان پێ سەرنابڕێ، باڵەخانەی ماڵی عەشق لەناو تەڵبەندی پۆلایینی سینگدا بنیات نراوە، لەناو لەپی فاتیمەی زەهرادایە، حەسەن و حوسێن دەستیان پێوە گرتییە کێ حەدی هەیە بیڕووخێنێ.. مەشقەرەی ئاگری عەشقی کارۆ و داخی سەری حەسەن و حوسێن سینگە کوژێیان پێگرت و تووڕەیی ناخی هەژاند، بەسێ چوار چەپەڕۆکی دەموچاوی و چوار پێنج مستەکۆڵەی سینگی هەموو تووڕەییە پەنگخواردووەکەی ناو سینگی ڕژاندە سەر معاویە و دارو دەستەکانی. دڵی ئاوی خواردەوە، بەڵام هەردوو قۆرتی چاوەکانی پڕ لە ئاو بوون، لە دەلاقەکانی ژوورەکەیدا بە دوای کتێبێکدا دەگەڕا ناوونیشانەکانی پێ نەدەخوێندرایەوە.. هەندەی نەبرد گرەکەی نیشتەوەو بووە پشکۆ، پشکۆکەش بەرە بەرە بووە خۆڵەمێش. هەستا دەموچاوی خۆی شوشت، دیسان بەناو دەلاقەکاندا گەڕا،ئەو کتێبەی دەیویست دۆزییەوە: کتێبێکی خۆشە هەتا ئەو دێتەوە خۆمی پێوە خەریک دەکەم..بە چاویلکەیەکی نمرە یەکی تایبەت بە خوێندنەوە هەردوو چاوە قەتییەکانی خۆی شاردەوە، کورسییەکی لەبەردەم تیشکە زێڕینەکانی خۆرە مەلۆتکەکەی بەر دەرگای ناندینەکە دانا و دەستی بە خوێندنەوە کرد: (ئەوانەی لەبەر چاوم ڕاستەوخۆ پێمدا هەڵدەڵێن و ستایشم دەکەن،

ئەوانە دیوارێکی لووتبەرزانەی ئەستوور لەبەر دەمم دروستدەکەن بۆ ئەوەی بستێک پێشەخۆم نەبینم).. سەری لەسەر کتێبەکە لاداو بیری کردەوە:
ئەو خەسڵەتە لە مندا نییە،هەرچەندە بابایەک هەنە ئامۆژگاریم دەکەن - پیاوێکی قیت و قۆزو دەوڵەمەندی وەکو خۆم بکەمە هاوسەرم- لەو گوێیەم دێت و لەوی دی دەڕوا و باکیشم نییە، کارۆ بۆمن لەسەرم دێ و لە پێم دەردەچێ..) چەند لاپەڕەیەکی دیکەی لە کتێبەکە ئاودیو کرد و چەند ڕستەیەکی دیکەشی لێ خویندەوە: (جوانی بەردەوام نابێ، هەتا ئەو کچەی لەبەر چاوان زۆر جوانە، دوای مێردکردن و منداڵبوونی بەژن و باڵا مامزیەکەی دەبێتە باڵای بارگینێکی ماندوو. جوانی دەرەوە تەنیافاقێکە بۆ ڕاکێشانی پیاو، پاداشتێکە سروشت داویەتی بە ئافرەت بۆ ئەوەی پیاوێکی پێ ڕاو بکات، جوانی جۆرێکە لە فێلی چاو. سینگێکی پڕ چ بەهایەکی دەبێت ئەگەر دڵێکی ڕەقی تێدابێ، دەم ولێوێکی فستقی چ نرخێکی دەبێ ئەگەر زمانێکی تێدابێ ژەهر برێژێ، پرچێکی لوولی بریقەدار بۆچی باشە ئەگەر لە ژێریدا عەقلێکی ژیرانە نەبێ، دەست و قۆڵ وباسکێکی جوان نەفرەتێکە ئەگەر پێلاو بۆ ڕووی پیاو بەرز بکاتەوە).کتێبەکەی پێکدادایەوەو سەیری کاتژمێرەکەی کرد، حەوت ونیوبوو. پەنجەرەی ئاشخانەکەی کردەوەو گوێی مووچ کردەوە، لە دەنگە دەنگی مووچە خۆرو فەرمانبەرانی حکومەت و قیژەی هەندێ لەو ژنانەی لە نانەواخانەکان دەهاتنەوە زیاتری نەبیست.
گرژییەک ڕوخساری گرژکرد، بۆ خۆی دووا: دەبوایە ئێستا بگەیشتبوایە، یان ئەوەتە لەخەو ماوە یانیش پارەکەی کەمی کردووە نەیتوانیوە پەیتونێک بەکرێ بگری.
تەقە تەقی دەرگای دەرەوە ئەلقەکانی زنجیری بیرکردنەوەکەی پچڕاند، غاریدا کردییەوە: سوپاس خودایە خۆیەتی.. زەمبیلەکەی لێوەرگرت و زوو هاتنە ژوورەوە. چووە ناو ئاشخانەکەو خەریکی ئامادەکردنی چێشتەکە بوو، لەماوەی نیو کاتژمێردا مێزی نانخواردنی بە چەندین خواردنی بەتام ڕازاندەوە. بە قسەی خۆش و خەندەی ژێر لێوان و نەرمە پێکەنین ئەو ژەمەشیان نۆشی گیانیان کرد. ئەو ڕۆژە ئیبتیسام زیاتر خۆی لێ نزیک دەکردەوە، کە خواردنەکانی دا دەنا بە ئەنقەست پرچە درێژو خاوەکەی لەسەرو مل و شانی دەخشاند. هەرچەندە ئەو هەڵسوکەوتەی لە پێش

چاوی کارۆ نیشانەیەکی سەرسوڕمانی زەق بوو، کەچی ژنە بەیەک ڕستە ئەو هێمایەی لەبەر چاوی لابرد، سەرەتا ئاگرۆکێکی لەناو ئاشخانەکە دەرهێنا، دواتر لێی پرسی: گیانەکەم ئەو پووش و گیا وشکبووانەی ناو باخچەکەت دیوە؟. کارۆ هەستایەوە و لە پەنجەرەکەوە سەیری باخچەکەی کرد، وەڵامی دایەوە: بەڵێ دیومە.

ئیبتیسام سۆزی بەسەر کارۆ دا باراند و پێی گوت: حەیاتم، ئاگرێکیان تێبەردە با لە شوێنی خۆیاندا وەک من بسووتێن، کە سووتان و ئەوان -بە پێچەوانەی من- دامرکانەوە و بوونە خۆڵەمێش. (ژنە بۆ خۆی دووا: وابزانم بەردیش دەکاتە خۆڵەمێش، تەنها گڕی ئاگری هەناوی من دانامرکێنێتەوە).. ئاماژەی بە بێل وخاکەناس و دوو دەوێک کرد کە لەوێ داندرابوون: بەوانە پەیتا پەیتا و لەسەرەخۆ بیکێڵە، ئێستا تا نیوەڕۆ کە نانت خواردو تەواو حەسایەوە دەست پێبکە، خۆت زۆر هیلاک مەکە.

ئەمڕۆ و بەیانی و دوو بەیانی و چەندین ڕۆژی دیکەش هەر بەم کارە خەریک بە یەک چرکە سەیری زەوی کرد: مێینە نهێنیەکانی ناو دڵی ڕاستەوخۆ ئاشکرا ناکا، ناڕاستەوخۆ دەر دەبڕی، ئەویش پەلەی نیە کەی بە تەواوی سووتام، دامرکامەوە و بوومە خۆڵەمێش، مەسینە ئاوێکم پێدا دەکا و شوێنەواریشم ناهێڵی.. دواتر سەری بەرز کردەوە: هەر بەکێلانەکەش ناوەستین دواتر دایدەچێنین، کەداشمان چاند و هاتەبەر بە پشتیوانی خودا پێکەوە بەرەکەی دەخۆین... ئەو لەجیاتی لەگەڵ کارۆ بدوێ لەگەڵ خۆی دوا: وابزانم بۆی لە بنی کودیش بدەم هەر تێم ناگا.

(کارۆ) چووە ناو باخچەکە وەکو جوتیارێکی شارەزا لە کێڵگە و پووش و پەلاش و دارو دەوەندا سەیری هەموو لایەکی باخچەکەی کرد، مەزەندەو تێبینیەکانی لە مێشکی خۆیدا تۆمار کرد و پلانی دوو لایەنەی بۆ داڕشت - کورت مەوداو دوور مەودا: ئەگەر ڕۆژانە چوار سعات کار بکەم ئەوەندە ڕۆژەی دەوێ، بەڵام ئەگەر ڕۆژانە شەش سعات ئیش بکەم کەمتری دەوێ.. دەربارەی پلانەکەی بیری زیاتر خەستکردەوە، هەردوولای لێکدایەوە: ئەگەر چوار سعات کار بکەم بەیانیان کە دەگەمە ئێرە دوای نانخواردن یەکسەر دەست پێدەکەم و پێش نیوەڕۆ چوار سعاتەکە تەواو دەبێ، کە تەواویش بووم یەکسەر بۆ مزگەوت دەگەڕێمەوە، کەچی ئەگەر شەش حەوت سعات

کار بکـەم پێویسـتیم بەهـەردوو دانـی ڕۆژەکەیـە، واتـە دەبـێ نانـی بەیانـی و نیـوەڕۆ لـەم ماڵـەدا بخـۆم، ئـەوەش بـۆ مـن شـەرمە، ناکـرێ هەمـوو ژەمـەکان نیرەبخـۆم وخـۆم چـاو بەرەوژێـری ئـەو ژنـەی بکـەم. ڕاسـتە خواردنەکانـی بـە تـام و لەزەتـن و خۆشـی ژنێکـی تێـر ئەقـل و ئەریـاب و مەشـرەف خـۆش و چـاو تێـرە، بـەڵام هـەر جاریـک و دوو جـارە لـەوەی زیاتـر بـێ دەبمـە کاسـەلێس و بەرمایـک خـۆر.. چـاوی بـە باخچەکـەدا گێڕایـەوە، هـەر بەچـاو بسـت بـە بسـت پێـوای، مەزەنـدەی ڕەقـی و نەرمـی خاکەکەشـی کـرد: ئێـرە لەبـەر ئـەوەی بارانـی کەمـە و چەندیـن ساڵیشـە بـەکار نەهاتـووە، خاکێکـی فشـۆڵ و نەرمیـش نییـە، هـەر خـۆی پێمـەڕەو خاکەناسـەکەش وام پێدەڵێـن دیـارە ماوەیەکـی زۆرە لێـرە کەوتـوون ژەنگیـان هەڵێنـاوە. خاکـی ڕەق کاتـی زیاتـری دەوێ هـەر ڕۆژانـە چـوار سـعات کارکردنەکـەم بەسـە،با مـاوەی کێلانەکـە زیاتـر بێ..دیسـان چـاوی بەمـلاو بـەولادا گێڕاهـەردوو پێپکـی عەرەبانەکـەی لـە ژێـر ئـەو تەشـکە بەڕەیەدابینی،کـە ئیبتیسـام لـە ژێریـدا شـاردبوویەوە. دڵخۆشـی و ئارامییـەک نـاخ و ڕوخسـاریان گەشـاندەوە. ترپـە ترپـی دڵـی لەقەفـەزەی سینگیدا دامـەکنا بـە ئارامـی گوتیـە خـۆی: سـوپاس خوایـە عەرەبانەکـەم هـەر ماوە.گەڕلیـەوە ژوورەوە وبـەدەم و چـاوی ژنـەدا گرژییـەوە: بەڵێنـم پێـدای خـاوەن بەڵێنـم و دەیگەینمـە جـێ، خەمـت نەبـێ بەڵێنەکـەم دەبەمـە سـەر، بـەڵام ئەمـڕۆ تـا سـبەی، ئەمـڕۆ بەڵێنـم بـە مـەلای دایەدەبـێ مزگەوتەکـە جـوان خاوێـن بکەینـەوە، ئەگـەر نەچـم عەیبـە.

ژنـە پێـی ناخـۆش بـوو، بـەڵام بـە ناچـاری و بـە هەمـان شـێوەی پێشـتر ئەمجـارەش هەنـدێ پـارەی لـە نـاو زەمبیلەکـەی دەسـتی (کارۆ) نـاو بـە- ئەلـلا یەرعـاک وە عەلـی مەعـاک- تاکـو قەمتـەرەی دیـواری دەرەوەی حەوشـەش بەڕێـی کـرد.

## ٦

کارۆ بەهەمـان شـێوەی رۆژی پێشـتر بەیانیەکـەی گەیشـتەوە ماڵـی ئیبتیسـام، بەگـەرم و گورتـر پێشـوازی لێکـرا، بەجـۆش و خرۆشـترو بەتامتریـش ئـەو ژەمـە خواردنەشـیان نۆشـی گیانیـان کرد..بـەڵام کارۆ ئەوەنـدەی خـوارد مرپـوو، گـەدەی پرپـوو، خـۆی چەندجارێـک بەمـلاو بەولایـدا نوشـتاندەوە وخاویلکـە خەندەیەکـی بـە رووی ئیبتیسـام دا هاوێشـت: زۆرم خواردییـە دەمـەوێ خواردنەکـە بـەرەو هەمـوو دەمارەکانـم بچێتـە خـوارەوە.

_ ئای لە گیانت خۆش بێ و پێی گەورەبی...ئیبتیسام بە کارۆ ی گوت.

_ لەوەی گەورەتر بم دەبمە ئەو عووجەی باوکم دەیگۆ.

_ مەبەستم بەژنت نییە. دەمەوێ تەمەنت درێژبێ.. ئیبتیسام پێی گوت.

دوای دەمێـک گفتوگۆی خـۆش و دەمەتەقێـی بەتـام، بـە پێـی ئەو پلان و خشـتەیەی دایرشـتبوو چـووە نـاو باخچەکـەو کارەکـەی دەسـتپێکرد، ژنـەش گەرایـەوە ژوورەوە بـە بەروانکەیـەک سـینگ وزگ و بەرکۆشـی خـۆی داپۆشـت و لـە ئاشـخانەکەدا بـە چێشـتلێنان خەریـک بـوو، بـەڵام نـاوە نـاوەش پـەردەی پەنجـەرەی ئاشـخانەکەی لادەداو سـەیرێکی نـاو باخچەکـەی دەکـرد، چەندیـن جـار پـەردەی لاداو سـەیریکرد، هەرجـارەی بـە جۆرێـک دەیدیـت، بینـی پێـش ئـەوەی ئاگرەکـە دابگیرسـێنی پەپوولەوهەمـوو زیندەوەرەکانـی نـاو باخچەکـەی دەردەکـرد نـەوەک لەنـاو ئاگرەکـەدا بسـووتێن، دارو دەوەنـە بـێ کەلکەکانـی لەلایـەک گـزرە دەکـرد و ئاگـری تێبـەردەدان، سـەری سـۆندەی بـە دەسـتەوە گرتبـوو گیـاو پووشـە سـووتاوەکانی ئاوپرژێـن دەکـردو خۆلەمێشـەکەی دەمراند. بینـی شـەرواڵەکەی داکەنـدووە و بـە دەرپێیەکـی خەزنـەی سـپی شـۆڕی تەنـک وەکـو پەلیـک دێـت و دەچێـت، جـار جـارەش کـە دەکەوتـە بـەر تیشـکە زێرینەکانـی خـۆر، هەمـوو شـوێنە هەسـتیارەکانی جەسـتەی لـە ژێـر ئـەو دەرپێیـە، شێوەی ئەندازەیـی خۆیـان بـە تـەواوی بەرجەسـتە دەکـرد، کـە ئـەو شـێوە ئەندازەییـە خواییـەی بینـی، ئەویـش لـە پەنـا پەردەکـەو لـە درزی پەنجەرەکـەوە بـووە پەیکەرێکـی بـێ هەسـت و خوسـت، هەنـدێ جاریـش نەفرەتـی لـەو چەنـد پتکـە هـەورە چڵکنـە دەکـرد، کـە بـەری خـۆرە بەخشـندەکەیان دەگـرت و نەیاندەهێشـت وێنـەی هەسـتیارترین شـوێنی ژێـر دەرپێیەکـە لـە مێشـکی خـۆی بزمـار ڕیـژ بـکا. مـاوەی نێـوان پەنجـەرەو چێشـتکولێنەرەکە دوو هەنـگاو بـوو،

ئەو لە ناوەندی ئەو دوو هەنگاوەدا چەقیبوو، لینگێکی لە پێش و یەکێکی لە پاش هەردوو لای (چێشتەکەو باخچەکەی) بەڕێ دەکرد لە ماوەی نیو کاتژمێردا کفتی دڵی خۆی دامرکاندەوەو مەبەستی خۆی پێکا هەردوو دەستی پانکردنەوەو لەبەر خودا پاڕایەوە: خودایە چەند بەخشندەی، هەندێ جار بەبێ نزاو پاڕانەوە هەرخۆت لە ناو دڵی بەندەکانی خۆتی و بۆ ئەوەی بگەن بە ئامانج کار ئاسانیان بۆدەکەی.

ئیبتیسام بەمەزەندەی خۆی بەو نیو کاتژمێرە نیوەی ڕێگای هات و نەهاتی بڕی، بیری هێناو بردو لێکیدایەوە: ئەوەی من بینیم یاخوا کەس نە یبینی، بە تایبەتی ئافرەتان، ئەو خرتە سینگ پانەی بە هەر چەندی بکرم کەمە، نابێ لە دەستم دەربچێ و کڕیارێکی دیکە بیقۆزێتەوە. بیرێکی دیکەی بۆ هات: دەترسم ئەو دراوسێیانەی دەوروبەرمان بەوشێوەیەی بیبینن و ئیرەییم پێ ببەن..هەڵمی ناو مەنجەڵەکەی سەرئاگر فشاری بۆ دەرپۆشەکە هێنا ویەک دووجار بەرزو نزمی کردەوە و تەقە تەقێکی کرد، بە ئەنقەست بە دەستی ڕووت دەرپۆشەکەی لادا، پەنجەکانی کزانەوە، بە ئەنقەستیش پەنجەرەکەی کردەوە و قیژاندی، کە ئەو قیژاندی کارۆبێڵەکەی فڕێدا، بەسەری کۆت و پای پەتی و دەرپێی سپی، خۆی گەیاندە ژوورەوە ژنەش پەنجە سوورهەڵگەڕاوەکانی **خستە ناو لەپەکەی** دیکەی و زیاتر کردییە ئاخ و ئۆف: لە بیرم نەبوو **لەپکێک لە دەستم هەڵکێشم** بە دەرپۆشی مەنجەلەکەی سەرئاگر پەنجەکانم لە **تەقەلۆ هاتن**.

_کوا ماست؟ هەندێک ماستی لێبدەین ژانەکەی دەڕوا... **کارۆ ئەو بیرۆکەیەی** لە دایکی بیستبوو.بەڵام ژنە سەری خۆی بەرزکردەوە، سەرنجی کارۆی بەرەو دیواری لای ئاشخانەکە ڕاکێشا: لە ناو ئەو دەلاقە بچکۆڵەیە دەرمانی سووتان هەیە، لوولە هەتوانەکەو پێچەرو پارچە پەمۆیەکم بۆ بێنە، ئەوە لە ماستی باشترە، ناهێڵی چەرمی شوێنە سوورهەڵگەڕاوەکان ببنە برین.

کوڕە لە ناخی دڵیەوە حەزی دەکرد ئەو دەستە خڕینە پیفۆکییەو پەنجە نەرم و شلانە بخاتە ناو لەپی خۆی و لێکدی بخشێن، بەڵام شەرم نەیهێشت. ژنە چاوی لە چاوی نا، کەچی ئەو چاوی خۆی بەردایەوە.ئیبتیسام سەرزەنشتی خۆی و سەرکۆنەی ئەوی کرد: کەوتوومە دوای کڵاوی بابردوو، وا بزانم چەرمی گای بپچڕێ، پێلاوی قالتاغ بڕزێ، پەردەی شەرمی ئەو کوڕەی ئەوەندە قایمە نادڕێ.

دوو فڕە ئاوی ساردی لە دۆلکەکەی بەر دەمی خواردەوە، ناخی فێنک بووەوە، بێ ئەوەی چۆلەکەیەکیش بە بنا گوێیدا بجریوێنێ، ئاشتەواییەک لە ناخیدا گەشاندییەوە و گوپی خڕ کرد، ڕوخساری سوور هەڵگەڕا، بە کورەی گوت: مەترسە ئێستا فێری برینپێچیشت دەکەم.

_ برینپێچی !! ئەویش دەزانی؟ کارۆ بە سەرسوڕمانەوە لە ئیبتیسام ی پرسی.

_ بەڵێ دەزانم ئەگەر شوێنێکت زامدار بوو هەر خۆم تیمارت دەکەم.

کورە لێوەکانی قرمسان و بە تاکە سوپاسێکیش نەکرانەوە، ژنەش بیری جما و باز بازانێ وئەو بەر ئەو بەری پێکرد: شەش ساڵی ڕەبەق تەمەنێکی کوڵەمەرگی و دەردەسەریم بە ژن و مێردایەتی لەگەڵ پیاوەکەم بەسەر برد، هیچم لێی نەدیت دڵم پێی خۆش بێت و بیگێڕمەوە، ئەوە سێ ساڵیشە بە بێوەژنی هەر هیچ، خودایە بەگەورەیی خۆت قەرەبووی ئەو هەموو مەرگەساتیانەی رابردووم بۆ بکەیەوەو لەم چرکە ساتەدا ئەم ماڵەم بۆ بکەی بە بەهەشت، لەم بەهەشتەی تێیدا دەژیم تەنیا ئەم پیاوەم کەمە، خودایە ئەم دوعایەم بۆ خۆم نییە، بۆ ئەم کورە شەرمن و هیچ نەدیتییەیە، گمە گم و بووغە بووغی من و ئەو تێکەڵ بە یەکدی بکەی، ئەویش بەندەو هەزاری خۆتە بە مرازی بگەیەنە..

تیمارکردن و پێچانەوەی دەستی تەواو بوو، دڵۆپە فرمێسکەکانی سەرکوڵمی ئیبتیسام (کارۆ) یان کردە مقەبا، نە گیان نە زمان،نە هەست نە خوست، بێباکانە خۆی سووڕاندەوە بڕواتەوە ناو باخچەکە ملی بۆ ئیبتیسام خوارکردەوەو گوتی: دەڕۆم کارەکەم تەواو دەکەم..کەچی ئیبتیسام ڕازی نەبوو: مەڕۆ، کزە بایەکی ساردی هەڵکردووە، تۆش ماندوو بووی و ئارەقەت کردووە با لێت نەکاتە بەرهەنگ و کۆخەڕەشە، ئەوەندەی ئەم دانە ڕۆژە کردووتە بەسە، چێشتەکە کوڵاوە و ئامادەیە دانیشە برسیمانە با بیخۆین.

بەو قسەیە سەرو دڵ و مێشکی حەسایەوە، ڕوخساری گەشایەوە، پەلاماریدا -زگە هات تێبەربە- گۆشت و برنج و کفتەکانی داپەڕۆست.. ئیبتیسام خەنی خەنی لە ناخیەوە پێدەکەنی: ئای بە قوربانی ئەو لەپانەت بم، هەر خەمی زگیتی ئاگای لە بەر زگی نەمایە.

کارۆ لە ژیانی خۆی نە ئەوەندە خواردنە بە تام و چەورەی خواردبوو نە ئەوەندە زۆریشی خواردبوو، لە پێشە خۆی دەیگوت: ئەوەندە خواردنی چەورم خواردییە بوویمە بەرمیلێکی پڕ، ئەوەندە قورس بوویمە بە غلۆرکردنەوە نەبێ

ناپۆم. دوای نیو کاتژمێر زگی وەکو مانگای تازە زای، دەتگۆ گۆلکی ساوای لە بەر هەلگیرایە قۆپە قۆپی بوو، وەکو دۆی گزگزای ناو مەشکە دەهەژاو بلّقی دەدا، هەر خۆشی بەخۆی دەگوت: دەلّیی کاردییە ریخنەم خواردییە هەناوی پس پس کردیمە، دەترسم بە خۆمدا بڕیم ئابڕووم دەچی.. وەک کەلەشێرێکی باڵشۆڕ چووە سەر کارەکەی. لەبەر غارە غاری نێوان شوێنی کارو ئاودەستەکەی دەرەوە هیچ بڕیاری نەبوو، ئاودەستەکە زۆر لە ئاشخانەکە نزیک بوو، هەرچەندە لەشەرمان خۆی دەگوشی، شمشالژەنی ناو زگی شمشالّی خۆی هەر لێدەدا، خۆی زیاتر دەگوشی شمشاڵ دەبووە دووزەلەو دەنگی ناسکتر دەبوو.. ژنە هەستی پێکرد: ئای کوڕە بم، خواردنەکەم زۆر چەور کردبوو پەلەفیرکەی گرتیە. پەرداخێک ئاوو دەنکە حەبێکی زگچوونی گەیاندێ.
ڕەنگی ئاسمان وەک شەش تاک بازنە زێڕەکەی باسکی (ئیبتیسام) ی لێهاتبوو، خۆر چەند باڵێکی مابوو لە پەنا سەرتیلەی خانووەکان خۆی بشارێتەوە. بێڵ و خاکەناسەکەی لەلا پەرگەیەکی باخچەکە دانا، سەری شێرەی بۆڕی ئاوی تەنیشت باخچەکەی کردەوە، دەست و پلی تا ئانیشکی، دەم وچاوی و نیوەی سەری، قاچ و قولی تاکو سەر گۆزینگی بە جوانی شووشت، شەرواڵەکەی هەلّگرتەوەو هەردوو لنگی ئەویشی بە سەر لنگەکانی خۆی دا هێنا، کەمێک بە کزی و مەلوولییەوە چووە ژوورەوە بە ئیبتیسام ی گوت: ئەم دانە ڕۆژەش سەرە مرێکی دیکەم کرد، ئێوارە داهات دەبێ بڕۆم. ئیبتیسام لەو ڕۆیشتنەشی ڕازی نەبوو: نا مەڕۆ، بەو کزی و مەلوولییەتەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟ بڕۆ بەر ئاوێنە سەیری ڕەنگ و بۆی خۆت بکە سۆرایەتی تێدا نەمایە. دەتبەمە لای دکتۆرێک چارەت بکا.
_ نا هیچم نییە تۆزێک زگم دەیێشا، بە قلە حەبەکەی تۆ ئەویش نەما.
_چۆن نەما؟ چما زگچوون وا ئاسانە، ئەوەی ئاو بێ لە لەشی بەشەری ناهێلّی، وشکی دەکاتەوە وهەناوی دەپسێنی. ناهێلم بڕۆیەوە، ئەگەر بڕۆیەوە و زگچوونەکەشت هەر بەردەوام بیت من قوڕی کوێ بەسەری خۆمدا بکەم، هەر ئەوە ماوە بلّێن لە مالّی ئەو ژنەی ژەهر خواردی کراوە، دەیان بەیت و بالۆرەم بۆ هەلّدەبەستن..کارۆ بە هەندی وەرنەگرت: نە بابە وا گەورەی مەکە، زگی من فێرە چەندین جار وام لێهاتووە و چاکیش بوویمەوە، تۆش هەندە بیری لێمەکەوە.

کە گەیشتەوە مزگەوت بەر لەوەی بچێتە ژوورەکەی خۆی سەری بە حوجرەکەی مەلای داگرت. مەلا وەکو هەموو مەلاکانی دی لە کاتی حەسانەوە کەوا و سەلتەی بەلاوە نا بوو، بە کراس و دەرپێیەکی شحادەی سپی لە سەر گازەرەی پشتێ پاڵکەوتبوو. کارۆ شەرمی کرد پاشەو پاش بۆ دواوە گەڕایەوە. ئە و بە ئاگا بوو بانگی کرد: وەرە برادانیشە، شەرمی مەکە خۆ ڕووت نیم..کە دانیشت ویستی سەرنج و خۆشەویستی مەلای بۆ خۆی رابکێشێ:ماموەستا، مزگەوتەکە پیسە هەر ئێستا خۆم دەیشۆم و دەیکەمە گوڵ.
مەلا زەردەیەکی بۆ کرد: ئێستا کاتی ئەوە نییە لێیگەڕێ، برسیمانە با نانێکی سووک بخۆین (حەجییە فەتحییە)ی بەرامبەرمان جامە ماستیکی مەڕی بە سەرتووی خۆی بۆ هێناوم، لەو ماڵانەی بەرامبەر مزگەوتیش، ماڵێک خوا خێری بنووسی، پێش نیوەڕۆ نووردییە نا نێکی گەرمی فرنی بۆ ناردووم، چایەکیش لێدەنێین، نان و ماست و چایە خواردنێکی سووکە بۆ ئێواران با شە. کارۆ ناوە ناوە سەیری مەلای دەکرد، مەلاش بێ باکانە هەر مرچ مرچ نانی دەخوارد. ئەو مەبەستی بوو مزگەوتەکە بشوا، بەرگەی ئەو بێدەنگییەی نەگرت،خۆی پێنەگیرا: ماموەستا بۆ بێدە نگی؟ کارۆ لە مەلای پرسی. مەلا وەڵامی دایەوە: بێدەنگی لە سەر نانخواردن سوننەتە.
هەتا مر بوون نان و ماست و چایان خوارد، کە تەواویش بوون مەلا لەسەر گازەرەی پشتێ ڕاکشا و تیرێکی ئاراستەی کارۆ کرد:مەترسە ناخەوم، تۆش هەر لە شوێنەکەی خۆت تۆزێ ڕاکشێ، دوای خواردن کەمێک بێدەنگی و حەسانەوە پێویستە.. ئەو شەرمی کرد وەکو مەلای پاڵبکەوی، پالگەیەک لە نزیکیەوە بوو بۆ لای خۆی ڕایکێشا و ئانیشکی بەسەریدا چەقاندو بێدەنگ بوو.
کارۆ بەو نان و ما ست وچایەی خواردبووی کەمێک زگی پنج ببوو، بەڵام مانگا سۆرەی ناوزگی جارجارە هەردەیقۆڕاند.چاوە سیسبووەکانیشی زەنگی ئاگادارکردنەوەیان لێدەدا، پەردەی پێڵوەکانی بەین نا بەین پەنجەرەی قۆرتی چاویان دادەپۆشی و لە پڕ دەکرانەوە. هەردوولا کارێژە لەبار یەکچووەکانیشی واندەزانی دوو پەنجەی ئەستوورو درێژ وەکو دوو دەوی پلایز ڕاست و چەپیان پێدەکا، ناچار بەبێ دەنگی لە حوجرەی مەلا بۆ ئاودەستەکان و لەوێشەوە بۆ ژوورەکەی خۆی خشی. هەرکە لە ناو جێگاکەی ڕاکشا دەستێکی بە ورگە فوودراوەکەی خۆیداهێنا، باویشکێکی تەمبەڵ پرزەی لێبڕی.

# ٧

بەیانی زوو لە خەو ڕا بوو،هەر زووش هەمان پەیتوون گەیاندییەوەماڵی ئیبتیسام، دیسان بە هەمان ئەتەکێتی خۆڕازاندنەوەو نازو فیزی زیاتر پێشوازی لێکرا، لەسەر هەمان کورسی و مێزی پێشتریش خۆشترین و بە تامترین خواردنیان خوارد. کارۆ وەک پشیلەیەکی ماڵی بێ شەرم چەپۆکی بەناو خواردنەکاندا دەگێڕا، وەک کارە مێشکەی ناو قەرسیلان بەبێ شەرم ئەوەی لەسەر مێزەکە بوودەستی پێدا هێنا لێستیەوە، کەچی شەرمی دەکرد بە زمانە زبرەکەی تەنها بە یەک وشە دڵی ئیبتیسام بلێسێتەوە..

(ئیبتیسام)یش لە ڕوخساریدا ڕایەخێکی سەوزی بەهاری شەپۆڵی دەدایەوەو لە قوڵایی چاوە جوانەکانیدا وێناکەی دەدرەوشایەوە، هەستی ئومێدی و نائومێدی لە دەروونیدا تێکەڵ دەبوون. هەندێ جار چاوەکانی پێدەکەنین، هەندێ جاریش فرمێسکی بەردیان دەباراند. بە خۆی نەوەستا کردییە نێچیری چاوەکانی، تێکەڵییەک لە سۆزو ترس و دڵەڕاوکێ و خۆبەزلزانی و ئارەزووی خۆبەدەستەوەدان و بەرگری،لە ناو دوو پەرداخی جوانی هەردوو چاوەکانیدا تواوبوونەوەو لە ژێرچەتری برژا نگەکانیدا سەمایان دەکرد، ئەو گوزارشتانەی لە چاوەکانیدا سەمایاندەکرد چەند قامچییەکی ئەوتۆ بوون لە تەوقی سەری تاکو بنی پێیان دەتەزاند. دەروونی وەک بنی دەریاچەیەکی روونی ئارام بە ئاشکرا دیاربوو، نیگاکانی ئەوەندە ڕوون بوون وەکو ئەوەی لە ناو ژوورێکی شووشەبەند دابن، لە میانەی هەردوو گلێنە بریسکەدارییەکانیدا، کەوەکو کونی دەرگا بوون،هەموو جۆرە ئارەزووەکانی دەخوێندرانەوە، کەچی بەرامبەرەکەی تەنها پیتێکیشی لە ئەبجەدییەتی خۆشەویستی ئەزبەر نەکردبوو. لە قاوقاوانێی دەزانی،بەڵام شارەزای چاوچاوانێ نەبوو، لە هەچە هەچە و هڕە هڕە و یخە یخەدا پسپۆڕ بوو، بەڵام لە ناو گوڵزاری وشە ناسکەکاندا نەیدەزانی کام گوڵ هەڵبژێری. ئەو دڵی نەبوو، خڕکە بەردێکی لە ناو قەفەزەی سینگیدا دانا بوو، جەستەیەکی ساردو سڕو تەرمێکی مۆمیاکراو بوو. سەرەڕای ئەوەش، ئیبتیسام لەسەرکەوتنی بۆ سەر ئەو هەورازە کەرتڕێنەدا بێزار نەدەبوو، ئەو دڵێکی پڕ خۆشەویستی هەبوو، ئەو دەیگوت: لای من ئەو پیاوەی توندو خۆگرو ڕەقە، زۆر لەو پیاوە سەرنجڕاکێشترە کە نەرم و نیان ولەوچە و ترسنۆکە، نەرم و نیانی بۆ ئافرەتە نەک بۆ پیاو. ئەو دەم و چاوی بە هەردوو ناولەپی شاردەوە، زەنگیانەکانی هەردوو چاوی بە ڕستە ڕژانە ناو لەپەکانی و خەناوکەیەکی باق و بریقیان دروستکرد. ئەو دەنکە زەنگیانەبریقەدارانەش نەیانتوانی ببنە بەربەست لەبەر دەم

ئەو ترپە بەهێزەی دڵی،کەبە هەموو جەستەیدا دەگەڕا، ئەو ترپەیە ڕایهەژاند،خوێنی دەمارەکانی جولاند، ڕایتەکاند،کوڵاندی و بزواندی. ویستی نامەیەکی خۆشەویستی لە دڵی خۆیدا بنووسی، لە ناو فەرهەنگەکانی خۆشەویستیدا بە دوای چەند وشەیەکدا گەڕا هەستەکانی پێ دەربڕی. هەر چەندە ئەو وشانەشی دۆزییەوە،بەڵام نامەکەی نەنارد، هەردوو لێوی جولاند، بەڵام هیچی نەگوت. وەک مێینەیەک شەرمی بە خۆی بوو یەکەم هەنگاو هی ئەو بێت. کە نامەکەی نە نارد خۆی دوا ند: هیچ شتێک لەوە تاڵتر نییە، من دەستپێشخەر بم و ئەویش ڕەتم بکاتەوە. تۆزێکی دی داماو زیاتر خۆی دواند: بێوەژنێکی بێ بەری لەکاروان بەجێماو کێ ڕازییە بیکاتە هاوسەری خۆی، ئەگەرچی لە ناو بەرەبابی ئێمەدا بێوەژن بۆ مەبەستی هاوسەرگیری پێگەیەکی تایبەتی هەیە، بەڵام لەلای ئەوان بۆ هەمان مەبەست پەسند نییە.
دووسێ جار لە سەر کورسییەکەی هەستاودانیشتەوە. قاچەکانی هێزی ڕاکێشانی ئەو پەیکەرە ئیسقانەیان نەمابوو کەبە چینێکی ناسک بە گۆشت و بەز داپۆشرا بوو. بەرە بەرە تیشکە بنەوشەییەکانی هەردوو چاوی لەناو تەمێکی چڕ نقوم دەبوون و دەخنکان. ژنە پێی وا بوو: کارۆ لە دوورەوە دەهات و دەگرژییەوەو لێی نزیک دەبووەوە، گەیشتە تەنیشتی و شانیان بە شانی یەکدییەوە نوساند، دەستە خڕپنەکەی خستە نێوان هەردوو لەپەکانی، وەک مێینەیەک یەکەمجار پلی بە پەلاپیتکەی تفەنگی بەرگریکردنەکەیدا هێنا، چرووکی کرد. هەرچەندە باقەنەزمەی تفەنگەکەی دەهێناو دەبردو گوللەی دەبردە بەر لوولەی و دەستی پێدا دەهێنا،هەر چرووکی دەکرد. ناچار لوولەی تفەنگەکەی شۆڕکردەوە، باوەشیان بۆ یەکدی کردەوە، وەکو لاولاوەو دارئەسپیندار ئاوێزانی یەکدی بوون، سەری بە دەندەکانی سینگیەوە نا، ڕنگەڕنگی دڵی پەردەی گوێی لەراندەوە، لە لەرە لەری پەردەی گوێی مێشکی بەئاگاهات و ئەویش لەریەوە، مێشکیش هەموو هەستە دەمارەکانی لەراندەوە، ئەوانیش دڵیان لەراندەوە، دڵیش بە تەتەری خوێن نامەی چێژوخۆشی گەیاندە هەموو شارو شارۆچکەو گوندە دوورەدەستەکانی وڵاتی جەستە نەرم و شلەکەی، جەستەش بووە بەردەستێ، بەردەستێش بە دەنکە پووشێکی ماچێکی (کارۆ)ی گڵپەی ئاگرێکی گەشی لێهەڵدەستا، ئاگر لە ئاگری دادەگیرسا، جەستەیەکی خاوخاو دەکەوتە ناو ڕەشماڵی جەستەیەکی ئەستوندەدار، هەرچەندە ڕەشەبایەک دەیلەراندەوە ئەو دەستی بە ئەستوندەی بتەوی بەژنی (کارۆ)وە گرتبوو بەری نەدەدا. یەکێکیان دەبووە ناودۆک ئەوی دی مەشکە،دەیهەژاندو چەوری پێدەگرت. ئەویان دەبووە هەپک وئەوی دیش داری تەون هەرچەند دەیکوتا زیاتر توند دەبوو.

که پەنجەکانی بە ناو پرچیدا دەگێرا دەبووە جەستەیەکی خامۆش، کە لێوی بە لێویەوە دەنا کانییە کۆربووەکەی دەوی سەر لە نوێ دەزایەوە، کە دەستی بۆ هەر سێوو بەهێیەکی باخچەی سینگی دەبرد گەردەلوولێک داری بەژنی دەهەژاند، کە چەند داوە پرچێکی یاخیبووی لەسەر چاوەکانی لادەدا و ڕوخساری ماچباران دەکرد، موچڕکی کارەبایی بە سینگ و بەرۆکیدا شۆڕدەبووەوە. ئەندێشەیەکی ئەوەندە بەزەیی و پشوودرێژ بوو لێگەڕا سەری لەسەر سینگە پانەکەی تێر بحەسێتەوە.
دەنگێکی باریکی خنکاو جارێک دووجار سێ جار بەرزدەبووەوە، تا دەهات زیاتر بەرز دەبووەوە، ئەو دەنگە کزۆڵەیە ئەندێشەکەی لێکردە هەڵم. خۆشی و شادی لە ناو دەریای خەم و خەفەتدا توانەوەو بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە، بەڵام بێ ئەوەی بەستەڵەکی ئاسمان چڕیان بکاتەوەو ببنەوە باران بە ڕەوتێکی پێچەوانە- هەر چەندە هەڵم بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا، ئەو لە بەهەشتی ئاسمان توورڕەدرا. موچڕکێک بە لەشیدا ڕۆیشت، کانی چاوەکانی تەقینەوە، کونە لوت و قورتمیان پڕکرد، بواری تێپەڕبوونی ئەو ئاخەیان نەدەدا کەلە ناخی ناخیەوە جێی پێ جێ نەبوو. دەنگە باریکەکە تەقە تەق و شەقە شەقی دەرگای دەرەوە بوو. وەک مارانگەستییەک دەرپەڕی، دوو سێ جار بە دەوری خۆیدا سوورڕا، دەرگای دەرەوەی کردەوە، پیاوێکی درێژی ڕەنگ زەرد، هەردوو چاوی دەبریقانەوە، خەندەیەکی زەردیشی بەسەر لێوەکانی داهات و هەردوو دەستی بۆ پانکردەوە، کەچی ئەو (ژنە)پێی وا بوو لێوەکانی ژەهر دەڕژێنن نەک خەندە، ڕق و کینەیەکی لە ڕادە بەدەر وەک قامچی جەستەیان شین و مۆر کرد، مەزدا هێوری کردەوە. چەند عانەو درهەمی بۆ هێناو بە لالووتی بەڕێی کرد.
خەم بەسەر خەمدا دەباری، بەربەستی شەرم لافاوی خۆشەویستی دابڕ دابڕ دەکرد و نەیدەهێشت بە ڕووباری جەستەی هەردووکیاندا ڕاستەڕێ بڕوا. هەناسەکان (ئاخ) یان دەباراند، ئاخەکان ئەوەندە گەرم بوون یەکدییان دەسووتاند، لە دەنکە خەلووزە سووتاوەکانی (ئاخ) ڕستەیەک (داخ)هەناوی هەریەکەیانی داخدەکرد.
ئەو سەردەمی پیاوسالاری باو بوو، مۆدیلی سمێل با بڕو قۆل فشکەرەوان بوو، زۆرجار کە هەردووکیان پێکەوە دادەنیشتن مەلا بە کارۆی دەگوت: بەغدا گوندێک نییە خەڵکەکەی هەموویان یەکدی بناسن،سەدان گوندی جیاجیا لەم شارە جەنجاڵەدا بارو بارگەیان داکوتاوە. بەغدا شارە مێرووولەیە، شارە زەرگەتە و زەنگەسۆرەیە، شارە هەنگیشە و شەڵخەی هەنگوینی لێیە. شوێنی هەزاران کچە پاکیزەی وای لێیە، ئەگەر دەستت بۆ هەر یەکێکیان ببەی لێت دەبێتە مارو پێتوەدەدا.

لەو شارەی بەمجۆرە، ئیبتیسام پێویستی بە یەکێک بوو خەسلەتەکانی (کارۆ)ی تێدا بێ. لای ئەو گرنگ نەبوو ئەو کەسە سەر بە چ هۆزو تیرە و نەتەوەیەکە، هەژارە یان دەوڵەمەند، کوڕی کێیەو لە چ بنەماڵەیەکە، ئەو لەوشارەدا بێ باوک و براو بێ هاوسەر بوو، گەرەکی بوو پیاوێک لە دزو جەردەو داوێن پیسان بیپارێزێ.
تیشکی خۆر هەندەی نەمابوو بۆ سەر تەپڵی سەری کارۆ ستوونی بێتە خوارەوەو گۆشەیەکی وەستاوی نەوەد پلەیی دروست بکا، ئەو دەیویست پێش نیوەڕۆ بگاتەوە مزگەوت، بەچەند هەنگاوێکی خێرا خۆی گەیاندەوە ژوورەوە، بە پێکەنینەوە ئیبتیسام ی دوواند: حەزم دەکرد هەتا ئێوارە کارم بکردبوایەو نیوەڕۆش لێرە نانەکەم بخواردبوایە، بەڵام دەبێ بمبووری. بەو قسەیەی سەرو دڵی ئیبتیسام ی تێکدا: نەدەتبوورم و نەهیچ، نانەکەی پێکەوە دەخۆین دواتریش کەیفی خۆتە. کارۆ بە شەرمەوە: خێرەمەندێکی نزیک مزگەوت گایەکی کردۆتە خێر، من و مەلاشی داوەت کردووە ئەگەر نەچم مەلا لێم توورە دەبی.
ئیبتیسام ڕووی خۆی بەلایەکیدا وەرگێڕا وگرژی کرد، خۆی دواند: هەموو ڕۆژێ مەلا ئیشی پێیە، دەترسم نوشتەی لێکردبی و دەوی بەستابی، مەلایە هەموو شتێکی لە دەست دێ.. بەڵام بە تیچاوی تیرێکی ئەفسوناوی لە کارۆ گرت و پێی گوت: گیانە من لەبەر خاتری تۆمە، ئەوەندە جرت و فرت و هاتوچۆ بکەی شەرفرۆش و ڕێگرەکان دەتبینن ودەتناسنەوە، تۆ چاکەیەکی گەورەت لەگەڵ مندا کردووە با لە ناوچەوانی من تووشی کەتنەکی نەبی.
کارۆ فشەی پێهات: مەترسە سەری تۆ سەلامەت بی من هیچم بە سەر نایێ.
ژنە ئامرازی ترساندنی بە کارهێنا: هەی خانەخراپ بۆ هەندە بە پیر مەرگەوە دەچیت دیارە خۆت بە زیاد دەزانی-یاخوا شەیتان کەڕ بێ وگوێی لەم قسەیەی من نەبێ- خوا نەخواستە ئەگەر تۆ لە ناوچەوانی من بەلایەکت بە سەردا بێت من شێت دەبم.
ترساندن کاری لە کارۆ نەدەکرد: نە بترسە و نە شێتیش بە، من ناترسم و هیچیشم بەسەر نایێ. ئیبتیسام بە توورەییەوە پێی گوت: چاک دەزانم ئەو مەلایە ترزەمبۆیە تیختیخەی دای لێرە نەبی، هەی خۆرکی لێکەوێ،چما ئەو خوێنگری تۆیە. دواتر هەرخۆی هێور بووەوە:دە باشە با ئەمڕۆ مەلا بچی گۆشتی ئەو گایەی بخوا، هەی بە زرفنجی بی، تۆش لە گەڵیدا برۆ تۆشی گیانت بی، بەس گیانە نەکەی زۆری بخۆی، بەخۆت ناسکی و گۆشت گا ش زۆرچەورە پێی دەفیرکێنی.

# ٨

كە گەیشتەوە مزگەوت سەری بە حوجرەکەی (مەلا)ی داگرت، سفرەیەکی پلاوو گۆشت ودووسێ جۆر شلەی بامیەو قەیسی و-ئەوەی دڵ حەزی لێدەکا- داندرا بوو. بۆن و بەرامی خواردنەکە ئاوی چاوو دەویان تێکەڵ کرد، سەری سورما، حوجرەی مەلای و ماڵی (ئیبتیسام)ی بە یەکدی چواند: تەنها مێزو کورسی کەمە، ئەو هەموو خواردنە بە تامە لە کوێ هات..

هەر لە دەرەوە بای خۆی و مەلا ی ئاوی لە کتلی ئاوێ و چایەپەستی چای کرد، پەنگرە ڕەژووەکانی ناو ئاتەشچەرخانەکەی گەشاندەوەو هەردووکیانی خستە سەر پەنگرە گەشاوەکان.

مەلا لە ژوورەوەڕا بانگی کردێ: وەرە شیوەکەمان سارد دەبێتەوە جارێ چ پەلەی چایەتە.

لە بەرامبەر مەلای دانیشت، بەر لەوەی دەست بە خواردن بکات پرسی: ماموەستا کێ ئەم هەموو خواردنە خۆشەی بۆ هێناوین !!؟.

_لە کوێ هات و کێ هێنای مەپرسە، ئێمە مانان هەندمان ڕاتبە ڕەحمەتتان لێبێ کردووە پەردەی شەرممان دڕاوە.

کارۆ بای خۆی مەرایی و ماستاوچیاتی دەزانی: توخوا ماموەستا وامەڵێ،ئێوە تاجی سەری ئێمەن، دەست و پێی وەکو ئێمە ئەگەر سەری گەورەی ئێوە نەبێ بەکەلک هیچ نایەین.

مەلاش تێیگەیشت: تۆش وا مەڵێ،ئەگەر ئێوەش نەبن، دەست و پێ سپی وەکو ئێمە لە برسان دەمرین، هەر سەیری ئەم خواردنەی پێشە خۆت بکە، ئەگەر ماڵی ئەو دراوسێیەی بەرامبەرمان نەبوایە، ئێستا قۆڕەی زگمان دەهات.

تێرو پڕبوون سوپاسی خوایان کرد. کارۆ هەستایەوە بەرەو لای چایەکە بڕوات، مەلا بە قسەیەکی نەرم ڕایگرت: برا، گوتم ئەم خواردنە هی ماڵی دراوسێیەکمانە دەبا بۆت بگێڕمەوە، دەستنوێژم شوشت و پێشنوێژیم بۆ خەڵکەکەش کرد تۆ هەر نەهاتبیەوە، کوڕی خاوەنی داوەتەکە کوڕێکی بچکۆلەی ژیکەلەیە، هەتیوە و باوکی کۆچی دوایی کردووە، دایکی ئافرەتێکی میهرەبانە، خواپێیداوەو بە ماڵی دنیایێ خێرۆمەندە، ئەو کوڕە داوای لێکردم

بۆ نانخواردن بچمە ماڵی ئەوان، بەڵام من تێمگەیاند هاوڕێیەکەم دواکەوتووە پێویستە چاوەڕێی بکەم،ناچار ڕۆیشت دوای نیو کاتژمێر ئافرەتەکە بەخۆی و بەکوڕەبچکۆلەکەی، لەسەر مەجمەیەکی گەورە ئەم هەموو خواردنەیان بۆ هێنام، ئەم هەموو خواردنەش هات تۆ هەر دیار نەبووی دڵم بووە کوچکە بەرد، خەفەت کردمیە گلۆڵە ولەم ڕێڕەوە غلۆری دەکردمەوە، هەر دەمگوت دەبی ئەو پیاوە چی بەسەر هاتبێ.

کارۆ بە درێژی و بە پانی هەردووکی لە یەکدی دروی و پێوانی،بیری کردەوە: بێوەژنێکی تەڕو لووسە، پێدەچێ مەلای خستبێتە ناو داوی خۆی. بۆ نا؟ ماڵ و سامانێکی زۆریشی هەیە. لە هەمان کاتدا قسەیەکی باوی خودی مەلاکان وای کرد پرسیارێک بەناو مێشکیدا بگەڕێ، بە ناچاری وروژاندی: ماموەستا خواردنی ماڵی هەتیوان حەرام نییە !؟. پرسیارەکە مەلای شۆک کرد، کەچی وەڵامی دایەوە: تازە هێنایان و ڕۆیشت خۆ نایگێڕمەوە، دڵ لە دڵ مەدە و مەترسە من قەرەبویان بۆ دەکەمەوە، قسەیەک هەیە دەڵێ- خورماکە بخۆ و لە ناوکەکەی مەپرسە..مەلا بەرامبەر ئافرەتان لە دوو لاوە هەستیار بوو، لەلایەک وەک مەلا حەزی نەدەکرد، واتە واتێکی لەو جۆرەی پێوە بنووسێ، لەلایەکی دیکەش برینداری عەشقێک بوویە نائومێدی و مەرگەساتی کۆتایی هاتبوو، بۆیە خاڵێکی بە کلکی بابەتەکەوە نا و بەو پرسیارەی لە کارۆی کرد براندییەوە، یان کۆتایی پێهێنا: ئێستا کڕی هاتووە هۆکاری دواکەوتنەکەتم بۆ باس بکەی، بەس دیق و سیقم پێ مەکە بە تەواوی بڕۆ ناو بابەتەکەو لە کورتی ببیڕێنەوە.

کارۆ گێڕایەوە بەڵام هەندێ گەندە مووی هێشتەوە: ئەمڕۆ زۆر ماندوو بووم، بەڵێنیشم بەتۆ دابوو بۆ نوێژی نیوەڕۆ بگەمەوە مزگەوت و نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین، بە پەلە پەیتوونێکم بەکرێگرت، سەد خۆزگە نەمگرتبوایە. کابرای لێخوڕ ئەوەندە ڕێیەی لێکردمە ڕێی هات و نەهاتێ، هەر سی چل شەقاوێک دەڕۆیشت و ڕا یدەگرت. عەیبە عەیبە چوار میخەی گرتبووم، ئەگەرنا دووسێ چەپەڕۆکم دەخێواندە سەرو سەکوتی لەبۆ بابیشی تەمبێم دەکرد..کارۆ پڕی زگی قسە بوو کەف و کوڵی بەوەندە دانەدەمرکایەوە،بەڵام مەلا شێوازی گێڕانەوەکەی بەدڵ نەبوو قسەکانی پێ بڕی: ئەو هەموو ناوو ناتۆرە و پەلارو فیشەک بە تاریکی نانەوەت لە پای چی؟هەر لەبەر

ئـەوەی کابـرا لـەو شـارە جەنجاڵـەدا بـە کاوەخـۆ لێـی دەخوڕی؟ئـەوەی تـۆ دەیکـەی یەکێکـە لـەو گوناهـە گەورانـەی خـودا لێـت خـۆش نابـێ تاکو گەردنـی خۆتـی پـێ ئـازاد نەکـەی.
لـە بەرامبـەر ئـەوەی کارۆ ژەهرێکـی زۆری بەسـەر لێخوڕەکەدارشـت، مـەلا ویسـتی بـە تونـدی سەرزەنشـتی بـکا: تـۆش چونکـە خویندەواریـت نییـە، لایەنـی رۆشـنبیریت کـزو لاوازە و زانیـاری گشـتیت زۆر کەمـە، پەردەیەکـی ئەستووربەسـەر چاوەکانتـدا هاتـووە سـپی و رەشـی لێکـدی جیـا ناکەیتـەوە، جـاری وا هەیـە ڕەنگـە سـپیەکانیش بـە ڕەشـی دەبینـی.
ئـەو چەنـد ڕسـتەیەی دوایـی وەکـو کلکـی چزەپیلـە تیـژ بـوون، بـە دڵـی (کارۆ)یـان وەدا و چزاندیانـەوە، لەگـەڵ خـۆی دووا: قسـەکانی مـەلای وەکـو پلـی خاڵـم راسـتن. خاڵـم لـە کەلایانـێ هەمیشـە براوە بـوو کـە پلـی لـە سـەر کەلایدادەنـا و نیشـانەی لـە تیـری بەرامبەرەکـەی دەگـرت جاربێـری نەدەکـرد یەکسـەر دەیپێـکا، مـەلا شـەکر لـە لێوەکانـی دەبـاری، ڕاسـتە پـەردەی ڕەش چـاوی کـوێرە کردیمـە و سـپی و ڕەشیشـم لـێ تێکەڵبـووە، دەبـێ ئـەو پـەردە ڕەشـەی لاببـەم. دەبـێ خـۆم فێـرە خوێنـدەواری بکـەم، نابـێ وەکـو بابـم کۆلەواربـم، مەکتـەب لـە گوندەکەمانـدا هەبـوو، مـەلای گونـدی لـە بـن گوێـی باوکمی دەخوێند،تیـخ تیخـەی دەداو پێـی دەگـوت: منداڵەکانـت مەکـە مەکتەبلـی فێـری دەرسـی شـەیتانی دەبـن، ئەویـش بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی بـوو، ئەگـەر هەمـوو منداڵـەکان بچوبوونایـە مەکتەبـێ مـەلا دەسـتی لـە بـن هەمبانـەی بـە تـاڵ دەمایەوە،هەتائەگـەر دژوونیـش بوایـە کـەس نەدەمـا دوو قالبـە سـابوونی بداتـێ، هـەر بەیـن نـا بەیـن بـە فەقێیەکانـی دەگـوت- ئیهدینـا، دوو قالبـە سـابوونان بینـە، مامۆسـتا دژوونـە.
ئـەو هوڕێنانـە بوونـە تەمێکـی ئەسـتوور بـەری چاویـان گـرت، لەنـاو گێژەلووکـەی ئـەو یادەوەرییانـەدا بـە باڵـە فرکـێ خـۆی گەیانـدە گوندەکـەی خۆیـان: بابـم لـە کێشـان و پێوانـی ئاغاکانیشـدا دادپەروەرانـە نەبـوو، هەمـوو ئاغاکانـی بـە کێشـی ئاغاکـەی خۆمـان دەکێشـا. ڕاسـتە ئاغاکـەی ئێمـە سـتەمکار بـوو، گـۆردەو چەلاوخۆرەکانـی بەنـاو گونـدی وەردەکـردن و خەڵکیـان دەچەوسـاندەوە، بـەڵام پیـاوی باشـیش لـە ناویانـدا هەبـوو.. کارۆ ڕووی بـۆ لای مـەلا وەرگێـڕا و بـۆی باسـکرد: بابـم وەکـو قەلـێ هـەر دەیقیڕانـد و کاولـی دەکـرد، گوێـی دەگرتیـن و

پێی دەگوتین: لەو ئاخۆران و باخۆرانەدا ئەگەر دەستبارێکم لەگەڵدا نەگرن لە برسان دەمرین. ئەو هەر ساڵانی گرانی دەهێنایەوە بیرمان و دەیگۆ- بە هەزاران کەس لە برسان مردن و گۆڕیشیان بە نسیب نەبوو.
کە باسی گرانی کرا، مەلا خۆی پێ نەگیرا، ئەویش خۆی تێهەڵقورتاند و بە کارۆ ی گوت: ئەگەر جەندرمەی تورکان نەبوونایە ئەو گرانییە ڕووی نەدەدا، ئەوان وەکو ئوتومبێلی گێڕ تێکچوو تەنها بەگی دواوەیان مابوو پاشە و پاش دەکشانەوە، بە دەرپێی خۆیان ڕانەدەگەیشتن و ڕایان دەکرد.
لە کشانەوە و پاشە و پاش گەڕانەوەیاندا، هەرچی ئارد و دانەوێڵەی ناو عەمبار و کەندووان هەبوو دەیان برد، هەتا هەویری ناو تەشتانیان دەبرد، نانی سەر سێڕانیان دەبرد، ئالیک و ئالفی مەڕو ماڵات و وڵاغانیان دەبرد، پارووە نانی دەوی منداڵانیان دەبرد، پارە شاردراوەکانی ناو سندووق و باولانیان دەبرد، چیلچیلە نەرمەی گوێی ژنانیان دەپچڕاند و گوارەکانیان دەبرد، لووتیان دەپچڕاندن و لووتەوانەکانیان دەردەکێشا و دەیان بردن، لە ڕاکێش ڕاکێشی ئەنگوستیلەی دەستیان هەموو گەیەکانی پەنجەیان لە بار یەک دەبردن.برا، ئەوانە عەزیا بوون عەزیا، بە ترس و تۆقاندن دنیایان داگیر کرد بوو، بەڵام کە ڕۆژی فەنا بوونیان هات، زەواڵێک هات و قەف قەفی پساندن.

## ٩

بۆ ئەوەی حەزو ئارەزووی کارۆ بەلای خوێندنەوەدا ببا. مەلا بە خەندەیەک سەرنجی ڕاکێشا: من ئەو ماوەیە کتێبێکی زۆرخۆش دەخوێنمەوە، کتێبەکە ناوی (ڕشتەی مرواری)یە،نووسەرەکەی وەک من مەلایە بەدیاری بۆی ناردووم، پڕی نوکتەی خۆش خۆشە، ماڵی ڕابواردنە، تۆش هەر بڵێ ئەو نانەم بەو نۆشاوەی. کارۆ بە خەمبارییەوە سەیری کتێبخانەکەی کرد، بە مەلای گوت: خۆزگەم بە خۆت..مەلا کتێبخانەکەی بەش بەش کردبوو. ئایینی، کۆمەلایەتی، مێژوویی، ئەدەبی و هی دیکە. هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامەشی بەجیا دانابوو. لە ناویاندا کتێبێکی دەرهێنا: ئەم کتێبە بۆ ئەو زۆر باشە، بەو جۆرە فشقیاتانە حەزی بەلای خوێندنەوە دەبەم: حەز دەکەی چەند خەتێکت بۆ بخوێنمەوە؟ بەکارۆی گوت.

_ بەڵێ زۆر حەزدەکەم،دەڵێن-کوێرە چیت دەوێ دەڵێ دوو چاوی ساغ- بەڵام من خۆزگە چاوێکم نەبوایەخوێندەواریم هەبوایە.. کارۆ بەو جۆرە وەڵامی مەلای دایەوە.

مەلا دەیویست بە دەستەسڕی نوکتەکانی زوخاوی هەناوی خۆی و کارۆی بسڕێتەوە، بۆیە پەڕ بە پەڕی کتێبەکەی ئاودیو کرد، تاکو لە لاپەڕەیەک سەنگرایەوە و نوکتەیەکی زۆر گەپاوی هەڵبژارد خوێندیەوە: ها چۆن بوو؟.. وەک ئەوەی بە دوو کەسان هەریەکەو لەلایەک قدیلانەی بکەنەوە،ئەوەندە بەکوڵ دابوویە قاقای پێکەنین کەوتبووە سەر پشتێ پەلەواژ ببووەوە و نەیدەتوانی وەڵامی مەلای بداتەوە. مەلاش باوگۆی دەدایەوەو بەهەمان قاقاهانی دەدا: پێبکەنە بەکەیفی خۆت، خۆش بوو وانییە؟

ئاوی سوێری چاوی و لینجاوی لووتی کارۆ ی لە خۆشییان تێکەڵ ببوون، بەسەر دەستی کراسەکەی سرییەوە و وەڵامی مەلا ی دایەوە: بەڵێ زۆر خۆش بوو،بەڵام ئەگەر خۆم بمخوێندبوایەوە زۆر خۆشتریش دەبوو.

مەلا هەستیکرد مرۆچەیەکی بەرامبەر بە خوێندن گرت، تێیگەیشت زەرگەتەی حەزو ئارەزووەکانی چۆن دەوروژێندرێ، بۆ ئەوەی پەرۆشی بۆ خوێندن زیاتر بێت، بەڵێنی پێدا: هەر ئەمڕۆ فێرە خوێندەواریت دەکەم.

مەلا چەند لاپەڕەیەک کاغەزی خەت خەتی هێنا، هەر (٢٨) پیتەکانی

زمانی عارەبی تێدا نووسی، بە دەست و بە سەری بانگی کرد: وەرە دانیشە، هەر ڕۆژەی چەند پیتێکت فێر دەکەم، دواتریش دەتکەمە فەقێی خۆم و بەتەواوی فێری خوێندەواری مەلایەتیت دەکەم.
کارۆ سەیری جوبەکەی مەلای کرد بە سنگولکەیەکی دیوارەوە هەڵواسرابوو: ئەو جوبەیەش لەبەر دەکەم؟
_ ئا، بۆ لەبەری ناکەی، چیت لە عالەمێ کەمترە؟
_ تۆیف لەو مەلایە قۆزەی !!!.. کارۆ هەر خۆی بە خۆی گوت.
_ بڕۆ چایەکەی بێنە با کە مێک سەرو کەللەمان هێور بکەینەوە..مەلا بە کارۆ ی گوت.
کە هەستایەوە کارۆ لە پێشە خۆی ورتاندی: لەبەر ئەم کتێبە خۆشە چایەکەم لەبیر چوو، ئێستا ئەوەندە تاڵبووە بوویتە ژەقنە بووت. کە چووە دەرەوەو سەیری ژیلەمۆی ئاگردانەکەی کرد، ببووە خۆڵەمێشێکی وشک و نووزەی لێبڕابوو، هەر لە دەرەوە ڕا هاواری کرد: ماموەستا پەنگرە ئاگرەکان کوژاینەوەو چایەکەش سارد بوویتەوە.
مەلاش لەدەرەوە ڕا بانگی کردێ: کاکی خۆم سێ چوار کلۆتە ڕەژووان بێنەو کەمێک نەوتی پێدا بکە، ئاگرێکی تێبەردە با گەرم بێتەوە، خۆ فرۆکەی دروست ناکەی.
کارۆ چەند دانەیەک خەلووزی خستە ناو ئاگردانەکە، بە دوای نەوتدا گەڕا نەمابوو، دیسان بەدەنگێکی بەرز هاواریکرد: ماموەستا، نە بوتلەکە و نە چرادانەکە نەوتیان تێدا نەمایە.
مەلا خۆی پێڕانەگیرا، ئەوەی لە ناخیدابوو هەڵیڕشت و درکاندی: لە وڵاتێکدا دەژین هەناوی پڕی نەوتە کۆمپانیا نەوتییەکان بە هاوکاری مافیاکانی خۆمان دەیدزن،ئەگەر مزگەوت نەوتی نەمابێ ماڵە هەژارو نەدارەکان لە کوێ دەستیان دەکەوێت.
مەلا خۆشی چووە دەرەوە، بە هەردووکیان کەڵبە خەلووزەکان و ژیلەمۆی بن ئاگردانەکەیان دایە بەر پفان، نەیان توانی دا یبگیرسێننەوە، لە چەقە دووکەڵی ئاگردانەکە مەلاو کارۆڕەشهەڵگەڕا بوون، کارۆ سەیری مەلا ی کرد: ماموەستا باسی کۆمپانیات کرد، خاڵم باسی کۆمپانیای (ئاوی پیسی)دەکرد، دەیگۆت ئەوە هەر بەریادە، هەموو نەفتەکەی لەبۆ خۆی دەبا.مەلا بۆی

راست کردەوە: برا، (ئای، پی، سی) یە، نەک (ئاوی پیسی) ئەوەت لە کوێ هێنا..مەلاخەفەت و توورەیی شین و مۆری کرد بوو، بەبێ ویست و ئاگایی لە کارۆی خوڕی:بڕۆ لەو ماڵە دراوسێیانە بای داگیرسانی ڕەژووەکە نەوت بێنە.

_ ماڵی کێ؟ کارۆ پرسی.

_ ماڵی کێ !؟. مەلا زۆر توورە بوو: ماڵی سندانی، ماڵی قوزەلقورتی، چووزانم ماڵی کێ !! دواتر هێور بووەوە، پەشیمان بووەوە، ئارامتر بە کارۆ ی گوت: بڕۆ ماڵی (فەتحییەی بێوەژن)،بۆ لەومان باشترو خێرەومەندتردەست دەکەوێت لە هەموویان لەبارترو لە حکومەتی (پاشا)ش دەست کراوە ترە.

کارۆ ناچار ڕۆیشت و هەر بەڕێگاوەش منگەیەکی کرد: دیسان مەسەلەکەیە، ئەوە گوتمان حکومەت هیچ، دیارە خێرە مەندی دیکە لەم شارەی نەمایە. دوای چەند خولەکێک کوڕە بچووکەکەی(فەتحییە) بوتلێک نەوتی بۆ هێنان و سڵاوی دایکی بە مەلای ڕاگەیاند.

کارۆ چایەکەی گەرمکردەوە، دوو کوپ چای دووڕەنگی تێکرد، یەکیان شیرین بۆ خۆی و ئەوی دیکەش دیشلەمە بۆ مەلا،هەردوو کوپە چایەکەو چەند کەڵبە شەکرێکی قەندی لە ناو سینییەکی بچووک دانا و هێنایە ژوورەوە، چایەشیرینەکەی بۆ خۆی هەڵگرت و دیشلەمەکەشی بە سینییەوە لەبەر دەمی مەلای دانا. مەلاش هەر بە چا خواردنەوە لە کارۆ ی پرسی: دیارە تۆ نەچووی بۆ نەوتەکە؟

_ بەڵێ ڕۆیشتم.. کارۆ وەڵامی مەلا ی دایەوە.

_ کەواتە، بۆچی تۆ نەوتەکەت لە گەڵ خۆتدا نەهێنا؟

_ ژنەکە گوتی تۆ بڕۆ، بە کوڕەکەم دەینێرم.. کارۆ بە زەردەیەکی شەرمنەوە وای گوت.

## ١٠

کارۆ لە شەوانی پێشتر زووتر نووست، هەرکە پێخەفی پێڵوەکانی ڕۆنیای چاوەکانیان شاردەوە، جەستەی بەنجکراو وەکو گابەردێک کەوتە بنی بیری خەوێ، پەڕەسێلکەی ڕۆحی کردییە باڵەفڕەو بەبێ پاسەپۆرت ئاش و بۆش گەڕاو سووڕاو سنوورەکانی بەزاند. سەرەتا بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە، لە شینکەی ئاسمانێ حیتە حیتی کیژۆڵەی تەڕو ناسک، بە ئاسانی لە بازگەی پەردەی گوێیەکانیدا ئاودیو بوو، بە نەرمە لێکدانێکی دوو باڵ و کلکێکی مقەسی، یان بە نەرمە غارێک سیماو سەرو سەکوت و چڕو چاوی چەندین کارمامزی شۆخ وشەنگ و دەستبژێرو بەربەخت و ئاوقەرانی یەکدی بینی، بە شابسک و شاکەزێ و پەرچەمەکانیان تا خوار شاقەڵیان داپۆشرابوو. لەقەد پاڵی گردۆلکە سەوزەکانی ڕۆخ مێرگەپانێکی پڕ گوڵ و گوڵزار، بەرەو کەناری ڕووبارێکی تیژڕۆی زەلال شۆڕ دەبوونەوەو بە پەنجەکانیان قەف و گرێیەکانی قوڕگیان دەلەراندەوەو بالۆرەی خۆشیان دەچڕی، لاسک و پەلکە مێوەکان لە قەدی دارچنارە بالاّ بەرزەکان ئالاّ بوون و هێشووە ترێیەسادانیەکانیش بەسەر تۆقەرەی ئەو دارچنارانەدا هەڵتەک هەڵتەکیان بوو. چەندین کانی زەمزەمی ڕەنگ جیا هەڵدەقوڵان،کە ئەو لە ژیانیدا نە تام و بۆنی کردبوون ونە دەشیزانی چنە. شەڵخە هەنگوینە زێڕینەکان دەبریسکانەوە و جۆگەلەی هەنگوینیان لەبەر دەڕۆیشت، کارمامزە کلک قیت و پاشەڵ جوانەکان بە دوای نێرییە مامزێکی ئاوگەلەدا دەگەڕان. کارۆ لەو خەوەیدا خۆی دواند: ئەم شوێنە خۆشەی نە سارد نە گەرم، دڵنیام ئەو بەهەشتەیە کە جار جارە لە مەلای گوندەکەی خۆمان گوێم لێدە بوو،ئەو باسی حۆری دەکرد، باسی ژمارەیەکی یەجگار زۆری دەکرد با بچم بیان ژمێرم بزانم حەفتا دەبن. ئامبازێکی داو هەر دەیژماردن و لێی تێکدەچوو. زەریەکان- پەرییە پاکیزەکان-بانگیان کردێ: هەی زرتەی زەغەلی بێ غیرەت، زوو وەرە لە بەهەشتی خودا چاوەڕێتین. هەموویان پێکەوە- هەروەک چۆن خودا دروستی کردوون- بە دەوریدا کەڕەسیسەیان کرد. وەک کۆرەبژێکی تامەزرۆی ئاو لە گونداگەڕای،مەترە لۆزەکەی چەقاند. سەیری کرد (ئیبتیسام) سەر دەستەیان بوو، هەر بە کەنینەکەی جارانی بە پیریەوە هات. کەچی کارۆ سەوداسەرییەک گرتی و سنگەپێ ڕاوەستا، پێیەک لەپێش ئەوی دی لەپاش،لە دەریای ڕاڕایی و دڵەڕاوکێدا مەلەزان نەبوو. گفتوگۆی مەلای مزگەوتی گوندەکەی خۆیانی هاتەوە بیر لە یەکێک لە وتارەکانیدا

باسی جنۆکەی بۆ دەکردن و دەیگوت: دەبێ بڕوامان بەبوونی چەند هێزیک هەبێت لەسەر هەمان خاک لەگەڵماندا دەژین و کاردەکەنە سەر کارو چالاکی و تواناکانمان. لەوانەیە هەندێک لەو هێزانەلە خۆشمان بەهێزترین و لەبەر چاوان بزر بن و بە چاوی ئاسایی نەبیندرێن. بەڵێ بوونی ئەو لەمەچێترانەو توانا لە ڕادەبەدەرەکانیان لە کۆنەوە لە مێشک و ویژدانی مرۆڤ ڕەگی داکوتاوە و چەسپاوە. هەموو ئایینەکانیش بوونی ئەوجۆرەبوونەوەرانەیان وەک ڕاستییەک سەلماندووە. هەتا کار گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی لە ڕووی ئاینپەرستی و بڕوابوون بە خودا لەگەڵ ئێمە بە یەک چاو سەیردەکرێن،وەک ئێمەئیمانداراو بێ ئیمانیان هەیە، جنۆکەی باوەڕداری خێرخوازو، جنۆکەی بێ بڕوای شەڕانگێز و بەدفەڕ هەنە. دەڵێن حەزرەتی سلێمان هەموو جنۆکەکانی خستبووە ژێر ڕکێفی فەرمانەکانی خۆی و بە بێ ئەو نە دەجولانەوە. ئەو جنۆکە بێ بڕواوشەڕخوازانەی سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان دەکرد سزای دەدان و لەو زیندانە ئەبەدییانە بەندی دەکردن،کە بە هۆی ئەنگوستیلەکەیەوە تەلیسماوی کرابوون. لە هەمانکاتدا چیرۆکێکی دایکیشی،کە بە منداڵی بۆی گێڕابووەوە، هەراسانتری کرد، دایکی پێی دەگوت: (عەلی بەردەشانی) شایەرێکی بە ناوبانگ بوو، لە عەردان و لە عاسمانان کەس نەمابوو نەیناسی. هەر شایی و لۆغانێک لەهەر گوندو شارێک بکرابوایە ئەویان دەبرد گۆبەندیان بۆ بڵێ. دەڵێن جنۆکەکان شایی ژن گواستنەوەیان دەبێ، شەوێک دێن (عەلی بەردەشانی)دەدزن و دەیبەن، حەفت شەوو حەفت ڕۆژ سەرچۆپی پێدەگرن و شیعری گۆرانیان بۆ دەخوێنی و بە جۆش و خرۆش نێرو مێیان هەڵدەپەڕێنی. دوای تەواوبوونی شاییەکە دەیان ویست لەلای خۆیان بیبەستنەوە، بەڵام لە دوای ئازارو دەردەسەرییەکی زۆر خۆی دزیبووەوەو ڕزگار ببوو. بەو بیرۆکە وشک و ڕەقانەی ناو کەللەی کەوتە قرت و فرت و قرقرا: هەبی ونەبی ئەوانە جنۆکەی قژنەسەرن، ئەوە نییە لە وێنەی (ئیبتیسام) یش خۆیان نیشانم دەدەن.

لە نێوان ئۆخژنی زەری و پەرییە بسک لوولەکان و لەشەرمی (ئیبتیسام) ی سەرچۆپیگر و نێوان جەزرەبەی جنۆکەکاندا، لەسەری کەیفێی دراو وەک مەڕی کەترەی لەرزەک گرتی،چوارچەمکی دانیشت و تێفکری، ئەو لەمەچێترانەی هاتنەوە یاد کە لە شەوێکی ئەنگوستەچاوی شەوین و شیوەخوارێکدا، لەناو خەرەندو زەندۆرەکانی تەنیشت گۆرستانی گوندی، لە بەرگی گورگی هاربۆی دەهاتن، زەندەقیان دەبرد و زێلکیان دەڕژاند.ترس لە دڵ و مێشکیدا دارماڵ و لێوان لێو

بوو، ئۆقرەی نەما ئانیشکەیەکی کردەوە. چۆن بە سواری (دەمەقران) ی ئەسپەکەی سیامەند بۆ دیداری خەجێ بەرەو ئاسمان بەرز ببووەوە، هەر ئاوهاش بە سواری (تێل عەیشان)ی ئەسپەکەی (چەتۆی کوڕی فەرعۆ)بە حەفحەفی و هێنکەبڕایی بەرەو زەوی نشێو بووەوە. بەو نشێو بوونەوەیە لووشکەیەکی لە بەختی خۆیدا، لەگەڵ ئەو لووشکە بە هێزەیدا پێی لە ناو ئاوزنگی (تێل عەیشان)ێ ترازاو گلا، کە گلا ڕاپەری و وەکو گامێشی شێر شێلای لە جێی خۆی دەم و ددان و هەر چوار پەلی دەلەرزی.. سێ چوار بسمیللای کرد و شادەی هێناو قولهوەللایەکیشی خوێند. دەوی بەو جامە ئاوەوەنا کە ئێوارە لە کوپە ئاوە فێنکەکەی مزگەوتێ پڕی کردبوو، چەند قومێکی پڕ بە گوپی خواردەوەو کەمێک گرفە گرفی ئاگری هەناوی دامرکاندەوە. شوێنی ڕاژێرک و نوێنەکانی گواستەوە قوژبنێکی دیکە و دایوەشاندن، کەدووبارە پاڵکەوتەوە تەنیشتی خۆی گۆڕی و ئەوەی هاتەوە یاد: کە منداڵ بووم دایکم پێی دەگوتم- ئەگەر شەوان خەونی جڕناو فڕنات بینی، شوێنی نوستنەکەت بگوازەوە و بسمیللایەکی بکەو لاتەنیشتی خۆشت بگۆڕە، هەرچی لەمەچێترو قاقلەجنۆکە هەنە لێت دوور دەکەونەوە. بسمیللاو ئامۆژگاریەکەی دایکی بوونە دار عەسایەکەی دەستی حەزرەتی موسا. دارعەسای کۆرە مار خشی و جلیت جلیت بە چەند بازێک خۆی گەیاندە کونە گوێیەکی، چووە ناو کادانی کەللەی سەری و بە دوای هێلکە شەیتانۆکەکاندا گەڕا و بە قەپێلکەوە لرفی کردن،فەرخە جنۆکە تازە باڵگرتووەکانی ناو مێشکی -لە ترسی بیسمیللاکە-لە دەرگای کونە گوێیەکەی دیکەی، ریزیان دەبەستاو بەرە بەرە هەڵدەفڕین، هەر بەرە بەرەش لێوی پێڵوەکانی تەقەڵبەندو قەمامرێژکران، لێزماوی خەو بەرەو کەندو جۆمەکانی دەورووبەری گوندەکەی خۆیان ڕاپێچی کردەوە.

شەو نەدەبڕایەوە، شەو سەری لە سەر سەرینێکی نەرم و جەستەی لەناو جێ و بالینگانێکی گەرم، درێژ درێژ ڕاکشا بوو. خەونی کەم کەس دیتەش- کەس نەدیتەش - هەردووکیانی (مەلا و کارۆ)ی بێزارکردبوو. دیاربوو هەردووکیان هاودەم و هاوخەم و هاوخەوی یەکدی بوون، بەڵام هەر یەکەو کولافەی دەردی خۆی بوو، خاڵی لە یەکدی چوون و جیاوازیشیان زۆر بوو، جیاوازییەکەیان ئاسمان و ڕیسمان بوو- کارۆ، بەچاو نەکراوەیی خۆی، پەرۆشی پارچە زەوییەکەی خۆی و خاک وخەلکی گوندەکەی خۆیان بوو. مەلاش- بە زانایی و دانایی خۆی- بەغداو گوندەکەی خۆی و هەموو خاکی دنیای-وەک یەک- پێی هی خۆی بوون. مەلا- پنتێکی ڕەش لە

ناو دڵیدا - شارێکی وەک بەغدای پڕ کەیف و خۆشی لەبەر چاوی ڕەشکردبوو. ئەو پنتکە ڕەشە دڵ و کەللەی پڕ ژەهری ڕک و کینە و هەوڵی تۆڵە سەندنەوە کردبوو. کەللەی کارۆش ئەوەی پێشتر تێیدا بوو یان تێیئاخێندرا بوو- مێگەلێک مەڕو بزن، کەرێکی شین، سەگێکی حەپ حەپکەرەی دڕ، ترسی گەلە گورگێکی هار، جنۆکەکانی ناو کەللەشی گەرا ی گەلە ڕشکیان دانا بوو، هەتا بانگوولەو ئەسپێشیان هەڵهێنا بوو..

باوبڕی خواردنەکانی ڕۆژی پێشتر ترتروکی (کارۆ)ی پف دا بوو، میزڵدانیشی ببووە دەبدەبە، شیلەی چەسپی دووقلی ناوپستێریشی بە مووە چرەکانی دیوی ناوەوەی لاڕانەکانیەوە چەسپا بوو.هەر ئەوەش لە سەری خۆشیدا و بە ئاگای هێنا بوو. بە خۆ گوشینەوە بەرەو ئاودەستەکانی مزگەوتەکە هەر هەنگاوێکی کردە چوارو لە ئاودەستێکدا کەمێک حەسایەوە لە شوڕە شوڕی ئەو، مەلاش بە ئاگا هات، کە ئەویش هەر کەروێشکە خەوێکی کردبوو.

شەو خەریک بوو سپیواژ دەبووەوە دەردی دڵ لە هێلکەدانی (کارۆ)ی وەک هێلکەیەکی توێکل ڕەقبووی دووزەردێنە تەنگاوی کرد بوو، دەبوایە شوێنێک بدۆزیتەوەو تێیدا دایبنێ. دیار بوو بە مەزەندەی خۆی حوجرەی مەلای باشترین شوێنی نەرم بوو. لە سەر پارچە تەشکە بەرێک لە بەرامبەر مەلای کەوانەی کرد، هەردووکیان زەمینیان دایە یەکدی، کارۆ بە مەلای گوت: تۆش ئەمڕۆ وەکو من زوو بە ئاگا هاتی.. مەلا وەڵامی کارۆ ی دایەوە: من شەوانە زوو دەنووم و زووش بە ئاگا دێم، مەلا وەکو خەڵکی ئاسایی نییە، هەتا ئاوێک بەخۆمدا دەکەم و دەستنوێژێکی دەشۆم و خۆم دەگۆڕم نزیکی بانگدان دەبینەوە، لەو ماوەیەشدا چەند ئایەتێک قورئان دەخوێنم.

کارۆ بیری کردەوە. دیارە مەلاش هەمان خەونی منی بینیوە. پەشیمان بووەوە. بڕوا ناکەم هی مەلایان جودایە، ئەوان ئەوەندە باسی پەرییەکان دەکەن لێڕاهاتینە و شارەزایان بوونە، ئەگەر بێنە خەونیشیان لێیان ناترسێن. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا: بەڵێ ئەوان وەکو ئێمە نین. ئێمە مانان تەنها لەمەچێتر دێنە خەونمان و دەمان ترسینن.

دیسان- هەروەک دەڵێن هەر یەکە لە مەلاو عەرەبانەی لێ ببووە دەعبا و دەوی لە کەللەی نابوو. ئەگەر پرسیاری عەرەبانەکەم لێبکا چی لە بۆ باس بکەم؟ بڵێم لە ماڵی ئەو ژنەیە؟ نا وا ناڵێم. بڵێم شارەوانی هاتن و هەرچی عەرەبانە لەو بازاڕەیدا هەبوو بردیان؟ مەلا لەمێژە لەم شارەیە و خەڵکێکی زۆر دەناسی، دەترسم بڵێ

بەیانی پێکەوە دەچینە شارەوانی بۆتی دەهێنمەوە. بڵێم چەند ڕۆژێکە بە کرێم دایە بەیانی دەچم کرێیەکە وەردەگرم و ئەویش دەهێنمەوە؟ نا ئەوەش نابێ، بەو درۆیەی هەر بڕوا ناکا. مستێکی ڕێواندە کەللە بۆشەکەی خۆی: بێ مێشک قسەکی وا بکە پێت بڕوا بکا، منیش لە جێی مەلا بم دەڵێم- کێشکە خۆی هەیە هەتا شۆربای هەبێ.

کتوپڕ مەلا بە پرسیارێک دارێکی لە ڕۆحیدا: براڵە، دوێنێ لە کاتی داوەتەکە دوا کەوتبووی، هۆکاری دواکەوتنەکەشت دایە پاڵ ئاژوەری پەیتوونێک، گوایە بە سواری پەیتوون گەڕایەوە مزگەوت، من لە یادم نەبوو لێت بپرسم- ئەدی عارەبانەکەت چی بە سەرهاتبوو؟

(با) بیرە فرفرۆکییەکەی (کارۆ)ی باهەڵدا، گەڕاندی و سووڕاندی، بە دوای پینەدۆزێکدا گەڕا پینەی بۆ بکا، هەر خۆی پینەیەکی قەمامە نەکراوی دۆزییەوە، بە مەلای گوت: نازانم باوەڕم پێدەکەی یان نا درۆت لە گەڵدا ناکەم، چۆن بووە وات بۆ دەگێڕمەوە- لەو بازاڕەی لە چاوەڕوانی کرێیەکدا دەوەستم، ئافرەتێک هەندێ کەلوپەلی هەبوو بۆم بردەوە ماڵەوەیان، هەر لە ڕێگا و لە کاتی ڕۆیشتنمدا بۆ ماڵی ئەو ژنە، کەمیش مابوو بگەم، بە قودرەتی قادر یەکێک لە بۆلبەرینەکانی تایەی عارەبانەکەم شکا، بە هەرحاڵێک بوو ڕامکێشایە ماڵی ئەو ئافرەتە و کەلوپەلەکانیم هێنایە خوارەوە، ویستم بە ڕاکێش ڕاکێش بیهێنمەوە، کەچی ئافرەتەکە، کە بەحاڵی عەرەبانەکەمی زانی، داوای لێکردم لەماڵی ئەوان بەجێی بهێڵم، هەر ئەمڕۆ سبەیە دەچم بۆلبەرینێک دەکڕم و چاکی دەکەمەوەو دەیهێنمەوە.

مەلا تێیگەیشت چی لە دڵدایە، نەیویست درێژە بە بابەتەکە بدا. بە کەوانەی چاوەکانی تیرە نیگایەکی گرتێ: هاوسەرێک بۆ خۆت بدۆزەوە، مەلا وای گوت، ئەگەر پێویستیت بە پارە هەیە شەرمێ مەکە پێم بڵێ.

ترس و شەرم پێکەوە دایان پەرۆست، ترسا لەوەی نەوەک مەلا بە بابەتی عەرەبانەکەو پەیوەندی نێوان ئەوو ئیبتیسام ی زانیبێ. شەرمیشی کرد بە مەلای بڵێ- بەڵێ حەزم لە ژنێیە، بەڵام پارەم نییە- ناچار پوشکەیەکی دەست کردێ و خێرا خێرا بە بەردەمی خۆیدا هێنای و بردی و بە زەویدا خشاندی، دواتر سەری بەرزکردەوە، چاوی بە ئاراستەی چەند تاخچکەیەکی کتێبخانەکەی مەلادا گێڕا، چەند کتێبێکی سەفتەکراوی بینی. ئەوەی بە بیرهاتەوە: مەلای گوندەکەمان کتێبێکی بۆرکەلەی هەبوو، خەڵکی گوندی خەونەکانیان دەبردە لای ئەو، ئەویش سەرقەلەمانەیەکی

لێوەردەگرتن و پەڕ بە پەڕی کتێبەکەی ئاودیو دەکرد و مانای خەونەکەی بۆ لێکدەدانەوە.
هەرچەند کارۆ چاوی بەملاو بەولادا گێڕا، هەمان شێوەو قەبارە و ڕەنگی کتێبە بۆرکەلەکەی مەلای پێشتری نەدۆزیەوە، لە خۆی پرسی: دەبێ لەو هەموو کتێبەی ئەو مەلایە هەیەتی ئەو کتێبەی من مەبەستمە تێیدا نەبێ؟. وازی نەهێنا هەر لەسەرەوەتا خوارەوە و لەو تەنیشتەوە بۆ ئەو تەنیشت، هەر بە چاو هەمووی گەڕا، کتێبێک سەرنجی ڕاکێشا: مامۆستا ئەو کتێبە مەیلەو بۆرکەیەی لەسەر ئەو تاخچکەیە هی چییە؟
_ ئەوە کتێبی مەلایەتییە، بۆ دەپرسی؟
_ خەوننامە نییە؟
_ بۆ خەونت بینیوە؟
_ بەڵێ...کارۆ گوتی.
مەلا حەزی لەو جۆرە کتێبانە نەدەکرد بۆیە پێی گوت: زۆر بیری لێ مەکەوە هیچ نییە، گەشبین بە و ڕەشبین مەبە، بەگەشبینی کاری خێرو چاکەت دێتەڕێ و ئاسوودە دەبی. بەڕەشبینیش هەرچی شەڕو خراپەی دنیا هەیە بەرۆکت دەگرێ، پیاوێکی مەزن دەڵێ: جەنگی نێوان خێرو شەڕ هەمیشەییە و کۆتایی نایەت، گۆڕەپانی ئەوجەنگەش تەنها دڵی مرۆڤە نەک شوێنێکی دیکە.
کاتژمێرەکەی لە باخەڵی جوببەکەی دەرهێنا کە بە زنجیرێکی قولانجێک درێژ بە قۆپچەیەکی ئەو جوببەیە بەسترابووەوە. بە پلێکی دەستی چەپی قەپاغی کاتژمێرەکەی قیتکردەوە و بە دوو پلی دەستی ڕاستیشی میلی فتیلەی چرادانەکەی سووڕاندو ئاگرەکەی گەشتر کردەوە. کاتژمێرەکەی دایە بەر تیشکی ڕووناکی ئاگری چرایەکە و بە پەلە هەستایەوە، کارۆی ئاگادار کردەوە: هەندەی نەماوە بۆ بانگدان، با بڕۆین دەستنوێژ هەڵگرین، بەڵکو چەند کەسێکی دیکەش بێن و پێشنوێژیەکەتان بۆ بکەم.
(مەلا) کە بۆ لای سەرشۆرکی تەنیشت حوجرەکەی خۆی ڕۆیشت کتێبە بۆرکەلەی هاتەوە بیر: وەک خۆی گوتەنی کتێبێکی بۆرکەلەی بۆ دەردەهێنم، ئەو هێشتا خویندەوارییەکەی زۆر باش نییە بزانی ئەو کتێبە بخوێنێتەوە. بە ڕووی کارۆ دا گرژییەوە: کە نوێژەکەمان تەواوکرد کتێبەکە دەردەهێنم و خەونەکەت بۆ لێکدەدەمەوە. کارۆ بەو قسەیە شاگەشکە بوو، بە کپی هەستایەوە، ئەویش چووە

ناو ئاودەستێک لە ئاودەستەکانی مزگەوت، بە نیەتی لەش پاک کردنەوە و خۆ بسمیل کردن، یەک دوو مەسینە ئاوی بەخۆداکرد. ئەسپێیە جناویەکانی ناو مێشکی وەها دەوە تیژە دەرزیلەییەکانیان لە مێشکیدا ئاژنی بوو، چەندی دەیکرد بیری جەم نەدەبووەوە فاتیحاو قولهوەللاکەی بە باشی بخوێنی، پێشی (مەلا)ش هاتە دەرەوە و لە بەردەمی حوجرەکە چاوەڕێی مەلا ی کرد، هەرکە پێکەوە دانیشتن یەکسەر خەونەکەی هەر لەسیری هەتا پیازی بۆ مەلای گێڕایەوە. مەلا ش وەک ئەوەی ئەو دەیویست، کتێبێکی بۆرکەلەی دەرهێنا و پەڕ لە دوای پەڕ ئاودیوی کرد. بۆ ئەوەی کارۆ هیچ گومانێکی لە دڵدا نەمینێ، دووچوکلێتی لە ناو قاپلەمەیەکی تەنیشتە خۆی هێنایە دەرەوە و لەسەر کتێبەکەی دانان، یەکێکیانی بۆ ئەو هاوێشت، کە لە بەر دەوی هەڵتوترکا بوو، یەکێکیشیان خۆی خواردی: ئەم دوو چوکلێتە لە جیاتی سەرقەلەمانە بوون پارەم پێ خەرج نەکردی.. هەر لە بەر خاتری ئەو، چەند لاپەڕەیەکی دیکەی- بە شەلم کوێرم ناپارێزم- ئاودیو دەکردو سەیری دەکردن، لە لاپەڕەیەکدا سەنگرایەوە: ئەم لاپەڕەیە لێکدانەوەی خەونەکەی تۆی تێدایە، لە خۆت خەنی دوعای خێرم بۆ من بکە، هەتا منیش خەبەری خۆشت بدەمێ. مەلا موژدەی بێ بنەمای دەداێ و چەواشەی دەکرد،کەچی کارۆ بە دڵسافی و ساویلکەیی خۆی باوەڕی پێدەکرد: کارۆی برا، کتێب دەڵێ: تۆ زۆر بەختەوەری، دوارۆژێکی پڕشنگدارو گەشت هەیە. خودا بە زیندوێتی بەهەشتی پێ نیشان دای، ئەو شەوە چۆنت بینیوە هەر بەو جۆرەیە، کچە ناسک و شۆخ و شەنگەکان، ئەو پەری و زەریانەن کە خودا لە بەهەشت بۆ تۆی هەڵگرتوون. دوو جۆگە ئاوە هەمەرەنگەکانیش ئەو شەرابە تەهوورەن کە لەوێ بە حەلاڵی دەیخۆیەوە و پێی سەرخۆش نابی. هەروەها بەهەشت پڕە لە سێوی لاسۆرو دەیان میوەی بەتام، ڕەنگە ئێمە هەر ناوەکەشیان نەزانین. ئینشائەللا هەردووکمان لەوێ یەکدی دەبینینەوە.

_ دڵنیا بم ئەوانە لەمەچێتر نەبوون خۆیان بەو شێوەیە نیشان دام !؟ کارۆ پرسی.

_ بەدبەخت لەمەچێتری چی و حاڵی چی، تۆ شێتی؟ خوا بە گەورەیی خۆی پڵاوی بۆ دانای بە دەوی خۆت بیخۆی، تۆ پارووی بۆ چاوت دەبەی نازانی بیخۆی. کاکی خۆم ئەو ئافرەتەش کە لەوێ چاوت پێی کەوت و ناسیتەوە لەوانەیە لە دوا ڕۆژدا بەر بەختی تۆ بکەوێ و ببێتە ژنت.

بەو لێکدانەوەیە کارۆ بەزی گرت و گەرماییەک بە دڵیدا گەڕا، ئەو گەرماییەش جوولە جوولێکی پەنهانی- لە نێوان خۆی و خۆیدا- بە لێوەکانیدا گەڕاند: جیاوازی

نێوان ئەم مەلایە و مەلای گوندەکەمان وەکو حیاوازی ئاسمان و رێسمانە. ئەو سەرقەلەمانەی دەویست پارەش نەبوایە نەیدەویست، کەچی ئەم مەلایە چوکلێتی خۆی کردە سەرقەلەمانە و نیوەشی دایەوە خۆم، ئەو تەنها بە ئاگری دۆزەخ و جنۆکەکان دەیترساندین، کەچی ئەمە بە خۆشی بەهەشت و پەری و میوەو ئاوە خۆشەکانی دلّخۆشمان دەکا. لە خۆشی قسەخۆشەکانی مەلای هەر وەختبوو دوو باڵی لێ برسکێ و هەر ئەو چرکەیە خۆی بگەیەنێتە ماڵی ئیبتیسام: بەهەشت و حۆری و میوە و نازانم چی و چی هەموویان لە لایەک، ئەگەر خوا بیکردبوایە ئیبتیسام ببوایە ژنم بەبابەوە خەنی دەبم. بەس ئەو ژنە ئەلمۆدەیە و شوانەوێرەیەکی وەکو منیان نەگوتییە. بڵێم چی ئەوە خوایە هەموو شتێکی کەس نەکردەی پێدەکرێ، هەر هەندە بڵێ تێژ دەلعازی دەکرێ. لە خودای خۆی پاڕایەوە: خودایە ئەوەت بکردبوایە قەت لە چاکەت دەرناچم، ئەگەرچی هیچم نییە بیکەمە خێر، بەڵام خۆ پێم دەکرێ ئەم مزگەوتەی ماڵی تۆ هەموو ڕۆژێ پاک ڕابگرم و بیکەمە گوڵ. با هەر بێوەژن بێ باشتریشە رێی خۆشە، دەزانی نازیشم هەڵبگری. ئەدی بەخۆی پێی نەگوتم کچ باش نییە نازانی نازت هەڵبگری، نا کچ ناخوازم. هەندەی نەما لە خۆشییان بکەوێتە هەلیکەسەما و سێ جرتی لە خۆی هەڵبدا. عەشقی ئیبتیسام لە تەقرانی خۆشەویستیدا گەوزاندی، شێتانە بیری کردەوەو چۆلەکەی بیری لە هێلانەی بیردانیدا فڕی، هوڕێنە دوای هوڕێنە، چاویشی تریوە تریوێکی کەوتێ، وایزانی ڕەشبەڵەکێک دەگەڕێ نەسەری دیارە و نەبنی، شایی هاوسەرگیری هەردووکیان بوو، لەبەر ئەوەی ئەو ماڵی نەبوو شاییەکە لەبەر دەرگای ماڵی ئیبتیسام بوو. دەسماڵی سەرچۆپی ئیبتیسام و کلکە هەنگوچکی گاوانی خۆی شاییەکەی جۆشدا بوو. کارۆ بڕیاریدا هەر ئەو چرکەیە بەرەو شاییەکە بڕوا، بەڵام تەقە تەقی دەرگای دەرەوەی مزگەوت ڕایوەستاند.

## ١١

مـەلا خـۆی بـەرەو دەرگاکـە ڕۆیشـت و بـە پەلـە گەڕایـەوە: کـوڕە بچکۆلەکـەی (فەتحییـە) بـوو، دایکـی ژانـە سـەریەتی دەچـم دوعایەکـی بـۆ دەنووسـم- نـەوەک کارێکـی لابـەلاش بەرۆکـم بگـری- ئەگـەر درەنـگ گەڕامـەوە نەچیتـە ئەمـلاو ئـەولا، وەکـو جـاری گۆریـن ئـاگات لـە مزگەوتەکـە بێ..هەنـدێ پـارەش لـە نـاو ئـەو دەلاقەیـە کـە کتێبـە بۆرکەڵەکـەم لێدەرهێنـا، بـە پێـی پێویسـت بـۆ خـۆت خەرجـی بکـە.. (مـەلا) بـە (کارۆ)ی گـوت.

دوعـا نووسـینی مـەلای بـۆ (فەتحییـە) پێنـج ڕۆژو چـوار شـەوی خایانـد، لەسـەر پێشـنیاری ئـەو ژنـە بەرەو شـارەکانی نەجەف و کەربەلا گەشـتیان کـرد، هەریەکەیان بـە تەنیـا بـەرەو گـەراج بەڕێکـەوت، لەوێـش بـە جووتـەو بـە یـەک ئوتومبێـل و لەتەنیشـت یەکـدی گەشـتیان کـرد، لـە مـاوەی نزیکـەی سـێ کاتژمێـری ڕێگاکـە قسـە قسـەی رادەکێشـا، ئـەم دەیگـوت و ئـەوی دی سـەری بـۆ بـا دەدا. تیـری چاوەکانیـان کاری دەکـرد و نەدەکـرد، گیـرەی ڕاڕایـی و دوودڵییـەک قورقوڕاگـەی دەگرتـن و هەناسـەی سـوار دەکردن،شـەرم ڕوخسـاری سـوور هەڵدەگەڕانـدن. لـووە ئارەقرژێنەکانیـان مەلـەی پێدەکـردن. هەریەکەیـان دڵـی دوولـەت بـوو: ئەمیـان پێـی وابـوو بێوەژنـەو دوو منداڵـی چـاو گەشـی هەیـە، ئـەوی دیشـیان هاوسـەرە خۆشەویسـتەکەی و کوڕیەکـەی نـاو زگـی سـەربڕابوون. دوو لەتەکـە لـە ملمڵانـێ دابـوون، شـەڕێکی دەسـتەو یەخـە خنخناکـەی گرتبـوون، شـەڕی چۆنیەتـی دەربڕینـی خۆشەویشـتی بـۆ یەکـدی، شـەڕێک لـە دەروونیانـدا ئـەم سـەرو ئەوسـەری دیـار نەبـوو، خەنجەریـان لەیەکـدی دەسـوی، فیشـەکیان دەخسـتە نـاو باقەنەزمـەی تفەنگ،پەنجەیـان بـە پەلاپیتکەیـەوە دەنـا. هەسـانەکان چـەور نەبـوون، خەنجەرەکانیـان نەدەسـوی تیژیـان بکەن،گوللـەکان چـرووک بوون،نەدەتەقیـن و زرمەیـان نەدەهـات. بەدرێژایـی ڕێگاکـە بەمجـۆرە بـوون، دەربـارەی خۆشەویسـتی نـە ئـەم نـق و نـە ئەویـش جق..مـەلا کـەواو سـەڵتەو مەندیلـی فڕێدابـوو، چاکـەت و پانتـۆل لەبـەری و سـیدارەی لەسـەر نابـوو، فەتحییـەش دیشداشـەو عەزیـەو فۆتـەی سـەری و عەبایەکـی ڕەشـی لەنـاو جانتایەکـی سـەفەری دانابـوو، پێلاویکـی پاژنـە بـەرزی بـن عانـەی لـە پـێ و دەسـتە جلێکـی ئەلمۆدەییانـەی پۆشـیبوو. بێگومـان ئـەوە ڕێکـەوت نەبـوو، دوای ڕاوێـژو تەگبیرکردنێکـی چەنـد ڕۆژە بـوو. مـاوەی

ئـەو چـوار شـەوەی گەشـتەکەیان، هـەر شـەوەی لەنـاو چـوار دیـواری حەوشـەو سەحنی مەزارگەیەک لەمەزارگـەکان لاونیـو دەخەوتـن، یەکیـان سـەری لـە مەشـریق ئەوی دی لەمەغریب. سەحن و حەوشە مۆنجەیـان دەهـات، حەشاماتێک نەسـەری دیاربوو نەبنـی، خەڵـک لەبەیانـی تاکـو نیـوە شـەو وەکـو مێروولـە دەجـوولان، کـە هیلاک و کفت و ماندوودەبـوون، هـەر یەکـەو جێپێی بزنێکی بـۆ خـۆی دەدۆزیـەوەو بـە نیپەتـی خوشـک و برایەتـی لەتەنیشـت ناسـیاوێک- یـان نەناسـێک- ڕادەکشـا. هەرچەنـدە لاقـەکان یەکیـان دەلێسـتەوە، پەنجـەکان دەبوونـە شـانەی تـەون و لەیەکدی گیردەبـوون، کەچـی ئەوانـەی نـاو سـەحن بـە قودرەتـی قـادر هەموویـان دەبوونـە خوشـک و بـراو جەسـتە پەڕۆ. ئارەزووەکانیش لەژێرزەمینـی مەزارگە، لەناو تەرمـە نەناسـراوە بـێ گـۆڕو بـێ ئەلحـەدو بـێ کێلـەکان دەنێـژران. لـەو ماوەیـەدا، هـەر پێنـج فـەرزەی خـودا، لـەکات و سـاتی خۆیدا،فەتحییـە بەبـەردە مۆرومەلاش بێ بەردەمۆر نوێژیـان دادەبەسـتا. هـەر یەکەیـان دەسـتی منداڵێکـی دەگـرت و بەجووتـە بـەدەوری مەزارگـەدا دەسـووڕانەوە، نزایـان دەکـردو دەپاڕانـەوە. ئـەوان هەردووکیـان - بێـوەژن و بێوەمێـرد- لەهەسـتان و دانیشـتنیاندا، لەگـەڕان و سـووڕانیاندا، لەنـاو حەشاماتەشـەپ و شـۆڕو شـەپرزەکاندا شـامێرو شـاژن بـوون. ئـەو هـەر لـەدوای مردنـی (کـەرەم) ی هاوسـەری قووچەکـی مـرازی لەسـەر غـەرە بـەردی مەزارگـەی دڵـی (مـەلا)ی چەقاندبـوو، لـە دوای هـەر پێنـج فـەرزەی نوێژەکانـی، بـە دزیـو بـە ئاشـکرا دەسـتەکانی بـەرەو ئاسـمان بـەرز دەکـردەوە و دەنووزایـەوە: خودایـە هیـچ کـراس زەردێـک، باخـەڵ شـۆڕێک، دەسـت بەبازنێـک، گوێ بەگوارەیـەک، چـاو بەکلێـک، پـێ بـە خرخاڵێکـی تەرپـۆش ئیرەییـم پـێ نەبـا، یـا ڕەب هیـچ شـاتکە شـێتێک، زریکـە لێدراوێـک. کلـک پانێـک، پسـتێر پیسـیک، پاتەرێکـی بـە تـەرەب، زکرەشـێکی جادوکـەر چـاوزاری لێـم نـەداو ئـەو قووچەکـەم لـێ نەڕووخێنـی، کـە هـەر ڕۆژەی بەردێکـی دەخەمەسـەری و بـەرزی دەکەمـەوە. خـودای مـەزن بـە مـرازم بگەیەنـە.. (فەتحییە)دڵنیـا بـوو ئـەو قوفلـەی مەزارگـەی دڵـی (مـەلا)ی پـێ قوفلـدراوە، بـە کلیلـی دەرگای مەزارگـە پیرۆزەکانـی (نەجـەف) و (کەربـەلا)، بـە هیمـەت و گەورەیـی ئیمامـی عەلـی و حەسـەن و حوسـەین دەکرێتـەوە. ئـەو گوێـی لـەو گۆرانییـە نەببـوو، کـە دەڵـێ- یەکـەم هەنـگاو هـی کـوڕ بـووە- ئـەو پێـی وابـوو، ژیـان ڕۆژێکـە و ڕۆژەکـەش ئەمرۆیـە- بەڵـێ عەشـق مەچـۆ مەچـۆو مـەڕۆ مـەڕۆ نازانـێ. بچـم نەچـم و دوودڵـی و ڕاڕاییـش لـە کەللەیـدا نییـە. ئـەو دەڵـێ-

ئەگەر بڵێی هەر دەڕۆم ئەگەر نەڵێی هەر دەڕۆم-عەشق ماری بێ ئیجازەیە دڵت دەگەزێ و پڕ ژەهری خۆشەویستی دەکات و مۆڵەتیش لەکەس وەرناگرێ. تۆزقاڵێک ترس بەناو خوێنبەرو خوێنهێنەرەکانی دڵێکی پڕ عەشقدا ناڕوا.هەروەک دەڵێن- دڵ مێشە-مێشە لەوێ بۆ ئەوێ بە ئارەزووی خۆی بە ناو تەم و مژو دڕکاندادەگەڕێ. ئەوتام و بۆنەی ئەو دەیەوێ لەکوێ بێ لەوێ دەنیشێ. مێش نە چاوی هەیە ونە هەست، تۆهەر لێی بدە و دەری بکە لە هەمان چرکەدا دەگەڕێتەوە هەمان شوێن.. فەتحییە گۆلمێک پارەی ئاسنی-هەر لە فلس و دووفلس و عانەوە،تا دەگاتە درهەمەم و دوو درهەمی-لەناو جانتاکەی دەستی دەرهێنا، دایە هەردوو منداڵەکەی و بەنەرمی دەستی بە سەری هەردووکیاندا هێنا: هابڕۆن بۆ خۆتان شەکرۆکەو لوقمی پێبکڕن. بەکەوانی چاوی تیرێکی بەکاری گرتەمەلاو پێی گوت: (حەجی کەرەم)ی بەهەشتی متمانەی بە هەموو کەس نەدەکرد، کەچی بە بۆنەو بێ بۆنە لە هەموو دەرفەتێکدا، کەوەکو دوو هاوسەر گلەیی و گازاندەی خۆمان بۆ یەکدی باسدەکرد، ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە- دنیامەرگ و مردنە،من مردی و تۆ زندی،ئەگەر من مردم و تۆ مای، مەلای ئەومزگەوتەی بەرامبەرمان جێی متمانەمە،بیکە بە پشتیوانی خۆت و منداڵەکان. (حەجی کەرەم)ی باوکی منداڵەکانم زۆر خۆشدەویست ئەو جۆرە قسانەم زۆر پێناخۆش بوو، چونکەوامدەزانی پیاوێکی وەک ئەوم قەت دەست ناکەوێتەوە، بەلام ئێستا تێگەیشتم ئەگەر پیاوی باش هەبێ باشتریش هەیە، کە حەجی کوژرا منی قەلەزراو، سەرگەردان و ماڵوێران و دەست لە ئەژنۆ نەمدەزانی چی بکەم، تۆ هاتی دڵت دامەوە، کەفن و دەفن و شاردنەوەی حەجی کەرەمت هەمووی خستە ئەستۆی خۆت، نەتهێشت من هەست بەو کۆسەم بکەم، دەستت بەسەری منداڵەکانمداهێنا ماچتکردن، نەتهێشت هەست بە بۆشایی نەبوونی باوکیان بکەن، هەتا ئێستانەگەر لە مزگەوت دەرچوویی سەرێکت بەلای مندا لارکردۆتەوە، پێیەکت بۆماڵی من خوارکردۆتەوە، تۆ بۆمن لە هەموو باشان باشتری،لە هەموو پیاوان پیاوتری، نازانم چۆن و بەچی قەرەبووی ئەو پیاوچاکییەو باشییەکانت بۆ بکەمەوە.. کەوانەکانی چاویان یەکدییان تیر باران کرد، تیرەکان بارینە سەر جۆخینەی مانگی چاوەکانیان و تەم و مژی دەوروبەریان ڕاماڵی. هەرچەند مانەوەیان لەوێ درێژەی دەکێشا، تراویلکەی نێوانیان زیاترو زیاتر دەرەوییەوە و تیشکی بەهێزی خۆری حەزو

ئارەزووەکانیان ڕاوی ئەو تەمەی بەری چاویانی دەکرد.
مەلا گرێکوێرەیەک لەدەروونیدا هەبوو دڵی توند گرێدابوو، پزیشکێکی دەروونی گەرەک بوو بۆی بکاتەوە. فەتحییە بڕوانامەی پزیشکیی دەروونی نەبوو، بەڵام بڕوانامەی عەشقی لە کۆلێژی دڵ ولەزانکۆی قەفەزەی سینگیدا وەرگرتبوو، دکتۆرای لەو بوارەدا هەبوو، لە سیاسەتی- کاری ئەمڕۆ مەخەرەسبەی- شارەزابوو، بەڵام نەخۆشییەکەی مەلای چارەسەری ئاسان نەبوو، نەخۆسشییەکە لەدڵیدابوو. فەتحییە دەیویست بچێتە ناو ئەو ژوورە تاریکەی مەلای، کە ئێش و ئازار لایەکی بەتەواوی ڕەش کردبوو، لایەکەی دیشی هەوکردبوو. مەلا هەتا ئەو چرکەیەش (فەتحییە)ی وەک مرۆڤێک خۆشدەویست نەک وەک خۆشەویستێک، ئەو بەخۆی دەگوت: چاکەکانی فەتحییە یەکجار زۆرن، بەڵام زەحمەتە بۆشایی خەمەکانم پڕ بکەنەوە. ئەو هەمیشە ناخی خۆی دەدواند و دەیگوت: مرۆڤ هەرجارێک ماران گەستە دەبێت ئەگەر بیکاتە دوو گێلە، من ژیانی یەکێکی دیکەم دزیوە و گیانیم بەخاک سپاردووە، گیانێک خودا بە جەستەی دابوو بێ ویژدانێک لێی جیاکردەوە. دەزانم هەموو کەسێک دڵی هەیە، بەڵام ناخیش شەرتە، من ناخم پڕی درکە،پڕە لەو درکە زەردە ڕەقانەی کەس ناوێرێ دەستیان بداتێ، لەهەر چرکەیەکدا درکێک لەگەڵ خوێنم بەناو جەستەمدا دەگەڕێ و لەدڵم ڕادەچێ. خۆشەویستیم وەک بۆمبێکی تەوقیتکراو ناسیوە لەوانەیە لەهەر کات و ساتێکدا بە ڕووی مرۆڤدا بتەقێتەوە.. نانا ناکرێ، مرۆڤ چۆن دەتوانێ وەکو مار پێستی خۆی بگۆڕێ. بزماری عەشقێک ساڵەهای ساڵە لە دڵمداچەقیوە، ڕاستە کۆن بووە و ژەنگی هەڵێناوە، بەڵام هێزی من باری نابا دەری بهێنی، هەتا ئەگەر هێزو توانای (فەتحییە) ش دەری بکێشی شوێنەکەی هەمیشە ژان دەکات و خوێنی لێدەچۆڕێ.
فەتحییە چەند بەردێکی فڕێدایە گۆمی بێدەنگی (مەلا)ی و شلەقاندی: کەوتومەتە ناو بیری بێدەنگیت وەختە بخنکێم، هەرچەندە بەسەر لێوەکانتەوە زەردەخەنە دەکەی،تۆ لە ناختەوە پێناکەنی، دەنگێک لە دەمتەوە دەردەچێت و بێدەنگییەکیش لە قوڕگت گیربووە، من وەک ناولەپی خۆم دەتناسم، زۆری دەزانی و کەمی دەردەبڕی، دەزانم بیر لەچی دەکەیتەوە،بیرکردنەوەیەکی بێهوودەیە، ڕابردووت لە پشتتەوەیە تۆ ئەوەندە ئاوڕی لێمەدەوە، پشت لە تاریکی بکەو بەرەو خۆر بڕۆ، سەیری پێشە خۆت بکە خۆرلەبەرامبەرتە.

مرۆڤ ئەگەر نەشتوانی پێستی خۆی بگۆڕی دەتوانی ناخی بگۆڕی. تۆ ئەگەر بەردەوام برینی کۆن بخورێنی خوێنی زیاتری لێ دێت، من و تۆ هەمان بەرو پشتمان هەیە. هەردووکمان نەفسی خۆمان گرتووە، ئەوەی خودا پێی ناخۆشە ئەوەمان کردووە. دڵمان وەک منداڵێکی ساوا لە گرتوخانەی سینگماندا بەند کردووە، لێی دەترسین ئاوو خواردن و سەردانیشمان لێ بڤەکردووە، ڕەنگی زەرد، ترپە ترپێکی کەم، لەڕولاواز بووە، ها ئێستا نا هەنووکە ڕووح دەدا، بەڵێ وامان لێکردووە.
مەلا حەزی دەکردو نەیدەکرد،حەزی لە ژنێکی وەک مامزی دوو کار لەبەر دەکرد،حەزی لە جوانێکی وەک فەتحییەی خاوەن ماڵ و سامان دەکرد، حەزی نەدەکرد لەبەختی خۆی دەترسا، نیازی تۆڵەسەندنەوە وەک دەبدەبە ناخی پف دابوو، سەری یەک نووکە دەرزیلە،دڕکە زەردەیەکی باریکیش لەهەر ئان و ساتێکدا تێی بچەقیبوایە دەیتەقاندەوە. یانیش حەزیدەکردو نازیدەکرد دەیویست فەتحییەزیاتر بیلاوێنێتەوە. بەهەرحاڵ ئەو ڕۆژەش بەو پێشەکییانەی فەتحییەو بەو خۆبێدەنگکردنەی مەلای بەسەرچوو.
دوا شەوی گەشتەکەیان بوو، ئەو شەوە هەردووکیان وایان پێ باش بوو پشوویەک بدەن و لەناو جەنجاڵی حەشاماتی خەڵک دەربچن. مەلا دوو ژووری لە ئوتێلێکی شاری کەربەلابە کرێگرتبوو، یەکێکیان بۆ خۆی و ئەوی دی بۆ ژنەو هەردوو منداڵی. چارەکی شەو ڕۆیشتبوو تەپە تەپ و گرمە گرمی پێیان و دەنگە دەنگی گەشتیارانی ناو ئوتێل نەدەهات، مەلا بەنیەتی هەواڵ پرسینیان و ئاگاداری لێیان لە دەرگای ژووری ژنەیدا: هاتم بزانم چۆنن !!
(فەتحییە) گەشایەوە: بەخێر بێی،ئەگەر نەهاتبوای من دەهاتم، منداڵەکان دەمێکە نوستوون وەرە دانیشە. ژنەحەزی دەکرد لەو دوا شەوەی گەشتەکەیاندا تەشکە بەرێک لەو تەونەیدا بچنی کە چەند ڕۆژو چەند شەوێکە لە ئەندێشەی پاکی خۆیدا دایمەزراند بوو، ئەو بیریکردەوە: ئەمشەوە کۆتا شەوە، دوا دەرفەتیشە، دڵنیاشم باپیرانم نزاکانمیان گەیاندووە وخوداش نووسیویەتی. ئەو دڵنیابوونەی زیاتر ڕشتی کرد بۆ ئەوەی دەرگای دڵی بۆ مەلای بکاتەوە: من و تۆ ئەوەندە تێکەڵاو بووینە پێکەنین و گریانەکانمان بووینە بە یەک، کەچی تۆ ئاگات لەخۆت نییە، بە پێوە نووستووی و نازانی بۆ کوێ دەڕۆی، بۆ هەر کوێ بڕۆی ناتوانی لە دەست خۆت ڕابکەی،تۆ بە حەق و ناحەق خۆت

سەرکۆنە و تاوانبار مەکە، بەبیری تۆڵەسەندنەوە ناخی خۆت مەسووتێنە، خوێن بەخوێن پاک نابێتەوە، هاوسەرە ڕەحمەتییەکەم دەیگوت- مەلا ئەوەندە زیرەکە موو لە ڕۆن دەردەهێنێ-منیش دەمەوێ بە قەد زیرەکییەکەت بوێر بی، یا بوێرییەکەشت بە قەد خۆشەویستییەکەی من بێت،تۆ دەتوانی ژیانی خۆت لەسەر وێرانەی من و کەلاوەی خۆت سەر لە نوێ بنیات بنێیەوە، دڵنیاشم لە کۆتایی چیرۆکەکەماندا ناهێڵی خەم بخۆم.
مەلا هەستە بەنجبووەکەی سەر لە نوێ جوولەی تێکەوتەوە، پڕ بە چاوی سەیری (فەتحییە) ی کرد: نەتۆ وێرانەو نەمن ڕووخاو، ژیانێکی نوێ دەستپێدەکەین، چیرۆکێکی خەمڕەوێن دەنووسینەوە، دوو دەسکە گوڵی بۆن خۆش دەچێنین، یەکێکیان لە سەر گۆڕی خۆشەویستەکەی من، ئەوی دیش لەسەر ئەوەی تۆ..مەلا بۆ لای خەوگەی هەردوو منداڵەکە هەڵکشا لای سەرەوە، لێفی سە ڕوخساری هەردووکیانی لادا، سەرو ماچی لە ناوچەوانی کردن، بە ئاگا هاتن سەیری مەلایان کرد، دیسان ماچی کردنەوە و بۆنیشی کردن.فەتحییە سەیری منداڵەکانی کرد، بە قورگی پڕ لە گریانی خۆشی هەردوو منداڵەکەی هاندا: دەی کوڕەکەم کچەکەم باوکتان ماچ بکەن.
پێنج ڕۆژو چوار شەوی نەهاتنەوەی مەلای، لای کارۆ پێنج ساڵ وچوارمانگی زیندانییە سیاسییەکانی نوگرە سەلمان بوو، لەنێوان هەر کاتژمێرێک و دوو کاتژمێردا دەرگای دەرەوەی مزگەوتی دەکردەوەو سەیری ناو شەقام و ئەملاو ئەولای مزگەوتی دەکرد: هەرکە جامە ماستە بە سەر تووەکەمان بۆهات دەمزانی مووێکی تێدایە، هەر موو؟ وابزانم لە مووی ئەستوورتری تێدایە، دەمگۆ ئەوهەموو پڵاوو یاپراغ و فروجاوە لە کوێ دێ و بۆچی دێ، توومەز هەمووی لە ماڵی ئەو بێوەژنەی دەهات. مەلا زۆرزانن، کری بن برن ناهێڵن کەس تێیان بگات،هەر یەکێکی دی وای بکردبوایە لە دوایدا دەبووە واتە وات. وەک ئەو باڵندانەی بە دوای (دان) دا دەگەڕێن،بەناو حەوشەی مزگەوتدا دانەدۆزەی بوو هیچی نە دەدۆزییەوە: لەوەتی مەلا ڕۆیشتووە نەکەسێک بەلامدا تێدەپەڕێ و نە نانێکیشم لەبۆ دەهێنن، کار وا بڕوا لەبرسانیش دەمرم. بەنائومێدی دەچووەوە ژوورەکەی خۆی: تازە مەلام لەدەست چوو، ئەو هێلانەی خۆی لە ماڵی ئەو بێوەژنەی خۆشکردو هێلکەشی تێدا دانا، هەر ماوە بیکاتە فەرخە.

## ١٢

هەروەک چۆن مەی لە سەری سەرخۆشان دەبێتە هەڵم، ئەو شەوەش بووە هەڵم و ڕۆیشت. شەبەقی بەیان هەناسەی دا بوو، دزو ڕێگرو حەسحەس و پشیلەو سەگە بەرەڵلاکان خەریک بوو بنوون، بەغداش کەوتبووە ناو دەریای خەونەکانی، ئەو باڵەخانە بەرزانەی سەریان لە کەشکەلانی فەلەک دەدا، ئاسمانیان لەبەر چاوان کردبووە هێلیکی سەوزی باریک و بەسەر پانتایی شەقامەکاندا درێژ دەبوونەوە کارۆ ملی ڕێگای هات و نەهاتی گرت، وەکو ئێسترێکی ڕەوهانی خۆشڕۆ بە پێڵاوە نوێیەکەی مەلای- کە پێشکەشی کرد بوو- زەوی دەکوتا. بەرە بەرە دوور دەکەوتەوە و لە پێچە پێچی کۆڵان و شەقامەکان و پەنای باڵەخانەکاندا بە هیوای زوو گەیشتنی بە شالوولەکەی دەتوایەوە. گەیشتبووە ئەو لقە شەقامەی بە پێش ماڵی ئیبتیسام دا دەڕۆیشت، کە دوای پەنجا مەترێک ئەو لقە شەقامە دەبووە دوو لقۆکە و هەر یەکەیان بە لایەکدا کێل دەبووەوە. بە مەزەندەی خۆی چل تا پەنجا هەنگاوێکی ما بوو لە دەرگای ماڵی ئیبتیسام بدات. زرتەیەکی سمێل بابڕی قۆل و باسک هەڵکراوی لێ پەیدا بوو، لە لقۆکەیەکی شەقامەکەدا بەرەو ڕووی دەهات. دەستێکی لە پشتەوە گرتبوو بە دەستەکەی دیکەشی سمێلە فشەکەی بەرز کردەوە و فیکەیەکی پێ لێدا. کارۆ ترسێکی لێ نیشت: یا ئەڵلا هێشتا خێرو شەڕ بەشنەکرانە ئەو بڕە بەرازە لە کوێ پەیدا بوو، پێدەچی سفتاحی بەم دەموچاوەی بکەمەوە، دەی ئەگەر هەر ئەوە بێ هیچ نییە. یەک دوو هەنگا و چووە پێش بە بیری هاتەوە: لەوانەیە ئەوە یەکێک بێ لەو شەقاوانەی ئیبتیسام باسی دەکردن.

کۆڵە مستێکی لە کەللەی خۆیدا: ئای دەبەنگ چەند بێ مێشکی. شەپقەو چاویلکەکەت بۆچی لە بیرکرد. کە سەری بەرزکردەوەو چاوی بە هەر چوار لای خۆیدا گێڕا، چی دیت؟ نەک هەر سمێل بابڕێک، سێ چەقۆکێش سێپێکێکیان بە دەوریدا دروستکردبوو دەیانویست بە قنارەیەوە بکەن. ئەو خۆی چەترە فیلێک بوو کەس تەن بە تەن باری نەدەبرد، گەنجێکی چوارشانەی تەبەش پانی ملەوەز بوو. ئەگەر مووی پرچ و سمێل و ڕدین و سەرسینگ و هەموو شوێنەکانی جەستەت کۆبکردبوایەوە و بترپستبوایە، گلۆرە

مووێکی کشتی تێدەکەوت، دەست وەشێن بوو نەک گەمە مستی لە هەر کێ بدابوایە دەیمراند- ئەگەر لێم بە عەیب نەگرن دەڵێم دە یتڕاند- ئەو پێی وا بوو دەست بە خۆدا شۆڕکردنەوە لە بۆ پیاوان نەهاتییە و نەنگییە.
ئەو لە گەڵ خۆیدا دەدواو دەیگۆ: با سێ نەبن بیست بن، پیاو یەک جار دەمری، ئەو جارەش با بە مەردی بمری، بەڵێ ئەو لەو جۆرە پیاوانە بوو. زیا تر لێی نزیک بوونەوە، یەکێکیان بە سەریدا قیژا ندی: هێی هێستر، تەماشای سەرو کەللەو گوێلاکی خۆت کردییە، ئەوە چاند ڕۆژە لە کوێ بووی، بە ئاسانی و بە پێی خۆت هاتیەوە بەر دەستمان.
یەکێکی دیکەیان بە سەریدا مراندی: هێی بزن، دەچی نانی شوانی دەخۆی؟ نەتزانی ئەجەلت هاتیەو بەم دوو دەستەی من وەکو بزنی گۆشاگۆش سەردەبڕێی.
سێیەمیان نەڕا ندی: هێی مشک، لە بەر چاوی ژنان خۆت فش کردبووەوە و ببوویە پشیلە، گەمەی پشیلەو مشکانێت بە عەماشی برا گچکەم کردبوو؟ ئێستا دەبینی چۆن وەکو مشکی تۆپیو کەورت دەکەم.
کارۆ دەستوەشێنێکی ئازا بوو، ئەگەرچی زانی تازە کار لە کار ترازاوە و تێوەگلاوە، بەڵام لەو چرکە ساتەشدا هێشتا پشوو درێژ بوو، بە ناچاری خۆی دڵنیا دەکردەوە: ناورانەوە و پاڕانەوە دادم نادەن و ئەوانە ڕشتتر دەبن، دەست بە خۆدا شۆڕکردنەوەش پیاوی لە پیاوەتی دێخی، چارە هەر ئەوەیە دەستوەکەری بکەم، بەڵام هەتا پێم بکرێ خۆم دەگنخێنم، ئەوە خوایە بەڵکو ئیبتیسام لەو وەختەی دەرگا بکاتەوەو ئەو بەرەنگاربوونەوەیەم ببینی.
ئەفەندییەکی سیدارە لە سەرو، پیاوێکی دیشداشە لەبەری عەگال لە سەر دەیانویست بەوێدا تێپەڕن، بەڵام ئەو دیمەنە نابەرامبەرەیان بینی حەپەسان، لە هەمان کاتیشدا ترسان، ترسان لەوەی نەوەک ببنە ناوبژیوان و لە ناوبژیوانیشدا ڕێگرەکان بیاندەنە بەرچەقۆیان و بریندایان بکەن، ترسان لەوەی ئەگەر لە دادگا ڕاستی بڵێن سبەی دووسبەی ئەو چەقۆکێشانە لێیان خۆش نەبن و بیا نکوژن، ترسان لەوەی نەوەک بکرێنە شایەد، مەحکەمەو مەحکەمەکاری حکومەتیش درێژە بکێشێ و نەبڕێتەوە، لە نێوان خۆیاندا کردیانە ڕاوێژو گفت و گۆ:

سیداره لە سەرەکە لە دیشداشە لە بەرەکەی پرسی: وایە دەڵێن حکومەت کەروێشکی بە عەرەبانەی دەگری؟
دیشداشەلە بەرەکە بە پێدا گرییەوە لایەنگیری ئەو قسەیەی کرد: بەڵێ هیچی حکومەت ڕاست نەبی ئەوەی ڕاستە.
چۆن !؟سیداره لە سەرەکە بە سەر سوڕمانەوە لە دیشداشە لە بەرەکەی پرسی.
دیشداشە لەبەرەکە وەڵامی سیداره لە سەرەکەی دایەوە: کەروێشک ئاژەڵێکی بەستەزمانە، هەر کەسێک پێی دەگیرێ.
سیداره لە سەرەکە بە دیشداشە لە بەرەکەی گوت: بەڵێ حکومەتیش تەنیا کەروێشکی پێدەگیرێ، حکومەت با بچی ئاژەڵە درندەکان بگری. بێگومان پێی ناگیرێن
نەک بە عەرەبانە، بە ئوتومبێل و فرۆکەش پێی ناگیرێن..دیشداشە لە بەرەکە سیداره لە سەرەکەی دڵنیا کردەوە.
هەردووکیان سەیری یەکدییان کرد و بە یەکدییان گوت:برا با داومان لە داوی حکومەت نە ئاڵێ، حکومەت چیرەی درێژە.
بایاندایەوە و بەلاڕێدا ڕۆیشتن، بەڵام لە منگە منگ و پرتە پرتی خۆیان هەر بەردەوام بوون، دیشداشە لەبەرەکە بە عەگال لەسەرەکەی گوت:دیسان شەقاوە و کەللەچیەکانن، سەگە بەرەلّلاکان خۆیان لە پەنا دیوارو کەلاوان شاردۆتەوە، کەچی ئەوانە هێشتا بێ ترس ئەم گەڕەکەیان لە زەواق نایە، شەو نییە بەزمێک نەنێنەوە، کەس لە سەرو ماڵی خۆی ئەمین نییە، فەرموو ئەوە خۆریش بە قەد بەژنی من سەری دەرهێنایە ئەوان هێشتا لێرە جرت و فرتییان، بەستەزمانێکی وەکو ئەمە بێ چەک و بێ پشت بە داوێوە دەبێ و دەستیان بە بنی باخەڵیدا دەینن و چەند شاپێکی تەڕیشی لێدەدەن. ئەوی دی قسەکەی لێ وەرگرتەوە و گوتی: یاخوا هەر بە پارەکەی و شاپان لێی بگەڕێن، دەبی سوپاسیشیان بکا. شار بەرللایە نەکەسێک لێیان دەپێچێتەوە و نەڕۆژێکیش دەیانگرن، منیش بم ئەگەر ویژدانم لە بنی پێی خۆم بنێم و لە کەس نەترسێم هەر وا دەکەم. ئەوی دیش قسەکەی لەوی وەرگرتەوە و درێژەی پێدا: شاری چی؟ بچی لە گوندێک دابنیشی ئەگەر لە برسانیش بمری گەلێک لەو ترس و تۆقاندنەی

چاکتـره.
هەردووکیـان چەنـد مەتریـک ڕۆیشـتن و بـە کۆلانێکـدا بایاندایـەوە، لـەو سـەری کۆلانەکـە دوو پۆلیـس خۆیـان لـە نـاو پالتۆکانیـان لوولـدا بـوو، بـە جۆرێـک چووبوونـە پـاڵ یەکدی و کورژەیـان کردبوو، هەتـا زۆر لێیـان نزیـک نەبوویتایـەوە نەتدەزانـی دووانـن. کـە ئـەوان لێیـان نزیـک بوونـەوە، پۆلیسـەکانیش هەردووکیـان وەکـو مـاری سـڕ گەرماییەکیـان گەیانـدە خۆیـان و جوولەیەکیـان تێکـەوت، پالتۆکانیـان کـردەوە هەریەکـەو سـەرو تفەنگـی حوسـکەیان بـە تونـدی بـە دەسـتەوە گرتبـوو، دیـار بـوو چاوەڕێـی دومانەکانیـان دەکـرد بێـن نۆبەتەکەیـان لێـوەر بگـرن. هـەردوو پیـاوە سـیدارە لەسـەرو دیشداشـە لەبـەر خۆیـان لەبیـر کـرد چوونـە لایـان سـڵاویان لەهـەردوو پۆلیسـەکە کرد:بەیانیتـان بـاش،
_ باشتر، باشتر.. زۆر بەبێ زەوقی وەڵامی سڵاوەکەیان دایەوە.
بـە پەلـە هـەردوو پۆلیسـیان تێگەیانـد: کاکـی پۆلیـس، چەندچەتـە و ڕێگـری چەقۆکێـش ڕێیـان لـە گەنجێکـی هـەژار گرتـووە و دەوریـان داوە، ئەگـەر زوو نەیگەنـێ ڕووتـی دەکەنـەوەو لەوانەشـە بیکـوژن.
_ عا یدی ئێمە نییە.. هەردوو پۆلیسەکە بەبێ ئەوەی خۆیان بجوولێنن.
_ ئەدی عایدی کێیە؟ خۆ تەنیا سی چل هەنگاوێک لە ئێوە دوورن.
_ نازانین عایدی کێیە، بڕۆن بۆ خۆتان بیاندۆزنەوە.
هـەردوو پیـاوەکان ناچـار لـە تەشـکی خۆیانـدا و ڕۆیشـتن:دەیەللا خـۆ ئـەوەی لەسـەرمان بـوو کردمـان -بـە یەکدییـان دەگـوت- پیـاوی حکومەتمـان تێگەیانـد ئەگـەر ئـەوان هیـچ نەکـەن بـە ئێمـە چـی دەکـرێ.
کـە ئـەوان لـە بـەر چـاوان ونبـوون هـەردوو پۆلیسـەکەش کردیانـە مشـتومڕ. یەکێکیـان بـەوی دیکـەی دەگـوت: درۆمـان کـرد گوتمـان عایـدی ئێمـە نییە،هەسـتە بـا تفەنگەکانمـان سـوار بکەیـن و بـە پەنـادزە بـۆ دزەکان بچیـن، چـوار دەوریـان بگریـن و ئـەوەی بـە دەسـتیان دەکەوێـت، برابـەش لەگەڵیـان دابـەش بکەین. ئـەوی دیکـەش بـە تووڕیـی بـەوی دەگوت:بـۆ هەنـدە کـەری، گوێـت لـێ نەبـوو ئـەو دوو پیـاوە دەیانگـوت نێچیرەکـە هـەژارە، لـە هەژارێـک چیمـان دەسـتدەکەوێت هەتـا لـە گەڵیانـدا نیـوەی بکەیـن.
ئـەو دیسـان بـەوی دی دەگـوت: بەخـوا کابـرا یەکـی زەغەلـی کاسـبیەکی ئاسانیشـت پـێ ناکـرێ، هەسـتە بـا بچیـن خـۆ هیـچ زەرەر ناکەیـن. هـەر هیـچ

نەبێ بای پاکەتێک جغارەمان دەستدەکەوێ.
مشتومڕەکەیان بووە شەڕە قسە، شەڕە قسەش بووە شەڕە جوێن و شەڕە مست، لە یەکدی زوێر بوون و هەر یەکەو بە لایەکدا ئەوێیان بەجێهێشت.
کارۆ لە نێوان هەرسێ ڕێگرەکاندا فرتکەیەکی دایە خۆی و پشتی بە دیوارەوە نووساند: پیاو ئەگەر پشتی قایم بێ لەپێشە خۆی بێ منەت دەبێ..کە بە تەواوی لەگەڵ دیوارەکە بزمار ڕێژ بوو، دڵنیاش بوو کەس ناتوانی لە پشتەوەڕا زەفەری پێببا، چاوی لە چاویان نا، بۆ ئامۆژگاریکردنیان و لە هەمان کاتیشدا چاو شکاندنیان بەسەر هەرسێکیاندا هاواری کرد: هێی دەو پیسینە، دەوولەوسی خۆتان دیوە؟ ئەگەر تۆزێک غیرەتتان هەیە بە سێ کەسان دەورەم نادەن، ئەگەر پیاون هەر یەکەو بە تەنها لەبۆم وەرنە مەیدانێ، بەڵام کوا ئەو غیرەتەی مەیدانخوازیەتان. غیرەت لە دەماری پیاواندا هەیە نەک لە دەمارە شل و خاوەکانی ئێوە. دەغەرینە پێتان وایە باری من دەبەن هەریەکەتان بای چەپەرۆکێکی منە، نەک سێ ئەگەر هەموو ئەو خوڕی و تۆڕیانەی لەو شارە دا وەکو خۆتانن کۆیان بکەنەوە لێتان ناترسم، ئەگەر دانەسەکنێن- چەند حیزە دزو خوڕییە ڕێگرو چەتەی ترسنۆکی ئەم شارەیان لە زەواق نایە-تەمبێیان دەکەم، ئێوەش هەرچی خواردیتتان هەمووتان پێ دەتفێنمەوە، تۆتان دەبڕمەوەو ناهێڵم جارێکی دیکە لەو ناوە شین ببنەوە. لە بۆ خوای پێتان دەڵێم، کەیفی خۆتانە خوێنتان لەسەرە خۆتانە، من ڕێم لە ئێوە نەگرتییە ئێوە بەرۆکی منتان گرتییە، جوانکەنە بە دەستی من خۆتان جوانە مەرگ مەکەن، ڕێم بەردەن با زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە. ئەگەر پێتان وایە ئەوە قومارێکە دەیکەن یا دەردەچن یان تێدەچن، ئەوە دڵنیا بن لە بەرامبەر پاڵەوانێکی وەک من هەر تێدەچن، مایەو سەرمایەکانیشتان دەدۆڕێنن و بە دەست بەتاڵی و مایە پووچ دەردەچن، من لە گەجەرو گوجەری ئەم شارە نیم، خۆتان بیر بکەنەوە بزانن لە کوێوە هاتووم.. ئەوانیش هەرچەندە دەمهەراشی و هەڕو گیفیان دەکرد ئەو هەر باکی نەبوو، بەو هەڕەشەو گوڕەشانەی ئەوان شێلووش نەدەبوو، دەروونی پاک و ئارام بە قەد گەردیلەیەک ترسی نەبوو، بەڵام سەرەڕای چاونەترسییەکەی ئەویش مرۆڤە، مرۆڤیش دەمارو خوێن و دڵ و مێشک و کەللەی هەیە، لە هەر ڕووداوو میحنەتێکدا بیر دەکاتەوە، ئەویش

بیری کردەوە: ئەم چەنە درێژانە هی ئەوەی نینە چاوڕاوم لێبکەن، بەس چی بکەم چەقۆیان پێیە دەترسم هەر سێکیان پێکەوە تاوم بدەنێ و لە جێی کارێم گیر بکەن، زەبلوق و ترتڕۆکم پێکەوە بپسێنن و تەرس و گووم بە گۆڕێ وەربکەن، ئەو وەختە دەبمە خۆراکی سیسارکە کەچەڵ و قەلەڕەشکان، باشتر وایە چۆن ئەوان بە یەک یەک دەیانترساندم منیش بە هەمان شێوازی خۆیان ڕوویان تێبکەم. پەنجەی لە یەکێکیان هەڵشەقاند: هێی مریشک، بێم وەکو کەلەشێر بە سەرتدا دەفسم و جیقنە سپیلکەت پێدەکەم. ڕووی لەوی دیکە کرد: هێی ماکەر، بێم وەکو کەرێ شین کلکت بەرز دەکەمەوەو سواری پشتت دەبم. دەستی بۆ سێیەمیان درێژ کرد: هێی چاو حیز، ئەوەی دزی بکا حیزیش دەکا، داخوا لە چ ناو کەندو کەلاوەیەکیان هێنایەوە، هاتی ڕێگەت لە من گرتییە بە تەمای خۆت لە سەرە من ئازا بکەی، گوایە برای (عەماش)ی کوڕی تەڕەماشی، دەبێ وات لێبکەم وەکو براکەت خۆت لەسەر قونان ڕانەگری.

ئەو براگەورەیەی (عەماش)ی غیرەت لە دەمارەکانیدا جوولا. هەموو هێزی خۆی کۆکردەوەو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی چەقۆیەکی لە سینگوڕکی بدا. کارۆ وەکو بروسک چەخماخەیدا،وەکو گەوارە نەعرەتەی دا، بەوقۆندەرە قایشە ڕەقانەی لە پێی دابوون،شاپێکی ئەوهای خێواندە هەناوی، پشتاو پشت بە لێواری شۆستەو پێڕێیەکەی دادا و تریقەی پشتی چریکاندی، لە گەڵ کەوتنەکەی ڕێگرەکە چەقۆیەکەی دەستیشی کەوتە سەر زەوی. کارۆ بۆ هەڵگرتنەوەی چەقۆیەکە داوەرایەوە. چەتەی دووەم تا هێزی تێدابوو چەقۆیەکی لە ناو شانی کارۆ ی داو خوێن قیچقەی کرد. هەر ئەو چەتەیە پێی وابوو کارۆ پرزەی بڕاو زاخی ئەوەی نەما دەست بوەشێنی، ویستی چەقۆیەکی دیکەش لە شان و پیلەکەی دیکەی بدات، بەڵام ئەو نەیکردە نامەردی پێلەقەیەکی وای لە هەناوی دا بەسەر کەلاکی یەکەمی داداو زیرەی گەیاندە ئاسمان، چەقۆکەشی کەوتە سەر زەوی. کارۆ ئەمجارە بە پەلە بیری کردەوە: بۆ بەرگریکردن چەقۆیەکم بەسە با ئەم چەتەیەی بەساغی ماوەتەوە هەڵیبگرێتەوە، هەر ئەو خۆی بۆ بچەمێنێتەوە دەیدەمە بەر شاپان و بەسەر ئەو دوو کەلاکەیدا دەدەم.. تا دەهات کارۆ ئەولا شانەی دەکەوت کە چەقۆکەی بەر کەوتبوو، چۆڕاوگەی خوێنیش گەیشتبووە ناو

پێڵاوەکەی، چارەشی نەبوو دەبوایە زۆرانبازی مان و نەمان لەگەڵ چەتەی سێیەمیش بکا. چەتەی سێیەم لەوانی دیکە بوودەلەتر بوو، بەڵام زۆرزانتر بوو، ئەویش بای خۆی دەیزانی و بیری دەکردەوە: ئەم پیاوە هەر چەندە خوێنی لەبەر دەڕواو هێزی پێشتری نەماوە- چەتەی سێیەم بە خۆی دەگوت- بەڵام هێشتا زۆر بەهێزە،چەقۆیەکیشی کەوتۆتە دەست دەتوانی شەڕە چەقۆم لەگەڵدا بکا، چەقۆیەکەم بەرکەوێت و بکەومە سەر ئەم دوو کەلاکە هەرسێکمان لێرە کەلەپچە دەکرێین، کێ دەڵێ ئەمجارە ناکەوینە بەر دەستی ئەفسەرێکی کەللەڕەق، لەوانەیە بەرتیل و مەرتیل کاری لێنەکا و هەموو پۆخلەواتەکانمان یەک لە دوای یەک ئاشکرا بکا.

تیشکی خۆر هەموو سەرتیلەو سەر سواندەی خانووەکانی رووناک کردبووەوە، هەندێ لەو تیشکانەش بەر بەڕۆژکی بەردەمی خانووەکانیان گەرم کردبوو، خەڵک پەیتا پەیتاو یەک لە دوای یەکدی بۆ خۆگەرمکردنەوەیان بۆ بەر دەم بەڕۆژکی ئەو خۆرەتاوەدەهاتنە دەرەوەو چاویان بەو پالەوانبازییە نابەرامبەرە دەکەوت سەیریان پێدەهات.

ئیبتیسام سەرمێزی ناو ئاشخانەکەی بە جۆرەها خواردنی بەتام رازاندبووەوە، دوو گوڵدانی پڕ گوڵی ڕەنگاوڕەنگی بۆنخۆشیشی لەم سەرو لەو سەری مێزەکە دانا بوو، چەند کورسییەکیشی بە هەر چوار دەوریدا بە ڕێکی ریزکردبوو، دەرگای ئاشخانەکەشی- کە بەرامبەر دەرگای گەورەی دەرەوە بوو - خستبوویە سەر پشت. گوێ و چاوەکانیشی لە جیاتی دوو دوو کردبوونی بە چوار چوار، لەگەڵ شەقە شەقی پێیەکانی هەر جۆتە ولاغێک ئەگەر دووریش بووایە وایدەزانی ئەوە، هەنووکە نا ئێستا لە دەرگا دەدا. دەم نا دەمیش دڵی دەلەرزی: ئەو کوڕە چەند ڕۆژە دیار نییە تیق و سیقی پێکردم، دەبێ چی بەسەر هاتبێ، دەترسم لە رێگا ڕووداوێک ڕوویدابێ. سەرکۆنەی خۆی دەکرد: خوا نەکا هیچ ڕوویدابێ. تۆزێک هێور دەبووەوە: لەوانەیە مەلا بە کارێک ڕەوانەی لایەکی کردبێ. دەتگۆ بەرەژانی گرتییە ئێستا نا دووخولەکی دیکە مەلۆتکەکەی دادەنێ. هەڵدەستاو دادەنیشتەوە، لەم سەرو لەو سەری مێزەکە جێگۆڕکێی دەکرد، لە نێوان ئاشخانەو دالانی ژوورەوەو باخچەکە پێی تێکدەئاڵاو بەر چاوی ڕەش دەبوو: یا حافیز ئەم شەوە هەر قەساب و قەسابخانەم لە خەوێ دەدیت، چەقۆیان بە دەستەوە

گرتبــوو کەوتبوونــە دوای بەرانێکــی دونــگ گەورە.خودایــە هــەر بەڵایــەک هەیــە لێمــان دووری بخەیــەوە و بــە خێــری بگێــڕی. هــەر بــە خۆشــی دڵــی خــۆی دەدایــەوە: بــاش بــوو بەرانەکەیــان پــێ نەگیــرا بــە ئــاگا هاتــم.
لــە پــڕ زاک و زرووکــی ژن و منــداڵان و فیقــە فیقــی هۆڕنــی تیــژی ئۆتۆمۆبێلــی پۆلیســی فریاکەوتــن، دڵــی (ئیبتیســام)یان داخورپانــد، هــەر وەختبــوو پەراســووەکانی کــون بــکا و دەرپــەڕێ، هــەر بــە غــار دەرگای دەرەوەی کــردەوە، ســەیری ئەمــلا و ئــەولای کــرد، چــی دیــت؟ چــی خراپــە ئــەوەی دیــت: ئــای کــۆرە بــم خەونەکــەم ڕاســت دەرچــوو. هیــوای ئــەوەی خواســت زەوی قوتــی بــدا، نــەک ئــەو دیمەنــە قیزەونــە ببینــی. هــەر پێیەکــی کــردە دوو، کــردە چــوار، کــردە هەشــت، باڵــی نەبــوو ئەگــەر نــا دەفــڕی. زۆر نزیــک بــووەوە ڕوومەتــی خــۆی دارنــی: وەلــلا دەق هــەوە دەمزانــی ڕۆژمــان بــەم ڕۆژەی دەگا، هــەر جارێــک دەرگای دەرەوەم بکردبووایــەوەو ســەرێکم لــە دەرەوە هەڵبکێشــابووایە دەمدیــت، دەمکــردە زرووک و هــۆڕو خەڵکــم لــێ بــە ئــاگا دەهێنــاو نەمدەهێشــت ئەوهــای لێبێــت.
شــان و پیلــی هەتــا دەگاتــە ســەری پەنجەکانــی جوولەیــان تێــدا نەمابــوو، لاڕانــی ڕاستەشــی لــە بــێ ئاگایــی چەقۆیەکــی پێکەوتبــوو، ئەوەنــدە زۆر خوێنیشــی لەبــەر ڕۆیشــتبوو شــنگ و هێــزی لــە بــەر دا نەمابــوو.. هەرســێ دزو چەتــەو ڕێگرەکانیــش، هەریەکــە و بــە دووســێ شــاپان دەفــەی ســینگیان وەک خمخانــەو نــاو هەناویــان پــڕ خوێنــاو بــوو. نــە ئــەو هەڵپــەی پێدەکــرا نــە ئەوانیــش..
پۆلیــس گەیشــتنە ســەریان، هەرســێ چەتــەکان ویســتیان بــە قوونــە خشــکە و چەنگــۆران لــە نــاو خەڵکەکــە تێبچۆلێــن و خۆیــان بشــارنەوە، بــەڵام خەڵــک و پۆلیــس دەوریــان دان و ڕزگار نەبــوون.. مەئمــور مەرکەزێــک و چــواردە پۆلیــس ئــەو ناوەیــان داگیرکــرد. مەئمــور مەرکەزەکــە لــە خەڵکەکــەی پرســی: کــە ســتان یەکێــک لــەو پیاوانــە دەناســن؟
زۆربــەی خەڵکەکــە چەتەکانیــان دەناســی، بــەڵام لــە ترســی ســەرو مــاڵ و ناموســی خۆیــان کەســیان بــە بەڵــێ وەڵامیــان نەدایــەوە، تەنهــا (ئیبتیســام) نەبــێ، دەســتی بــۆ کارۆ درێــژ کــرد، نــاوی تــەواوو ناونیشــانیان بــە تــەواوی لێوەرگــرت. هــەر ئەویــش خــۆی کــردە خاوەنــی. ئیبتیســام لــە مــاوەی چەنــد خولەکێکــی کــەم جلەکانــی گــۆڕی و ســەفتەیەک پارەشــی خســتە نــاو جانتاکــەی

دەستی. دەرگای ژوورەکانی کلیل داو بە گەڵیان کەوت. وەک ئەوەی گایەکی لامل بەرە و کوشتارگە رابکێشن و ئەویش پێکۆڵێ بکا، یەکێک لە پێشەوە پەلی کارۆی گرتبوو رایدەکێشا، دووانیش لە پشتەوە پاڵیان پێوە دەنا و دەیانخستە ناو قەفەزی پیکابە سەوزەکە.
دەمگۆ و مقۆمقۆ و گۆتە گۆت لە ناو خەڵکی کۆلانەکە دەستیپیکرد، بە تایبەتی لە نێوان ژناندا، هەر یەکەو بە لایەکی دا دەبرد، ژنێک دەیگوت: بەچاوی خۆم بینیم ئەو پیاوە ملەستوورو نەقۆزرا و ناوچەوان پانە، سبەینەیەکی زوو لە ناو پەیتوونێکدا دابەزی و ئیبتیسام بە پەنا دزە رایکێشا ژوورەوە.. ژنێکی دیکەی دەمشڕ دەستی بۆ چاوی خۆی برد: بەو دوو چاوانە دیتم ئەو کابرایە لە ناو باخچەکەی ماڵی ئیبتیسام بە دەرپێیەکی خەزنەی سپی تەنک دەهات و دەچوو، ئەو ژنە چاو حیزەش لە دیاری راوەستابوو زەق زەق تەماشای دەکرد.
دەمدڕاوێکی دیکە سەری بردە بن گوێی هەردووکیان: ماڵم قەبری تەنگ و تارە، قەبریش پڕی مشک و مارە، درۆی لە بۆ بابیشم ناکەم، بەو دوو چاوانەی خۆم دیتم ئەو ژنە پیاو بازە، چاویلکەو شەپقەی مێردە رەحمەتییەکەی لەسەرو چاوی ئەو پیاوەی نا بوو، پێ بە پێ و دوو بە دوو پێکەوە دەهاتنە دەرەوە، لە دەرەوەش پەیتوونێکی لە بۆ گرت و رەوانی کرد.
ژنەی یەکەم لێی وەرگرتەوە: ئەدی خوشکم داخوا چەند شەو لە ماڵی خۆی خەواندوویەتی و پێکەوە رایان بواردییە، ئێمەش لە گوێی گادا نوستبووین.
ئەوەی دووەم لە یەکەمی وەرگرتەوە: با هەر لە پەنایان خۆی لەبەر بکا، دەڵێن- مانگا بە دزی کەل دەخوا بە ئاشکرا دەزێ- ئەوان هەرچەندە حیزە دزەیان کرد خودا سری هەڵماڵین.
ئەوەی سێیەمیان لە دووەکەی دی بە ژەهرتر بوو: هەموو قسەکانتان لە شەکری شیرینترن، بەڵام کێ ناڵێ ئەو سەر بە هەشە بە دزی خۆی لێ مارە کردییە، منیش ئەوە هەشت ساڵە لەسەر دەست و مستی خۆمم،نە دزە حیزی دەکەم، نە خۆشم لەبن زەلامی عالەمێ دەکەم.
ژنی یەکەم لەبەر دەمی دووەم هەڵزۆقیەوە: ئۆخەی وا مەڵێ وا مەڵێ، تۆش وەکو ئەو بێ دڵی خۆت نەکردییە، دەڵێن- گۆشت خۆر زۆرە هەر ناوی

گورگـی بـەدە- هـی خـۆت دامەپۆشـە و هـی خەڵکیـش بـە گـۆڕێ وەرکـەی، ئەوەنـدە بـە هەسـتم لـەو سـەری کۆڵانـێ تڕێـک بکـرێ گوێـم لێدەبـێ، فسـێک بکـرێ بۆنـی دەکـەم.
دووەم لە دەوی دایەوە:حەمشە لچەستوور تۆمەتمان پێ مەکە.
یەکـەم ڕشـت تـر بوو:تۆمەتـت پـێ دەکەم؟دیـارە دەتـەوێ لـە بنـی کـودی بـدەم، ئـەدی (عەلـلاوی) کێیـە، دۆسـتی منـە یـان هـی تـۆ، خـۆت دیتییـە دەڵێـی بـەری سـێڕێی.
دووەم گـڕی گـرت: هێـواش هێـواش، ئەگـەر مـن یەکێکـم هەبـێ تـۆ دووانـت هەیـە، ئـەدی (چەفـات) و (مەندیـل) کێنە؟ئەگـەر بلێـی نـا زیاتریش دەژمێـرم.
ژنـی سـێیەم هاتـە نێوانیان:ڕاوەسـتن لـە یەکـدی مـەدەن خۆتـان دیتیـە دەڵێـی دەعبـایێ، منـی ناسـک و نـازدار هـەزار پیـاو مەمنوونـی قۆندەرەمـە هـەر بـە پیاویشـیان نازانـم، مێـردی خـۆم هەیـە بـە کەسـی نـادەم.
هەردووەکـەی دیکـە پێکـەوە: تـەح تـەح چەنـد شـەریفە، درۆیەکـی وا بکـە کلـک و گوێـی هەبـێ، هەرکڕیـە بـا مێـردە بـێ ئاگایەکـەت بـە ئـاگا نێـت.
تیرێـک لـەم و توانجێـک لـەوی هەنـدەی نەبـرد بـووە چـراوە چـراوو فـلان بـردی و فیسـکە گای. دەستیان لـە تیتکـی یەکـدی نـاو ئاگایـان لـە وان بـڕا.
کارۆ وهەرسـێ دز و ڕێگـرو چەتەکانیـش بـە زنجیرکراوەیـی ڕەوانـەی نەخۆشـخانە کـران، کارۆ بـۆ قاوشـی نەشـتەرگەری و ئەوانیـش بـۆ قاوشـی هەنـاو. چەنـد پاسـەوانێکی پۆلیسیشـیان بـە سـەریانەوە دانـان.
سەردەسـتەی چەتـەکان پێیەکـی لـە دەرەوە و پێیەکیشـی لـە نـاوەوەی دەسـەڵات بـوو، لەگـەڵ ئەفسـەری ئـەو پۆلیسـخانەیە- دوو قـوون و یـەک دەرپـێ بوون- موویـان بەنێوانـدا نەدەچوو، شـەوان تـا درەنـگ پێکـەوە بـە بـاڕو یانەکانـدا دەگـەڕان و بـە پـارەی دزیـاری ئـەو چەتانـە دەیانخـواردەوە، ئەفسـەرو مەئمووری مەرکەزەکـە بـە پـارە کلکیـان لـە یەکـدی گرێـداو ڕووداوەکەیـان بـە دەمەقاڵێیەکی ئاسـایی دانا. دوای دوو ڕۆژ هەرسێ چەتـەکان ئازادکران، (کارۆ)ش بـە کەفالەتـی (ئیبتیسـام)ی ئـازاد کـرا بـەڵام لەبـەر ئـازاری قوولـی برینەکـەی لـە نەخۆشـخانەمایەوە، دوای دوو ڕۆژەکـەش بـۆ ئـەوەی ڕووداوەکـە دیـزە بـە دەرخۆنـە بکـەن، ئەویـان بـۆ نەخۆشـخانەیەکی دیکـە گواسـتەوە و تەبەلـەو جـۆری ڕووداوەکەشـیان گـۆڕی. ئیبتیسـام باشـترین پارێـزەری ئـەو شـارەی

بۆ بە کرێ گرت، چەندین جار سەردانی پۆلیسخانەکەو دادگای کرد و دادوەرەکانی تێگەیاند، زانی هیچی پێناکرێ ئەگەر ئەو سەد دینار بەرتیل بدات ئەوان دووسەد دینار دەدەن، چ زۆربوو پارەی دزو حیزی زۆریان هەبوو، چ جای ئەوەی دەسەڵات ئەو باندانەی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بە کاری دەهێنان و خەڵکی ڕەش و ڕووتی پێ دەترساندن.ناوی سەیرو شوناسی ساختەیان بۆ کردبوون و ئەدرێسی چەواشەکارییان بۆ نووسیبوون. شەپۆلەکانی درۆو دووڕوویی و ساختەیی، دەمو چاوی ئەو جۆرە پیاوانەی بە تەواوی شوشتبووەوە و ڕووی ڕاستەقینەیان شێوابوو.

ئیبتیسام هیچ کارێکی بەبێ پلان نەدەکرد، هیچ پلانێکیشی دانەدەنا ئەگەر سەرکەوتنی مسۆگەر نەبوایە،لەو ڕۆژە ڕەشەدا و لەو کاتە ناسکەدا ئەو پیلانی دادەڕشت، پلانی بۆ ئەو پیلانە دادەنا: باشترین دەرفەتە بۆ ئەوەی کارۆ و مەلای لە یەکدی دوور بخەمەوە، هەلێکی زێڕینە و کڕی هاتووە ئەو کارە بکەم. پێدەچێ ئەو مەلایە زۆر زۆرزان بێ، چۆن توانیویەتی کارۆ ی متووی خۆی بکا. هەندێک لە مەلای ئەوان و ئاخوندەکانی ئێمە دووڕووی یەک دراون، لە سەر پەنگرە ئاگری خەڵکانی ساویلکە شیوو چایەی خۆیان دێم دەکەن. تەمێکی خەم بە ناو چاوەکانیدا گەڕا، خەمی ئەوەی چۆن کارۆ لە مەلا ی بشارێتەوە و لە دەست باندە چەتەگەرییەکانیش ڕزگاری بکا. لە خەمی ئەوەدابوو چۆن بە یەکجاری لە کونی مزگەوت دەریبهێنێ. مێشک و هۆش و عەقلی دەخستە گەڕ، هەستی لەلێدانی دڵی دەگرت، بە چڕی بیری دەکردەوە: ئەو باندە دزو حیزانە هەموو شتێکیان لە دەست دێت، باشتر وایە لێرە ڕزگاری بکەم و بیبەمە لایەکی دی ئەوان پێی نەزانن، خۆم دکتۆرێکی بۆ دەدۆزمەوە ڕۆژانە بێتە لای و چارەی بکا، لەمەودوا دەزانم چۆن شەیتان دەتوانی بچێتە ناو ناخی مرۆڤ و چۆن هزرو دڵ و هەستی داگیر دەکات و دەیگۆڕی.. چەند جارێک بە ناو قاوشەکەدا گەڕا و سووڕا، نەرمە پیاسەیەکی بە ناو شاری بەغدا دا کرد. بیری چڕترو خەستترو تیژتر کردەوە: هەتا بە تەواوی چاک دەبێتەوە لە حەسارێک لە حەسارەکان چاوە خانووێکی بۆ بە کرێ دەگرم. بیری بە مرپەندێکی درێتر لە جاران سوی: دوکانێکم لە بازاڕی شێخ عومەر هەیە کرێچی تێدایە،کرێچیەکەی دەردەکەم کارۆ ی لەسەر دادەنێم. بۆ ئەو باشە لە

یەخـەی عەرەبانـە و کۆڵچیەتـی دەکەمـەوە، بـۆ منیـش کـۆنو شەشـە لـە کـوێ یەکێکـی وەکـو ئـەوم دەسـتدەکەوێ. ئـەو کـوڕە لەبـەر مـن ڕۆژی بـەو ڕۆژەی گەیشـت دەبـێ منیـش تۆڵـەی بـۆ بکەمـەوە. ئـەو ڕۆژە زۆر دەقرقـراو دڵـە راوکـێ گرتبـووی. وورەکانـی هێلکەدانـی بـە دەڵەمەیـی دەهاتنـە خـوارەوە. زۆر بـە پەلـە ئۆتۆمۆبێلێکـی تاکسـی بـە کـرێ گـرت و چـاوە خانووێکـی لـە حەسـارێک بـە ڕادان دا. حەسـارەکە زۆر فـراوان بـوو زیاتـر لـە هەشـت تـا دە ماڵـە هـەژاری تێـدا بـوو، چەنـد ژووریکیـش بەتـاڵ بـوون و هێشـتا بەکـرێ نەچووبـوون، ئـەو چـاوە خانـووەی لـەو حەسـارەی گرتبـوو لاچـەپ بـوو، کرێیەکـەی لەوانـی دیکـە گرانتـر بـوو، دەرگاو ڕێگـەی هاتوچـۆی جیـاواز بـوو بەسـەر ژوورەکانـی دیکـەوە نەبـوو، ئەگـەر بـە سـەردانی تایبەتـی نەبوایـە کـەس نەیدەزانـی لـە نـاو ئـەو ژوورەدا چـی ڕوودەدا. کرێچیەکانـی نـاو ئـەو حەسـارە زیاتـر لـە نیوەیـان کـورد بوون،هـەر یەکـەو بـە مەبەسـتێک ژوورێـک یـان دوو ژووری بـە کـرێ گرتبـوو، هـەر بۆیـەش کارۆ ی برد بـووە نـاو ئـەو حەسـارە ئەوێـی پـێ باشـتر بـوو. لەبەردەمـی هـەر ژوورێکـی ماڵـە کـوردەکان عەرەبانەیەکـی دەسـتی دانـدرا بـوو، پیـاوەکان یـان کـوڕە گەورەکانیـان بەیانیـان زوو بـە عەرەبانـەوە دەچوونـە بازاڕێـک لـە بازاڕەکانـی شـاری بەغـداو چەندیـن سـعات چاوەڕێـی کرێیەکیـان دەکـرد، ئەگـەر خـوا بیدابوایـە ئـەوە چ بـە کـۆڵ یـان بـە عەرەبانەکانیـان بـۆ خواپێداوەکانیـان دەگواسـتەوە.. منداڵـە نێرینەکانـی ئـەو ماڵانـەش بـە خۆیـان و بەچەنـد جۆتـە نەعلێـک و سـندووقێکی بۆیاغچیاتـی و یـەک دوو قۆدیـە بۆیـاغ لـە بەیانـی تاکـو ئێـوارە ئـەم بـازاڕو ئـەو بازاڕیـان دەکـرد، بـە بەردەمـی دوکانـەکان و بەنـاو چایخانـەو قاوەخانەکانـدا دەگـەڕان بـۆ ئـەوەی دوو لمـووز بـەرزی بـێ شـەرمی لـە خـوا نەتـرس، بـێ ئـەوەی ئەزیـەت بدەنـە خۆیـان و پێڵاوەکانیـان دابکەنـن، هەرجـارەی لاقێکیـان بـە پێـڵاوەوە دەخسـتە سـەر سـندووقەکە و ئـەو منداڵـە نەدارانـەش بـە ناچـاری دەچەمانـەوە و بۆیـان بۆیـاغ دەکـردن، ئافرەتەکانیشـیان بـێ کارنەبـوون، پینـەو پـەڕۆ بـۆ خۆیـان و بەدەسـتیش دروومانیـان بـۆ مـاڵان دەکـرد.

ئیبتیسـام پێـش ئـەوەی کارۆ لـە نەخۆشـخانە ڕزگار بـکا و بیهێنێتـە حەسـارەکە، دووسـێ فانیلـە و دەرپێـی کـورت و بیجامەیەکـی دروای نـوێ و سـۆلێکی قایـش و تەختەیەکـی نووسـتن و قـەدە نوینێکـی خاوێـن و تاقمـی تـراش و خـواردن

و خواردنەوەی بۆ هێنا بووە ناو ژوورەکە و دایناب‌وو. بە پەلە گەیشتە نەخۆشخانە بۆ ئەوەی بیگوازیتەوە ناو حەسارەکە، بەڵام کە گەیشتە ناو نەخۆشخانە حەپەسا، سەرەسوورەی گرت. چی دیت؟ دوو پۆلیس لەبەر دەرگای ئەو ژوورە نۆبەتیان گرتبوو کە کارۆی تێدابوو. ژنە ویستی بچێتە ژوورەوە، کەچی یەکێک لە پۆلیسەکان وەستاندی: خوشکم چوونە ژوورەوە قەدەغەیە.

_ بۆ؟ ئیبتیسام پرسی.

_ نازانم.. پۆلیسەکە گوتی.

_ ئەی کە نازانی بۆ لێرە وەستاوی؟ ئیبتیسام بە توورەیی پرسی.

_ بە فەرمانی دادوەر دەستبەسەر کراوە.. پۆلیسەکە وای گوت.

ئیبتیسام هەندێک پارەی دایە هەردوو پۆلیسەکە و ماوەی چەند خولەکێک مۆڵەتی لێوەرگرتن و خۆی گەیاندە ژوورەوە. کارۆ کەچاوی بە ئیبتیسام کەوت شاگەشکە بوو: چۆن ڕێیان پێدای بێیە ژوورەوە؟

_ هەرچۆنێ بێ ڕێیان پێدام، بەڵام تۆ ئازاد کرابووی بۆ پەشیمان بوونەوە؟ ئیبتیسام لە کارۆی پرسی،

کارۆ بە خەمبارییەوە، ئەوەی ڕووی دابوو بۆ ئیبتیسام ی گێڕایەوە:پێش نیوەڕۆی ئەمڕۆ، ئەو دوو پۆلیسەی لەبەر دەرگای ژوورەکەم وەستاون، هاتن منیان بردە بنکەیەکی پۆلیس، لەوێ لێکۆڵینەوەیەکی چڕو پڕیان لەگەڵدا کردم، هەر لەوێ پێیان ڕاگەیاندم پەڕاوگەو فایلی منیان ڕەوانەی لایەنە ڕەسمیەکانی شاری هەولێر کردووە، دەبێ چەند ڕۆژێک لەژێر چاودێری دابم تاکو وەڵامەکەی دەگەڕێتەوە.

ئیبتیسام دڵی لەرزی، بەڵام خۆی بەم جۆرە نیشان نەدا، لێی پرسی: هیچ گومانێکی خراپت لە خۆت هەیە؟

_ بەڵێ هەیە.. کارۆ بەو وەڵامە زیاتر ئیبتیسام ی ترساند.

ئیبتیسام پرسی: چییە؟

کارۆ بە ترسەوە وەڵامی دایەوە: لە خزمەتی سەربازی هەڵاتووم، کەتەمەنم بووە (١٨) ساڵ، موختاری گوندی منی گەیاندە شوێنێک پێیان دەگوت (فەرمانگەی سەربازگری) هەر لەوێش یەکسەر گەیاندمیانە سەربازگەیەک. نزیکەی بیست ڕۆژ لەو سەربازگەیە مامەوە، هەموو بەیانیان بەر لەوەی

مەلای سبەینێ بانگ بدا، دەبوایە ڕدێنمان بتراشین، پۆستاڵمان بۆیاغ بکەین، پۆستاڵ چ پۆستاڵ، هەر تاکێکی چەندین کیلۆ قورس بوو.. دواتر دەبووە غارە غار و ڕیزگرتن بەدوای شۆربای نیسک و چەند دانەیەک سەموون.. عەریف عەلەڕەشێک هەبوو هێشتا تێرمان نەخواردبوو فیکەی لێدەدا، دەبوایە لەگەڵ یەکەم فیکە ڕیز بین، کە ڕیزیش دەبووین بۆ مەشق کردن بە (یەس) (یەم)بەرەو گۆڕەپانی مەشقکردنی دەبردین. مەشقکردنی چی و یەس یەمی چی؟ بەخوا من هیچیانم لە هیچیان جیا نەدەکردەوە، نەمدەزانی کامیان ڕاستەیەو کامیشیان چەپەیە، وامدەزانی گوێزم بۆ دەژمێری چونکە یەک پیت عەرەبیم نەدەزانی. هەر من وانەبووم، زۆر لەوانەی عەرەبییان نەدەزانی بە پێچەوانەی خەڵکەکە ڕەفتاریان دەکرد.. عەریف عەلەڕەش خوا لە ناوی ببا کوردیش بوو ئەلفازی بەکوردی نەدەگەڕا، سەریشی لێ دەشێواندین و گاڵتەشی پێدەکردین، جوێنی پێدەداین، بە چەندین شێوە سزای دەداین، پرچی سەرمان سفر دەتراشرا، (هەروەلە)ی پێدەکردین، جاری وا هەبوو چەند ڕۆژ لە حەپسێیان دەپەستاین. هەتا ئەو بیست ڕۆژەم تەواو کرد پیستم چووە دەباغخانەی.. دوای ئەو بیست ڕۆژە مۆڵەتیان پێداین و گەڕامەوە گوندی، هەر ئەو مۆڵەت و گەڕانەوەیە بوو، ئیتر هەیبڕ هەیبڕ پێم لە عەسکەری نەدایەوە و نەگەڕامەوە سەربازگەکە. بەڵام حاڵم بووە حاڵی کسۆکی بن کوندەڵانان، دەبوایە خۆم بشارمەوە نەوەک موختار بەگرتنم بدا.

ئیبتیسام لە کارۆی پرسی: باوکت نەیدەتوانی چارەیەکت بکات؟

کارۆ بۆ دایکی پاڕایەوە، نەک باوکی: خوا هەڵناگری هەموو ڕۆژێ دایکم بە باوکمی دەگوت: پیاوەکە چارەیەکی ئەو کوڕەی بکە، هەندێ پارەی بۆ بە قەرز وەربگرە و بەو پارەیە لە حکومەتی بیکڕەوە، با چیدی خۆی لە کونان نەشارێتەوە، ئەویش بوویتە پیاوو کار دەکات و قەردەکە دەداتەوە. باوکم نەیکردو نەیکرد هەتا ڕۆژمان بەو ڕۆژەی گەیشت.

## ١٣

ئیبتیسام کە زانی هۆکارێک بۆ ڕزگاربوونی هەیە، بێ ئەوەی پرسیارێکی دیکە بکات، یەکسەر هەیپای لێکرد و خۆی گەیاندە باشترین پارێزەری شاری بەغدا، بە دوورو درێژی باسی ئەو پرسەی بۆ کرد، پارێزەر بەڵێنی پێدا لەماوەی کەمتر لە (١٠)ڕۆژ چارەسەری بۆ بکات، ئیبتیسام پارەی کرێنەوەکەو هەندێک پێشەکیشی لەجیاتی دەستهەق پێیدا..لەلایەکی دیکەش لەڕێگەی بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکەو ئەفسەری پۆلیسی بنکەکە، هەوڵیدا کارۆ تاکو تەندروستی باش دەبێت بۆ ماوەیەکی دیکە لە نەخۆشخانە بمێنێتەوەو نەبردرێتە بەندیخانە.
سەرەڕای ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دەهاتنە بەردەمی، کەچی پارێزەر بەو پارە زۆرەی وەریگرتبوو هەمووی بەلاوە دەنان، هەروەک چۆن بەڵێنی دابوو، لەماوەی کەمتر لە (١٠) ڕۆژ دەفتەر خدمەی عەسکەری بەپڕکراوەیی بۆ ئیبتیسام هێنایەوە و فەرمانی دەستگیرکردنەکەشی هەڵوەشاندەوە.هەر ئەو ڕۆژەش ئیبتیسام کارۆی خەنی کرد، دەفتەری خدمەکەی بە پڕکراوەیی دایێ و لە نەخۆشخانەش دەریهێناو بردییە ناو حەسارەکە.
خۆرخەریک بوو لەپەنا خانووە بەرزەکان ماڵئاوایی لە خەڵکی شارەکە بکات. ئیبتیسام لە بەیانییەوە تا ئەو کاتە هەر بەدەوری ئەو کوڕەدا دەهات و دەچوو، چێشت و فراوینی بۆ هێنا بوو پێکەوە خواردبوویان، بۆ نانی ئێوارەش لە کەبابخانەکەی تەنیشت حەسارەکە دوو نەفەر کەبابی نایاب و تەڕەو میوەشی بۆ هێنابوو. ئەگەرچی ئەوە لە نێوانیاندا یەکلا نەببووەوە ئایا ئەو شەوە لەلای دەمێنێتەوە یان نا، بەڵام وای دانابوو ئەگەر بمێنێتەوە، خۆی نیو نەفەرو (کارۆ)ش نەفەرو نیوەکەی دی بخوات.
کارۆ نەک هەر لە بەرامبەر پێت و وشەو ڕستەکانی (ئیبتیسام) دا هەڕی لە بڕی دەرنەدەکرد، لە بەرامبەر گوزارشتەکانی ڕوخسارو چاوەکانیشیدا سەرەدەری دەرنەدەکرد. هێڵە ڕاست و چەپەکانی ڕوخساری (ئیبتیسام) بە هەموو زمانێک دەدوان، کەچی ئەو لە ئاستیاندا کەڕولاڵبوو. ژنە ئەو هەموو سۆزو میهرەبانییەی لە ناخیدا هەبوو هەمووی دەڕژاندە ناو چاوەکانی، کەچی ئەو وەک بەردێکی بێ زمان بێدەنگ بوو، تەماشای ڕوخساریت بکردبووایە-کە بە تەنکە سپیاوێک ئارایشی کردبوو- هەر بە لەپە کەرەیەکی سپی و

سـپێنەی هێلکەیەکـی دوو زەردێنـە دەچـوو، کەچـی ئـەو لـە ئاسـتی ئەمەشـیاندا چـاوی نەبـوو. ئیبتیسـام زیـرەک بـوو، سـەرەڕای ئـەوەی خوێندەوارییەکـی باشـی هەبـوو، لـە ئەکادیمیـای ژیانیشـدا فێـری زۆر شـت ببـوو، چاوەکانـی داخسـت و بووە دیلـی چەندیـن بیرۆکـەی جۆراوجـۆر: مـرۆڤ کـە دەرفەتـی بۆڕەخسا پێویستە بیقۆزێتـەوە نـەک دوای لەدەسـتدانی پەشـێمان بێتـەوە. زۆر گرنگـە مـرۆڤ بزانـی چۆن بەسـەر زامەکانیـدا بـاز بدا و شـەوە تاریکـەکان بکاتـە ڕۆژی ڕووناک، دەڵێـن - ژیـان ئەلبۆمـی وێنەکانـە، هـەر وێنەیـەک لـە وێنەکانیـش جـۆرە یادگارییەکـە، یادگارییەکانیـش بـە خۆشـی و ناخۆشـییەکانیانەوە بەشـێکن لـە ژیـان، بەشـێکن لـەو تەمەنـە کورتـەی بـە چـاو چوقانێکـدا کۆتایـی دێ. ئەگـەر ئـەو یادگارییـە شـیرین و تفت و تاڵانـە هـاوڕێ و هـاودەم و هـاو خەمـت نەبـن، نـە لێوەکانـت تامـی خەنـدە دەزانـن و نـە چاوەکانیشـت ملوانکـەی مـۆرووە ڕەنگاوڕەنگەکانـی گریانـی خـەم دەهۆننـەوە. بەڵـێ دەڵێـن- مرۆڤـە هۆشـمەندەکان دەڵێـن: دەبـێ لـە ڕێگـەی دەمارەکانتـەوە تەماشـای ژیـان بکـەی، دواتـر ئـەوەی لەنـاو دەمارەکانـە هەڵیـان بسـەنگێنی، شـەن و کەویـان بـۆ بکـەی، چەنـد پنتێکـی ناویـان وەربگـری، لـە ئەزموونگـەی ژیانـی خۆتـدا زانسـتانە بیـان پشـکنی، توێـکاری و شـیکارییان بـۆ بکـەی، ڕێـژەی خۆشەویسـتی- هێمنـی و ئارامـی- بەخشـندەیی- تـرس- شـەرم- ڕق و کینـە-تووڕەیـی لـە ناویانـدا دەربهێنـی، هەموویـان بـەراورد بکـەی، هاوسـەنگی وهاوتەباییـەک لـە نێوانیانـدا بڕەخسـێنی. زیادبوونـی ڕێـژەی هەرخەسـڵەتێک لـەو خەسـڵەتانەی بـە خراپیـان دەزانیـن نەخۆشـی نییـە، قوتدانـەوەی یـان خواردنـەوەی نەخۆشـییە، هەمومـان بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان دەترسـین یـان شـەرم دەکەیـن بـەڵام نکولـی لـەوە دەکەیـن ترسـنۆکین یـان شـەرمنین، ئەوەیـان نەخۆشـییە و پێویسـتی بـە چارەسـەرە. هەڵوەسـتەیەکی کـرد، چاوەکانـی هەموو کـون و کەلەبەری ژوورەکەیـان پشـکنی، نیگاکانـی کەوتنـە سـەر پەیکـەرە وشـکبووەکەی کارۆ، نیمچـە خەندەیەکـی بۆخـۆی کـرد و بـە خـۆی گـوت: ئـەو بـازووی بـە هێـزە و بەغیـرەت و ئازایـە، کـوڕی ڕۆژی تەنگانەیـە، ئـەوە خەسـڵەتێکی بۆماوەییـە، کلتـووری هەمـوو گوندنشـینەکانە، لـە چرکەسـاتی چەنگرەبازیـدا بیـر لـە ئاکامەکـەی ناکەنـەوە و فشـەیان پـێ دێـت، لێکـدان و یەکـدی کوشـتن لای ئـەوان ئاوخواردنەوەیـە. لەسـەر شـەرە سـەگێک، بەزاندنـی خەتـە جۆتێـک، پارچەیـەک لـەوەڕی مێگەلـە مەڕێـک، بزنێـک، خوشـترێک تـۆوی یەکـدی دەبڕنـەوە... دیسـان هەڵوەسـتەیەکی کـرد، بـەڵام

ئەمجارە دەمارەکانی ڕوخساری بەرە بەرە کرژبوونەوە: بەڵێ ئەم کوڕە زۆر ئازایە، لە هێرشبردندا دەستپێشخەرە و لە بەرگریکردنیشدا چاو نەترسە، بەڵام لە رادەبەدەر شەرمنە، شەرم ناخی خواردووە و لێی بووە بە ترس، ترس لە شەڕ نا، ترس لە شکاندنەوە، ترس لە هەرەسهێنانی یەکەم هەنگاویدا، یەکەم هەنگاو لای ئەو ئەستەمە، گڕکانی عەشق و ئارەزووەکانی ئەوەندە گەرمن هەناوی دەسووتێنن، هەڵاوەی ئەو ئاگرە دەیەوێ هەردوولا پەنجەرەی دەوی بسووتێنی و ئازادانە دەربچێ، جامە ئەستوورەکانی پەنجەرەی شەرم ناکرێنەوەو ئەو گڕە لە هەناویدا خەفە دەبێتەوە و بەردەوام خۆی دەخواتەوە. لە دوا هەڵوەستەیدا ئیبتیسام دەمارە کرژبووەکانی خاوبوونەوە: ئەگەر یەکێک عاشقی ڕووناکی بێت و ئەو ڕووناکییەش دوور بێت،بەڵام بۆ ئەوەی ئەو ڕووناکییە ببینێ دەبێ بەسەر چیای ئازارەکانیدا سەرکەوێت. هەندەی نەبرد پەردەی شەرمنی مێینەیی خۆی تۆزێک لادا، ئارەزووی لە باوەش گرتنی کارۆ پرسیارێکی پێ ورووژاند: گیانە خۆر خەریکە ماڵئاواییمان لێدەکات، لە تاریکایی شەودا ڕێ دەرناکەم بڕۆم، ئەگەر هەر دەبێ بڕۆم ئەوە باشترە هەتا رووناکە بڕۆم، ئەگەر تۆش حەز دەکەی لەلات بمێنمەوە، یا بە دڵی تۆ بێت.

دیسان عەزیای شەرم کارۆی قوتدا و خستیە ناو هەناوی: چەند خۆش دەبوو ئەگەر ئەم شەوە پێکەوە بووینایە -کارۆ بە شەرمەوە خۆی دەدواند- بەڵام نەژن و میردین و نە خزم و کەسی یەکدی، ناو ئەم حەسارەش مۆنجەی دێ پێمان بزانن حەیامان دەچێت. چاوەکانی لە ڕوخسارە سوورهەڵگەڕاوەکەیدا بوونە بەرد، نە بەزەقی و نە بەراستەوخۆ و نە بە تیوتیش سەیریان نەکرد، لە ژێر پەردەیەکی ئەستووری سەرسوڕماندا ونبوون: زۆر سەیرە ئەم ژنە خدووی بە کابرایەکی ڕووتەی وەکو من گرتییە، هەرچەندی دەکەم بژێوی ژیانی خۆمم پێ پەیدا ناکرێ. گەلەک جوانم بە بزنان نەبێ بە هیچی دی ناچم، ئەوە چەند ڕۆژیشە ردێنم نەتراشییە ناشیرینتر بوویمە. سەرەدەری لەو ئیشەی دەرناکەم، سەرە ژنێکی جوان و قشت و رێک و پێک و خاوەن ماڵ و سامان دەبێ هیچ پیاوێکی لە من باشتری دەست نەکەوێ.

چەند چاوەڕوانی کرد ئیبتیسام وەڵامی دەست نەکەوت، زانی شەرم لوولی دایە و هوڕێنان دەکات، ناچار پرسیارەکەی بە شیوازێکی دی دووبارە کردەوە: گیانە ئەوەندە بیرکردنەوەی بۆ چییە؟ سوپاس بۆ خوا تۆ جوامێرێکی بوێری، پیاوی

بە غیرەت بڕیاری لە دەست و مستی خۆیەتی، نەپرس بەکەس دەکا و نە لە کەسیش دەترسێ، یەک قسەیە (ئا) یا ن (نا).. تێزاوە هاندەرییەکەی ئیبتیسام هەموو خلت و خارەکانی ناو کەللەی کارۆ ی ڕامالی، هەستیکرد خوێن لە دەمارەکانیدا فیشقەی دەکات. دڵە لەتلەتبووەکەی کۆکردەوەو بڕیاریدا: من سیکارد تۆ بڕیەند بمسووە و تیژم بکە، کێت دەوێ با ملی پەلدەم. دیاربوو بڕیارەکەی بڕیار نەبوو،بە دڵی (ئیبتیسام)یش نەبوو بە کزۆلەیی پێی گوت: بە قوربان ملی خەڵکم بۆ پەل مەدە، گرفتمان گەلێک کەم نییە هی دیکەشی بخەینە سەر، پیاو نابێ وەکو ڕەشەبا توندو تیژ بێ دارو درەخت و چاک و خراپ پێکەوە لوول بدا، دەبێ وەکو دەریا و زەریا هێمن و ئارام و زگ گەورە بێ، ماسی و گوێچکە ماسی و دڕندەی مرۆڤ خۆریش لە ناویدا جێیان ببێتەوە.
کارۆ لە بیابانی وشەکانیدا نەیدەزانی کام وشە هەڵبژێری، بە بڕوای خۆی (ئا) گۆمە کڕەکەی خەڵکی ناو حەسارەکەی دەشلەقاند، (نا)ش دڵی (ئیبتیسام) ی لێ دەتۆراند. (ئا) و (نا) بووە مشتومڕیان، سەریان لە دوای یەکترنا، ڕاوی یەکدییان کرد، کە گەیشتنە ناو کەللەو مێشکیشی دارێکی بە نێوان هەردووکیاندا نەهێنا. نە (ئا) ی یەکلا کردەوە و نە (نا): مانەوەت لێرە دڵنەواییە بۆ من، لە تۆ زیاتر کەسی دیکەم نییە، تۆ لەو تەنگانەیەدا باوک و برا و کەس و کاری منی، بەڵام ئەگەر تۆ نەڕۆیەوە من ئەم شەوە خەوم لێ ناکەوێ، دڵم هەر لە قرت و فرتی ئەو خانووە چۆڵەی تۆ دەبێ. دزو جەردە ئەوەندە زۆر بن و بزانن چۆڵە بەسەریدادەدەن، دەستی پێدا دەهێنن و هەرچی تێیدایە دەیبەن، منیش هەتا هەتایێ چاوشۆڕی تۆ دەبم. ئەوە لەلایەک لە لایەکی دیکەش دڵم بەرەوەست نادا بە تەنها بتنێرمەوە، دەترسم ئەو هەرچی و پەرچییانە بێنە سەرو گوێلاکت و تۆڵەی منیش لە تۆ بکەنەوە.
ئەو پێی وابوو کارۆ خەریکە ببێتە تەیرێکی مەعقوول، هەر ئەوە ماوە پەڕو باڵی ڕێکبخا: بەقوربان هەموو سەرو ماڵی من بە قوربانی یەک خولەک بەختەوەری تۆ بن. تۆ لەبەر ئەم ناوچەوانە بەدیۆمەی من وات بەسەر هاتووە چۆن پشتت تێدەکەم، هەر فەرمانێک تۆ دەری بکەی من پێی رازیمە. بەڵام دەزانم هەموو ئەندامەکانی لەشت بە ئازارە و باری دەروونیشت شلەژاوە. کەواتە تەنیا ئەمڕۆ دەسەڵاتی ئەم بڕیاردانە بە من بسپێرە.

## ١٤

ئیبتیسـام دەیویسـت ئـەوەی مەبەسـتی بـوو دەری ببـڕێ، لـەو چرکەسـاتەدا پیاوێکـی دەسـتەی کارێـژ قۆپـای لـووت قەرانگـی چەناگـە تەگەیـی سـمێل سیس، پاڵتۆیەکـی درێـژی بـە سـەر کراس و شـەرواڵەکەیداهێنابوو. دووکەڵـی قونکـە جگەرەیەکـی هەڵدەمـژی کـە دوا هەناسـەی بـوو. بەبـێ لـە دەرگادان دوای چەنـد ئحـم ئحمێـک لێیـان بـە ژوورەوە کـەوت. توومـەز کابـرا چـاوی بـە شـەرواڵی (کارۆ)ی کەوتبـوو غـرووی هەسـتا بـوو، یـان حـەزی سووسـەکردن پاڵـی پێـوە نابـوو، سـڵاوی کـردو بەبـێ فەرمووکـردن لەلایەکـی چـوار پایەکـە دانیشـت. کارۆ زۆر بـە گەرمـی سـڵاوەکەی وەرگرتـەوە، کەچـی ئیبتیسـام بـە تووڕەیـی ڕووی خـۆی لـێ وەرگێـڕا. لـە کارۆ ی دوو قسـەو لـە کا بـرای سـێ قسـە بوونـە خەڵکـی یـەک دەڤـەرو گوندەکانـی نزیـک یەکـدی. کابـرا چەندیـن پرسـیاری دەربـارەی نەخۆشـییەکەی و خەڵکـی کوێیـە و چ هۆکارێـک گەیاندوویەتییـە ئـەم شـارەلەوی دەکـرد، ئەگەرچـی ئـەو سـەری لـە کابـرای شـێواندبوو بـەڵام ئیبتیسـام دەترسـا نـەوەک کارۆ بەسـاویلکەیی قسـەیەک بزەلێنـی. تـا کار گەیشـتە سـەر ئـەوەی کابـرا پرسـی:ئەرێ بـرا ئێـوە تـازە هاوسـەرگیریتان کـردووە؟ قـەت بـڕوا ناکـەم تـازە بـووک و زاوا بـن، ئەگـەر تـازەش نییـە بۆچـی هیـچ منداڵێکتـان لـەلا نییـە؟

پێـش ئـەوەی کارۆ دەوی لێکبکاتـەوە، ئیبتیسـام مەبەسـتی بـوو کابـرای چەواشـە بـکات، بـە کوردییەکـی شـڕ وەڵامـی دایـەوە: ئێمـە هەردووکمـان خوشـک و برایـن، باوکمـان دوو ژنـی هێنابـوو یەکێکیـان کـورد ئـەوی دیـش عـارەب، دایکـی مـن ژنـە عـارەب و دایکـی ئەویـش ژنـە کوردەکـە بـوو، دایـک و باوکـی هەردووکمـان- تەمەنـی درێـژ بـۆ تـۆ- ماوەیـەک لەمەوبـەر ئەمـری خوایـان بەجێگەیانـدووە. مـن بـە پیاوێکـی ئـەم شـارە مێـردم کردییـە و کۆشـێک منداڵـم هەیـە، کاتێـک زانیـم ئـەم برایـەم نەخۆشـە و لـەم حەسـارە چـاوە خانووێکـی گرتییـە زۆر خەمـم خـوارد، بـە پەلـە هاتمـە لای و هـەر ئەمـڕۆ سـبەیە دەیبەمـە لای خـۆم.

کابـرا پێـی بـڕوا کـرد بـە تایبەتـی کـە بینـی کوردییەکـەی لـە گـزۆزی دووکـەڵ دەکات و دەربڕینەکـەی تـەواو نییـە. (ئیبتیسـام)یش بـە دوو چـاوی

بریسـکەداری گڕگرتـوو، بـە ئارەزوویەکـی خەفەکـراو، بـە دەویکـی ئاوتێـزای تێکـەڵ بـە ئارەقـەی ناوچـەوان و سـەر کوڵمـەکان، بـە ڕوخسـارێکی پـڕ لـە هێمـای خەمێکـی نامـۆ، بـە دوای خەونـە ونبووەکەیـدا دەگـەڕا. خەونـی چـی؟ لێـی بـووە تەمێکـی بـە ئـاو، لـە جیاتـی چرپوونـەوەو باریـن و جۆگەلـە بەسـتان بـە سـەر زەوی ڕوومەتیدا،دەنگـی خـوڕە خـوڕ لـە نـاو چاوەکانیـدا خنـکا و بـە نهێنـی خـۆی دوانـد: کەللـەی لـە ئەهریمەنێکـی چەپـەڵ زیاتـری تێـدا نییە،دەڵێـی مارمـژە قونکـە جغـارەش دەخـوا. هـەر ناڵـێ ئـەم پیـاوە نەخۆشـە بـا هەراسـانی نەکـەم، نەدیتـی نەناسـی لای ژوورێـی لێگرتیـن.
ئیبتیسـام زانـی تـازە کار لـە کار تـرازا، ناچـار بـوو ڕوو لـە کارۆ بـکا و پێـی بڵـێ: براکـەم مـن دەڕۆم، بەیانـی خواردنـت بـۆ دەهێنـم و بـەم زووانـەش دەتبەمـە لای خـۆم، چـۆن دەهێڵـم ئـەم تاقـە برایـەم بـە نەخۆشـی لـە حەسـاران بکـەوێ.
ئەگەرچـی تیشـکە زەردو سـوورەکانی خـۆر لـە نـاو ڕووبـاری دیجلـەدا نقـوم ببـوون، شەمشـەمەکوێرەکانیش تـاک تاکـە دەهاتنـە دەرەوە، بـەڵام مرۆڤـە هەمەڕەنگـەکان لـە نـاو شـەقامەکانی شـاردا شـەپۆڵ شـەپۆڵ یەکتریـان دەخـواردەوەو شـەپۆلێک بـزر دەبـوو یەکێکـی دی سـەری هەڵـدەدا. سـەرەڕای ئـەوەش بـە جۆرێـک تـرس (ئیبتیسـام)ی دەهەژانـد بـە دوو چـاوی کەروێشـکانی سـەیری هـەر چـوار لای خـۆی دەکـرد، لـە ڕۆیشـتنیدا بـە چۆلەکەیـەک دەچـوو باڵـی لێکبـداو بیـەوێ بفـڕێ. دەڕۆیشـت و پرچـی وەک قانـە فریـزی بـۆڕ، کـە (بـا) لێیـدەدا ئەویـش وەک شـەپۆلەکانی دەریـا شـەپۆل لـە دوای شـەپۆل دەجـوولا. بـە پەلـە پەیتوونێکـی ڕاگـرت و هـەر بـە پەلـەش گەیشـتەوە ماڵـەوە.
شـەوەکە درێـژ بـوو، بـە پیاسـەی ئاسـایی خـۆی دەڕۆیشـت و بـەرە بـەرە ڕادەکشـا و ڕادەشـکا، بـەڵام ئـەوان (کابـرا و کارۆ) لـە گەرمـەی پرسـیار لـە یەکـدی کـردن و سـۆراخ پرسـین و بـاس و خواسـدا پێیـان وابـوو تـازە ئێـوارە یـە. قسـە قسـەی رادەکێشـا، سـەربردە سـەربردەی بـە دوادا دەهـات و نەدەبڕانـەوە.. کابـرا ئـەو جەمەدانییـە مـاش و برنجییـەی لـە پرچـی خـۆی لوولـدا بـوو، هێنایـە خـوارەوە و لـە تەنیشـتە خـۆی دانـا، سـەرو پرچێکـی مـاش و برنجیشـی بـە دەرخسـت، کـە بـە کـەزی وردو درشـت

هۆنرابووەوە.جغارەیەکی دیکەی داگیرساند، وەک مارمژێکی پسپۆڕ دوکەڵی جغارەکەی پڕ بە سییەکانی هەڵدەمژی، دوای چەند چرکەیەک لە ژەهر ڕشتن و پەنگخواردنەوەی دوکەڵ لە جووت لوولەی لووتە درێژو کوورپە قەرانگییەکەی دەرچوو، کە وەک گرنۆزی لۆرییە بارهەڵگرە مۆدێل کۆنەکان ناوەوەی ڕەشهەڵگەڕابوو، بە هەڵمژینی دوکەڵی ئەو جغارەیەش چینە قیرێکی ژەهراوی دیکەی خستە پاڵ ئەو قیرە ڕەشانەی بە کونەکانی لووتیەوە نووسابوون.بە دوو سێ جار حەی حەی و یا غەوسی ماڵ لە بەغدا یێ ڕووی بۆ کارۆ وەرگێڕا: دەستی ڕاستەت بخە ناو دەستی ڕاستەم.

کابرا دوو سێ جار هەر لە ناوکییەوە تاکو تۆقی سەری لەرزاندەوە و حەی حەیێکی دیکەی کرد و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو: من دەرگای دڵی خۆمت بۆ دەخەمە سەر پشت، تۆش چیت لە ناو دڵیدایە بۆ منی هەڵبڕێژە، خەڵک بە پرسیاران یان دەبنە دۆست یان دوژمن، من و تۆ بە پشتیوانی خودا هەر دەبینە دۆست و ناسیاوی یەکدی. مادام هەردوو لاشمان لە غەریبی داین، ئەگەر خوا نە خواستە دوژمنیش بین هەر دۆستین.دواتر ڕووی بۆ کارۆ وەرگێڕا: کاک- نازانم ناویشت چییە.

کارۆ زۆر بە سادەیی بە کابرای گوت: کارۆی خولامت.

دەستی لە پشتی دا: ئینشائەللا ناودێری، منیش خزمەتکارت- دەروێش ڕەحیم- خودا هەموو لایەکمان پایەدار بکات دەبڵێ ئامین.

ـــ ئامین.

دەروێش ڕەحیم هەستایەوە، پێی لەسەر کۆسپی بەر دەرگای دەرەوەی ژوورەکە ئاودیو کرد، دەستی هەڵشەقاندو بانگی ژنەکەی خۆی کرد: چایەکی زۆر بە تامان بۆ دێم بکەو هەر خۆشت دوو چای خەست و شیرینمان بۆ بهێنە.

لەسەر سینییەکی نە زۆر گەورە و نە زۆر بچووک، قۆرییەکی پڕ چای و هەندێک شەکرو دوو پیاڵەی بە تاڵی هێنا. بە پێی ئامۆژگاری مێردەکەی چوار چەمکی بەرامبەریان دانیشت و هەر یەکەو چایەکی بۆ تێکردن. دەروێش فڕێکی لە چایەکەو مژێکی لە جغارەکەی داو سەری بۆ کارۆ بەرز کردەوە: من و ئەم ژنەم- دەروێش مامز- کە لە بەرامبەرت

حەرێم گران دانیشتووە، هەردووکمان تۆبەکاری (شێخ بەرماغ) ین، روحم بە قوربانی بێت. کاتی خۆی ئەو زاتە زەریفە لە ناو دەرگا گەورەکەی مەسینە چووەتە ناو مەسینەکە و لە لوولەکەشی هاتۆتە دەرەوە، ئەوەندە نوورانی بووە و خودا خۆشی ویستووە، لێی دەگێڕنەوە و دەڵێن- بەهارێک لە ڕەشماڵان دەبن، (با) یەکی زۆر بەتەوژم و بەهێز هەڵدەکات و ڕەشماڵەکان بە جۆرێک دەهەژێنێت خەریک دەبێت هەموویان وەکو حوشتری یخ بکا. ئاگاداری ئەو شێخە نازدارەی دەکەنەوە هەر بە غار بە هانایانەوە دەچێت. هەرکە لە (با)ی دەخوڕێ (با) لە ترسان دەبێتە مووی ناو ماستی. هەر دەربارەی ئەو پەپوولە بێ گوناهە، بە چاوی خۆیان دیتبوویان ڕۆژێک سواری (دولدل) ی ببوو بە چاو قوچانێک گەیشتبووە بن هەوران و لەوێ بزر ببوو.
هەرچەندە مژە دووکەڵە خەستە یەک لە دوای یەکەکانی جغارەی دەروێش رەحیم پشی (کارۆ)ی تەنگ کردبوو، سۆتەکی جغارە قامیشەکەشی جار جارە دەبووە منارەو لە درێژییان دەڕووخا و دەکەوتە سەر پێخەفەکەی، کەچی ئەو نقەی لێوە نەدەهات و بەبێ هەست و خوست گوێی بۆ گرتبوو... تەنها ئەوەی پێدەکرا لەگەڵ خۆی بدوێ: حەیران حەیرانە حەیران لە زووری، کابرایەک هەیە مل نێرکە کاردی سەر سەلکە تووری، درۆیان پینە دەکات و لێکدییان دەدووری، خودایە بە گەرەیی خۆت گوێم بۆ ڕاگرتووە لە من ببووری. هەر لە پێشە خۆی بە هۆی منە منێکەوە کارۆ لێکدانەوە و بەراوردکارییەکی کرد: دایکیشم بە رەحمەت بێ زۆر جار ئەو عاجباتیانەی بۆ باس دەکردم، بەڵام هی ئەم دەروێشەی لە عاجباتیانیش عاجباتی ترە. خۆ تیرە مار نەبوو چووە ناو مەسینەی.
دەروێش جغارەیەکی لە ناو قۆدییە تەنەکەییەکەی دەرهێنا، ئاگری لە ئاگری پێکردەوە، مژێکی پڕ بە گوپی لێداو نیوەی مژەکەی قوتدا، نیوەکەی دیکەشی بە سەرو گوێلاکی (کارۆ)دا بڵاو کردەوە و دیسان دەستی بە قسەکردن کردەوە: شێخ بەرماغ- بە قوربانی بم- هەتا وەفاتیشی کرد، ساڵانە دوو جار زیارەتی حەزرەتی غەوسی دەکرد. ئێمەش شوێنکەوتەی ئەو زاتە زەریفەین دەبێ لاسایی بکەینەوە. هەردوو دەستی بەرزکردنەوە و پاڕایەوە: خودایە بمکەیە سەگی بەر قاپی ئەو

غەوسە نازدارەی هەتا بەردەوام لە جیاتی- حەی حەی- هەر حەپە حەپی لە بۆ بکەم. ڕووی لە کارۆ کردەوە: برام دەبڵێ ئامین.
_ هەزار جار ئامین.
دەستی خستەوە ناو دەستی کارۆ: کارۆی برام (لە پێشە خۆی: ناوی چەند خۆشە، یاخوا ناودێر بی) من و دەروێش مامزی خێزانم-بە قوربانی ئەویش بم، ئەگەر ئەو نەبی ئەسپێ هێلانەی لە پرچم دادەنێ، ڕشک و بانگولە دەوم تێدەنین و خوێنم دەمژن- نەزرمان لە خۆمان گرتییە و بەڵێنمان بە خوای خۆمان دایە، هەموو ساڵێ دوو جار- ئەگەر خۆشمان فرۆشتبێ- بارو بارگەمان تێکدەنێین و دێینە خزمەتی ئەو زاتە پیرۆزەی. هەر جارەی زیاتر لە مانگێک لەو حەسارەی چاوە خانووێک بە کرێ دەگرین. ئەگەرچی حەدم نییە خوا بکەمە شایەد بەڵام خوا شایەدە چونکە ئەم حەسارە لە مەرقەدەکە نزیکە نوێژبێری ناکەین، هەر پێنج فەرزەی خوا لە خزمەتی ئەو زاتە مەزنەیدا دەبین و بە زیکرو تەهلیلە و پاڕانەوە دەیبەینە سەر. ئەمڕۆ درەنگ گەیشتینە ئێرە و لە ڕێگاشدا ماندوو بووین ئەگەر نا لەوێ دەبووین و لێرەت نەدەدیتین. بە پشتیوانی خودا لە سبەینیوە قۆڵ و باسکمان لێهەڵدەماڵین و دەست پێدەکەین.. چەند مژێکی دیکەی لە جغارەکەیدا و لە نیوەی ڕەتکرد، دەستی بە قسان کردەوە: برا بەشەر چاوی زۆر قایمە وا دەزانی قەت نامرێ، نەفامە نازانی کە پەلەواژ بووەوە و لنگی چووە ئاسمانێ، ئەوها مردار دەبێتەوە چەقۆش بەسەریدا ڕا ناگا. جا برام هەتا ئەو ڕۆژە نەهاتییە و نەکەوتینە حەلاوەلایێ با بیرێک لە خۆمان بکەینەوە و چارەی خۆمان بکەین. تۆش مەرد بەو هەر لە بەیانییەوە ناوی خوای لێبێنەو با پێکەوە بچینە زیارەتی ئەو پیاوە مەزنەی و پستێری خۆمان پاک بکەینەوە.
کارۆ بیری لە خۆی کردەوە، پێی گوت: کاک دەروێش لەوەتی خۆم ناسیوەو بەبیرم بێ سوپاس بۆ خوا قەت پستێر پیسیم نەکردووە.
دەروێش قسەکەی کارۆی ڕەتکردەوە: برام مادام تۆ بەشەری قەت مەڵێ خراپەم نەکردووە، بەشەر شیری خاوی خواردووە زوو شتان لە بیردەکا، لەوانەیە تۆ لەبیرت نەمابێ ڕۆژێ لە ڕۆژان دەستت بە دەستی ئافرەتێکی نامەحرەم کەوتبێ، نەزەرێکی حەرام و حەنەکێکت لە گەڵ ژنێکی لایدە

کردبێ، قسەیەکی بە پەلارو پرچکت بە هەر مێینەیەک گوتبێ، نوێژێکت لە نوێژان بەبێ دەستنوێژ کردبێ، ڕۆژێکت لە ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزان خواردبێ، ئەزیەتی ئاژەڵێکی بەستەزمانت دابێ و مافی خۆیت پێ نەدابێ، ئەدی ئەوانە چین هەموویان گوناە و پستێر پیسی نین.

هەموو ئەوانەی دەروێش ڕەحیم بە گوناە و پستێر پیسی دادەنان، کارۆ بەبێدەنگی بە سەرەندو بێژینگ و هێلەگ تەتەڵەی دەکردن، دەیهێنان و دەیبردن، دەیپێوان و دەیکێشان، بەسەر خۆیدا دەیدوورین و بەبەریەوە نەدەچوون. دەروێش مامز دیواری بێدەگی ژوورەکەی ڕووخاند، دوو چای شیرینی بۆ هەردووکیان تێکرد و لە پێشی دانان: فەرموو چای بخۆن خەمی مەخۆن.

دەروێش ڕەحیم لەو هەموو ڕستن و بادان و چنینەدا سەرنەکەوت و بێ هیوا بوو، بەڵام ئەو پیاوێکی دنیا دیتە بوو، هەمیشە بە دوو پەت یاری دەکرد، ئەگەر یەکێکیان کاری نەکردبوایە، یان بپسابوایە ئەوەی دووەمی بە کاردەهێنا... دیار بوو چایەکەی بەردەمی کەمێک سارد ببووەوە، بە دوو سێ فڕان هەڵیقۆشی و ڕووی لە دەروێش مامزی ژنی کرد: مامز گیان.

_ بەڵێ.

_ دە بە جوانی تەماشام بکە.

لەگەڵ سەر بەرز کردنەوەی مامز بە سەر سوڕمانەوە: ئەیەڕۆ دەڵێی قەت نەتدیتیمە !!؟

_ کچێ هەی سەر خڕ زۆرم دیتی، بەس قەت ئەوها جوانم نەدیتی.

مامز گەشکەیەکی پێگرت: هەی سەرت تراشن قەت لە بەزمی خۆت ناکەوی.

_ ژنیژگە بەزمی چی؟ ئەمڕۆ وا دێیە بەرچاوم نەک هەر بە ناو بەڵکو بە ڕوخساریش مامزی، دیقەتی چاوەکانی خۆت دایە دەڵێی کەوزی شینن کوسکە کوسکیانە.

مامز فشەی پێهات و بە تووڕەیی گوتی: دیارە هەر لەسەر فاک وفیکی خۆتی و لە هەڵپە هەڵپ ناکەوی، ئێرە جێی هەندێ نییە هەی سەر جناوی.

_ فـاک وفیکـی چـی و هەڵەپاسـی چـی؟ هەرچەنـدە تەماشـای نـاو قــەدت دەکــەم دەڵێــی کارمامــزی و قــەت زگ و زارت نەکردییــە، پاوپــۆزت ئەوەنــدە جوانـە دەڵێـی دونگـی کاورە مێیەکـی دابەسـتییە بـە پاشـەڵتدا شـۆڕبووەتەوە.
خەندەیەکـی تــەڕی خەفەکــراو هــەردوو لێــوی مامــزی پــاراو کــرد، کەچــی ویسـتی لغـاوی بـکات و دەمکوتـی بکاتـەوە: ئاقـڵ بـەو لەسـەر پەتـک و سـنگی خـۆت داوەرێـوە، بـا ئـەم پیـاوە نەدیتـی و نەناسـییە بـە شـێتت تێنـەگات.
_ شێتی چی؟ مەگەر شێتی ناو جێ و بالینگانی شەوانی تۆ بم.
مامــز زیاتــر دابەزیــە ســەری: هــەی تەڵەتەقێنــی ڕەزاگــران، قەمامەکـی لــە دەوی خــۆت بــدەو چیــدی قســەی ناشــەرعی مەکــە.
دەروێــش ڕەحیــم بەزمەکــەی تۆخترکــرد: کچــێ هــەی تەرپــۆش خــۆ هیچــی ناشـەرعیم بەسـەر زاریـدا نەهاتییـە، دە هەسـتە وەکـو ژنـی نـاو ژنـان بـەو دوو دسـتە نـەرم و شـلانەت سـەرو ملـم بشـێلە دەڵێـی قوڕگـم ئەسـتوور بـووە.
مامــز ســکتری لێکــردو جرتێکــی بۆکێشــا: بــاش گوێــم لێیــە خنــە خنتــە دەڵێــی کەرخنکێنــەت خواردییــە، ئەوەنــدە لەوچــە لەوچــی بکــەی قوڕگــت چــۆن ئەســتوور نابــێ.
دەروێــش نەرمــی نوانــد: حورمــێ دیــارە درەنــگ تێدەگــەی دەڵێــن- ژن عەقلـی لـە کۆشـیەتی- عەقلـت بێنـەوە سـەری خـۆت، مـن فیکـرم هـەر لای ئـەم پیاوەیـە، دەتـۆ تەماشـای بکـە دەڵێـی چەتـرە فیلە،دووانـی وەکـو مـن دەکاتـە پارووێـک، پێـم حەیفـە لـەم حەسـارەی بـە سـەلتی بکـەوی چـاوی لـە دەسـتی خوشـکان و لـەوی و لـەوی بـی نانەکـی بدەنــێ.
هەرچەنــدە دەروێــش نەرمــی دەنوانــد مامــز ڕەقتــر دەبــوو: ژن عەقلــی لــە کۆشــێیە، یــان پیــاوی وەکــو تــۆ ئــەوەی نــاوی عەقلــە لــە کەللەیــدا نییــە؟
دەروێـش لەنەرمیـش نەرمتـر بـوو: دە تـۆ واز لـەوەی بێنـە، بـا بیـر لـەوە بکەینــەوە چــی بــۆ ئــەم پیــاوەی بکەیــن.
مامز بەو قسەیە کەمێک هێور بووەوە: چیمان پێدەکرێ بۆی بکەین؟
دەروێش سـەرو دڵـی مامـزی بـە تـەواوی گـرت: دەزانـی چیمـان پێدەکـرێ؟ دەڵێــم بــە مــن و تــۆ- خەپلــە خەپانێکــی- بــۆ بدۆزینــەوە و بــە بابــەوە خەنـی بکەیـن. وەکـو مـن و تـۆ شـەوان هەتـا سـبەینێ حیلمکانـێ لـە گـەڵ یەکدیـدا بکـەن.

ژنـه هـەردوو ناولەپـی خـۆی لێکـدی کردنـەوەو گەشـکەیەکی دیکەشـی پێگـرت:
ئـای خۆرکـت لـێ بکـەوێ چرتـە میـزە، خـۆ حەیـای ڕژایـە !!
تـا دەهـات لـە یەکدییـان تونـد دەکـرد، دەروێـش بـە مامـزی گـوت: هـەی ڕووت ڕەش بـێ لەبەرچـی حەیـام نەمایـە، لـە گـەڵ مەحرەمـی خۆشـم نابـێ دوو قسـەی دنیایـێ بکـەم؟
مامـز توندتـر ڕەتیدایـەوە: هـەزار جـار ڕووی خـۆت و بابیشـت ڕەش بـی هـەی پیرەسـەی سـوخەت گوجیلـە، کـەر بـە کەرایەتـی خـۆی دوو جـار پێـی بڵێـی هـۆش ڕادەوەسـتی، کەچـی تـۆ ئـەو هۆشـەت نییـە بێدەنـگ بـی و زەڕە زەڕی نەکـەی.
ژنـە دارێکـی لـە ڕوحـی دا، پیـاوە نەیوێـرا بڵـێ لـەل، هـەر ئەوەنـدەی پێکـرا بـە کارۆی بڵـێ: بـرام لـەلات سـەیر نەبـێ بـەم شـێوەیە لـە دەوم دەداتـەوە، سـووچی خۆمـە نـازو فیـزم زۆر دایتـێ، چـی بکـەم تـۆش لـە جێـی مـن بـی هـەر وا دەکـەی. بـڕوا دەکـەی کـە گواسـتمەوە وەختـە بڵێـم تـام شـیری خـاوی لـە دەوی دەهـات، هەنـدە لـە مێـژ نەبـوو کەوتبـووە مەهکـێ، تـۆ بڵـێ سـاڵێک مـن دەڵێـم شـەش مانـگ. چەنـد شـەوێک کـە دەچوومـە لای وایدزانـی دەعبامـە و دەیخـۆم. شـەو لـە دوای شـەو بـە زانایـی و دانایـی خـۆم کەویـم کـرد و لێراهـات، ئـای لـەو پەسـیرە مـزرە خۆشـەی ئەگـەر بزانـی خوێـی پێداکـەی هـەر زینەتـە لێـی بخـۆی.
بـەو قسـە هەلـەق و مەلەقانـە دەروێـش مامـز زیاتـر هـار بـوو: هـەی کاسنجی، بوویـە دەوێکـی ڕووت، دیـارە مەزاقـی خـۆت هاویشـتۆتە سـەر سـەری مـن، هـەی کونەبـا بـڕۆ لەواشـەیەکی لـە دەوی خـۆت بکـە بـا چیتـر چەلتـە چەلتـی پـێ نەکـەی.
ئـەوەی گـوت و تاقمـی چایەکـەی هەڵگـرت و لێیـدا ڕۆیشـت، (دەروێش ڕەحیـم) یـش هیچـی بـۆ نەمایـەوە تەنهـا ئـەوە نەبـێ بڵـێ: بـرام لێـی مەگـرە هێشـتا هـەر بـە هـی منداڵـی دەمیـزێ، وا مەزانـە هـەر مـن ئاوهامـە، هاولینگێکـم هەیـە خوشـکی ئـەم ژنـەی منـی لەلایـە، ئـەو هـەر قازێکـی بـێ قوونـە لـە بـەر دەسـتی ژنـەی کوڵایـە ناوێـری بڵـێ لـەل، تـازە کار لـە کار ترازایـە ئەوهـا ئاویـان بـۆ ڕژایـە.
کارۆ چـاوە خەواڵووەکانـی هەڵپشـافت، ئەوەنـدەی پاڵەپەسـتۆیان بخاتـە سـەر

ئاویـان تیـزا، سـووریش بوونـەوە، هـەروەک دەڵێـن خـەوە کوتکـەی دەبـردەوە.
دەرویـش هەسـتی پێکـرد، ناچـار هەسـتایەوە لەگـەڵ هەستانەوەشـی بەڵێنێکـی پێـدا: براگیـان خەمـی مەخـۆ سـەرت لێنابـرم.
ماوەیـەک بـوو ئیبتیسـام لـە هاتوچۆدابـوو، هەرسـێ ژەمـە خواردنیـان پێکـەوە بـوو، جگـە لەکاتـی خواردنـەکان، دوو لەسـەر سـێی ڕۆژەکانـی لـەلای ئـەو ڕادەبوارد،گوێـی لـە بیرۆکـە سـادەکانی دەگـرت، بـە هەنـدێ ڕاوبۆچوونـی سەرسـام دەبوو،ڕۆژانـە فێـرە خوێنـدەواری دەکـرد، کتێبـی بـە سـوودی بـۆ دەهێنـا و بـۆی دەخوێندەوە،جـار جـارەش برینپێچـی بـۆ دەکـردو برینەکـەی تیمـار دەکـرد. چ لـە لای بووایـە یـان لـە هـەر شـوێنێک بووایـە ئیبتیسـام بیـری هەمیشـە لای ئـەو بـوو. سـەرەڕای هەمـوو کـەم و کورتیەکانـی نـاوەوەی، بـە دیمەنـی دەرەوەی و قسـەو ڕەفتارەکانـی سەرسـام بـوو: لـەم شـارەدا کـەس وەکـو ئـەو جـوان نییـە، دوو چـاوی ڕەشـی وەک قلـە ترێـی سـادانی، دوولا سـمێڵی چـڕو پـڕ، بـەژن و باڵایەکـی ڕێـک، بـە هـەر ڕێگـەو کووچـە و کۆلانێکـدا بـڕوا، کچانـی ئـەو نـاوە لـە پشـت پەنجـەرەو دەرگاکان دەبنـە بـەردو بـە دوو چـاوی زەق ڕەق ڕادەوەسـتن. هێـزی وەسـفکردنم لـەوە زیاتـر نییـە کـە خـودا و سروشـت بـە مرۆڤیـان بەخشـیوە، ئەگـەر نـا زۆرم لـەوە تێدەپەڕانـد، چونکـە لـە ڕۆحمـدا زۆر لـەوە زیاتـر هەیـە بتوانـم بـە قسـە دەری ببـرم.. بیـری خـۆی ئەمبـەر ئەوبـەر پێکـردو بەراوردێکـی کـرد: ڕاسـتە مـن خوێنـدەوارو شارسـتانم، ئەتەکێـت و ئایـن و ئۆینـی ئـەم زەمانـە لـەوی زیاتـر دەزانـم، مـن مـاڵ و سامانیشـم هەیـە، ئـەو هیـچ کامێـک لەوانـەی نییـە، بـەڵام ئەویـش هەندێـک تایبەتمەنـدی تایبـەت بەخـۆی هەیـە، دڵسـاف و دڵکـراوە و دڵنەرمـە، چـاوی لـە نامـووس و مـاڵ و سـامانی خەڵـک نییـە، دەیـەوێ بـە کاسـبی خـۆی ژیانـی ڕۆژانـەی بگوزەرێنـی، کەسـایەتییەکی بـە هێزیشـی هەیـە ئەگـەر هەڵـی بـۆ بڕەخسـێ و ورەی بـەرز بکرێتـەوە، دەتوانـی ئەوانـەی مـن هەیتـم و لەوانـەش باشـتر بـە دەسـت بهێنـی. مـن پێویسـتیم بـەو ئازایەتـی و هێـزەی ئـەو هەیـە، لـەم شـارە بـێ سـەرو بـەرەدا هێـز بـاوی هەیـە، بەهێـزەکان ئەگـەر بەربەسـتێکی قایمـی هێـز لەبـەر دەمیانـدا نەبـێ بـێ هێـزەکان دەخـۆن. مـن یەکێکـم لـە بـێ هێـزەکان بـە بـێ پیـاو وەک دارێکـی ڕووت و قووتـم، نەگەلایەکـم بـە گۆرانیەکانـی (بـا) سـەما دەکات و نـە

لقێکم بە پێی بولبولێک دەلەرێتەوە و نە پەپولەیەکیش شیلەی گوڵەکانم دەمژێ.
لە کاتێکدا هەوڵی دەدا بە پێپلیکانەکانی (با) بۆ بەرزایی ئاسمان سەربکەوێ و هەورە وشک و ڕەشەکانی خەم، بە خەندەی لێوو کوڵمە بەفریەکانی چڕ بکاتەوەو بارانی خۆشەویستی بەسەر ڕوخساری خۆیدا ببارێنی، کەچی هەمان کابرای پێشتر هات سڵاوی کردو بە لای ژوورەوە کەوت، لەسەر لایەکی چوارپایەی نووستنی (کارۆ)ی دانیشت. ئیبتیسام بەو ڕەفتەیەی لە ملی لوولدا بوو دەم و چاوی شاردەوە و چووە دەرەوە، لە بن هەیوانەکەی بەر دەمی ژوورەکە خۆی گرمۆڵە کرد: دەرویشە فشە دیسان هات خۆی فش بکاتەوە، ئەو سمێڵ پشیلانییە لێمان بووە مووی شەیتانی، بە قسان و بە جغاران ئەم شەو کەلێنی ناداتێ و کەوەرێنی دەکات، وەکو مژمرکی پێوەی دەنووسێ و بەری نادا.
ئاوو هەوای بەغدا لە مانگی شوباتدا دەمدەمی بوو، بەتایبەتی لە نیوەی دووەمیدا. ڕۆژێ وا هەبوو خۆر سەری کەچەڵانی دەسووتاند، جاری واش هەبوو عەسرە گەواڵەیەکی پڕ ئاوی گرم گرم دەهێنا و وەکو کوندەی دەو کراوە لە ئاسمانەوە دایدەڕژاندە خوارەوە. سەرماش کاری خۆی هەر دەکرد و هەندێ کات بێ ڕەحمانە بوو، موچرکی بە جەستە ناسکەکان دەگرت و دەیتەزاندن. ئەو ڕۆژە - بەتایبەتی لەو کاتیدا - ئاسمان هۆن هۆن دەگریا، گەواڵەکان چەندین بلاچەیان دەتەقاندەوە و گرمە گرمیان نەدەبڕایەوە، بروسکیش بە تیشکە بەهێزەکانی ئاسمانی پارچە پارچە دەکرد، بارانیش بە خوڕ دەهاتە خوارەوەو شۆڕابەی دەبەستا. چەندین دڵۆپی گەورەی سەر بە کڵاوە پەنجەرەکانیان دەرشاندو لە درزی لێوارەکانیانەوە دەچوونە ژوورەوە.. کات وەک ئەسپێکی کەحێلی ڕەوهان لە قۆشمەدابوو،ئیبتیسام درەنگی بەسەردا هاتبوو، هەستی دەکرد ساردابیەک بە ناو ئەندامە هەستیارەکانی جەستەیدا دەگەڕێ و لەرزی پێدەگری. لە ناخییەوە ئاخێکی هەڵکێشا، ئاخیک سینگ و هەموو ئەوانەی ناو سینگی توند توند کرد بوو، ئاخێک هەموو خەونەکانی بەدرۆ دەخستنەوە، ئاخێک بەبێ ویستی خۆی ببووە میوانی سینگوڕکی، ئاخ و داخ و خەم و خەفەت چەندین میوانی ناوەختی ڕەزا قورسن بەبێ فەرمووی خانەخوێ

لـە نـاكاو لێـی بـە ژوورەوە كەوتبـوون.. ئاخـی دەروێشـە فشـە و خەفەتـی ڕۆیشـتنەوە چەماندیـەوە. پەشـۆكابوو بـەڵام بـە ڕواڵـەت نمایشـێكی بـۆ كارۆ نوانـد، هـەر لەبـن هەیوانەكـەوە و دوور بـە دووری بـە دەسـت و بـە چـاو خـوا حافیـزی لێكـرد، لـە ترسـی هـەوری تیـرو بارانـی بـە خـوڕ هـەر لەبـەر دەرگای حەسـارەكە تاكسـییەكی ڕاگـرت و ڕۆیشـت. لـە ڕێـگا بـە بیـری هاتـەوە كەلوپەلـی خواردنەكـەی نەبردۆتـەوە كەچـی هـەر نەگەڕایـەوە.
كـە ئـەو ڕۆیشـت بـوار بـۆ قسـەكردنی دەروێـش ڕەحیـم ڕەخسـا، لـە دانیشـتنەكەی ڕۆژی پێشـتر دەسـتی پێكـرد، لـەوەی لـە نێـوان ئـەوو مامـزی ژنـی ڕوویـدا، بـە نەبوونـی مامـز دەرفەتـی دەقۆزتـەوە و پاكانـەی بـۆ خـۆی دەكـرد: بـرا وا مەزانـە ئەوەنـدە بـێ دەسـەڵاتم بـە ژنـێ ناوەسـتم، حـەزم لێبـی دنیـای لێدەكەمـە كونـە مشـك، ماركـوژی دەكـەم و وەكـو كـەرێ دەیتۆپێنـم، بـەس دەسـتی ئـەوەم شـكایە سـبەینێ سـەد كـەس دەڵێـن- دەروێـش ڕەحیـم بـێ ئاقـڵ بـوو لـە گـەڵ ژنـێ نەحەوایـەوە- ئـەوە لەلایـەك لەلایەكـی دیكـەش ژنـە هـەر خـۆی بێنـی بەمـن نایـێ، دەترسـێم دارێكـی لێبـدەم لێـم بغـەزرێ، خـۆی لێـم بشـارێتەوەو كۆرەبژێـك بدۆزێتـەوە و بیباتـە لایەكـی، ئـەو لای لـەو لای خراپتر،شـەرمەزاری خـوا و كـەس وكاری خـۆم و بـاب و بـرای ژنـەی دەبـم، هەتـا دەمـرم هـەر دەبـی بـە دوایـدا بگەڕێـم لەوانەیـە نەشـیدۆزمەوە.
پێنـج شـەش سـاڵە لـە بـن نیكاحـی منە،ئـەو پێنـج شـەش سـاڵەش هـەر بـە ژمـارە زۆرە، جـارێ سـێ چـوار سـاڵی یەكەمـی وەكـو مامـزی كێـوی لـەلام گیـر نەدەبـوو. پێـش ئـەوەی بیگوازمـەوە كورەبژێكـی گونـدی مێشـكی تێكـدا بـوو، بـاش بـوو ئـەو گـۆرە سـەیەمان لـە یەخـەی خۆمـان كـردەوە، بـەڵام ئـەو دێلـە سـەیەی مـن هێشـتا هـەر ئـەوی لـە مـن زیاتـر دەوێ، لـە بەخـت و ناوچەوانـی منیـش زگ و زاری نەكـرد، هۆیەكـەی هەرچـی بـێ گرنـگ ئەوەیـە نەیكـرد، ئەگـەر چەنـد منداڵێكـی ببوایـە حاڵمـان بـەو حاڵـەی نـەدە بـوو، هـەر نەبوایـە لەسـەر منداڵەكانـی دادەوەرایـەوە، كەچـی مـن سـەرەڕای بـەردەق بەردەقـی ئـەم ژنـەم، كێشـمە كێشـمی كۆشـێك منداڵـی دیكـەم لـە سـەرە.
_ تۆ ناڵێی منداڵمان نییە.. كارۆ بە دەروێشـی گوت.
دەروێـش قسـەكەی خـۆی زیاتـر بـۆ كارۆ ڕوون كـردەوە: بەڵـێ گوتـم مـن و

ئـەم ژنـەم منداڵمـان نییـە، بـەڵام پێشـتر ژنێکـی دیکـەم هەبـوو، تەمەنـی درێـژ بـۆ تـۆ ئـەو ئەمـری خـوای کـرد، پێنـج خولامکـەی تـۆم لێـی هەیـە - دوو کـوڕو سـێ زەعیفـەن - هەموویـان گـەورە بوونـە، دوو لـە کچـەکان چووینـە مـاڵ و مێـردی خۆیـان، هـەردوو کوڕەکانیـش - ئـاردی خۆیـان بێژتیـە و کەپەکـی خۆیـان ڕێژتیـە - ژن و منداڵـی خۆیـان هەیـە.
شـەوی رابـردوو (دەروێـش ڕەحیـم) نەیتوانیبـوو (کارۆ) بێنێتـە ژێـر بـارو ویسـتی خـۆی، ئـەو شـەوە دەیویسـت بـە جۆرێکـی دی داوی بـۆ دابنێتـەوە، بیـری لێدەکـردەوە: دیـارە پیاوێکـی ڕەقـەکارە پێـم نەکـرا گوێـی ڕابکێشـم و بیکەمـە دەروێشـی شـێخ بەرماغـی - بـە قوربانـی میزەکـەی بـم کـە وەکـو دەرمانـە - ئەولامـان فـت.. ئـەو هەتـا ئێسـتا بـێ ژنـە دەبـێ بـە ژنـان لـە خشـتەی ببـەم، هـەر بـە قوربانـی ژنـان بـم ئـەوان نەبـن دەفەوتێـم، بـێ ئـەوان هیـچ ئیشـێکم سـەرناگرێ، نـاو شـانی زۆر پانـە لەبـۆ دەودەوانـێ و دەنـگ پەیداکـردن فیتـە، بەڵکـو لـە هەڵبژاردنـی ئـەم جارەش نـوری پاشـا دەربچێـت و ئێمـە مانانیـش نانەکـی پێـوە بخۆیـن. ڕووی تێکـردو دەوی بـۆ کـردەوە: بەقوربانـی ئـەم ناوشـانەو جۆتـە سـمێڵەت بـم، دەزانـی لەبـەر خاتـری تـۆ زیارەتـی ئەمـڕۆم تـەواو نەکـرد، دوای نوێـژی عەسـر گەڕامـەوە و هاتمـە لای تـۆ بـۆ ئـەوەی چاکەیەکـت لەگەڵـدا بکـەم.
کاردۆ بە سەرسوڕمانەوە بە دەروێشی گوت: وەکو چی؟
دەروێـش خـۆی لـێ نزیـک کـردەوە: بـرام، ئینشـائەللا لـە براشـم زیاتـری، لێـرە لـەم غەریبایەتییـە هیـچ برایەکـم لـەلا نییـە تەنیـا تـۆ نەبـی. هەرچەنـدی تێدەفکـرم و زەینـی خـۆم دەینـم و دەبـەم سـەرم لـەو ئیشـەی دەرناچـێ، کـوڕە گەنجێکـی بـە شـان و شـەوکەتی وەکـو تـۆ پـەل پەلیشـت بکـەن چـوار فرووجـی وەکـو منـت تێدەبـی، مـن بـەو نابوتیـەی خـۆم ڕێـی دووانـم خۆشـکردییە، تـۆ چـۆن هەتـا ئێسـتا مرقـە مرقێـک، بێلـە بێلێـک، حاشـا لـە جەنابـت زەڕە زەڕێکـت بـە دەوری کچێکـدا نەکـردووە بیکەیـە ژنـی خـۆت، ئینشـائەللا زەینـت بـە خـراپ ناچـی و بـە سـەهو تێـم ناگـەی مەبەسـتم بـە شـەرعییە نـەک ناشـەرعی. بـرام ئەگـەر ئەوهـا بـە تەنیایـی و بـە سـەلتی بمێنیـەوە دەگرمخێـی و کەڕەکیفـەی هەڵدەهێنـی.
کارۆ بـەو قسـە هەلـەق و پڕوپوچانـەی دەروێش ڕەحیـم شـەرمی کـرد، نەیویسـت

لەوە زیاتر بڵێ کە گوتی: ئەوەش قسمەتە، دیارە لە ناوچەوانم ئەوها نووسرایە.
دەروێش هەوڵی دەدا ئەو مەبەستەی لەناخی دایە بە کارۆی بگەیەنێ: ڕاستە ناوچەوان دەوری هەیە بەڵام خودا دەڵێ لەتۆ هەرەکەت لە منیش بەرەکەت، تۆ هەر لە جێی خۆت گاگۆلکێ بکەی هیچت دەست ناکەوێ، کەمێک بجولێ- ئەوەی لێت دوورە- خودا لە بۆت نزیک دەکاتەوە.
دەروێش ڕەحیم ئەو ویست و ئارەزووەی مەبەستی بوو بە کارۆی گەیاند: پێشتر تێمگەیاندی لە ژنی یەکەمم سێ کیژم هەیە، دووانیان بە مەرامی خۆیان گەیشتینەو لە ماڵ و مێردی خۆیانن، ئەوەی هەرێ گچکەیان هێشتا باکرەیە و لەبەختی تۆ ئەو بەختی هەڵنەستاوە، کیژەکان بە من ناچن بە دایکی خۆیان دەچن، بە تایبەتی ئەوەیان لە دایکی خۆشی تێپەڕاندییە، ناوی خۆی بە خۆی وەیە (گوڵێ) یەک گوڵێ، هەڕەتی مێردکردنیتی پازدە شازدە ساڵییە، هەر زینەتە ماڵێکی پێ بۆنخۆش بکەی، لە ڕووت نەبی بەخۆشت پیاوێکی زەریفی، ئەو (گوڵ)ە بۆنخۆشە قابیلی تۆیە لەدەستە خۆتی مەدە.. سێ چوار جار دەستی (کارۆ)ی گوشی و ڕایتەکاند: دە خۆت خەنی بکەو بڵێ قبوڵمە.

# ١٥

لەو کاتەی هەردووکیان دەستیان لە ناو دەستی یەکدی دابوو. دەروێش مامز بە خۆی و بە تاقمێ چای لە ناکاو دەرگای ژوورەکەی کردەوەو گەیشتە سەر سەریان. تومەز لە پشت دەرگا گوێی لە بگرەو بەردەی بە شوودانی (گوڵێ) ببوو پف هەڵمابوو، هەر بەبێ پێ لێدان وەک بۆمب تەقیەوە، دەروێشی وەک کەری نیوەزەڕ لێکردو لە قەوچەی دایەوە: دەروێشە فشە، ئەوە بە تەمای (گوڵێ) ی لاق بە ترشاو بە ملی ئەو کوڕە نازدارەوە بکەی، پەح بە زیاد نەبی، دیارە ئەو کوڕە مەندە ئاقڵی بەریۆتەوە کۆشی بەو دەرک دەرک کەرو ماڵان گەڕایە ڕازی بی، گوڵی چی و حاڵی چی !! چ شیلەی تێدا مایە هەتا ئەم بەستەزمانە بۆنی بکا و هەڵیمژی، سەری برایەکانیشی شۆڕ کردییە هەر ڕۆژەی لە بن لاقی پیاوێک دەریدەهێنن، هەر ئەوە مایە پاش ئاخوڕی خەڵکی بلێستەوە.

دەروێش ڕەحیم شێت و هار بوو: پێم نالێی تۆ سەری سیری قونکی پیازی لەقەی لە بەختی خەڵکی دەدەی، هەموو جارێ ماندوو دەبم هیلاک دەبم هەتا دەیڕێسم، تۆش دێی ڕیسەکەم لێ دەکەیەوە خوری.

مامز پەرچەم و ئەگریجەی لە سەر چاوی خۆی لادا: چ زلە پووشکەیەکی تۆم لە چاویدا نییە هەتا بە درۆ تەونێکت بۆ دابەستم و ڕیسەکەت بۆ بکەمە مافوور.

_ ئای نەمری کلک پان، دەزانم ئەو هەموو کلکە لەقێنە و ماستاو گرتنەوەیەت لەبەر چییە، هەی کارکردە لێرەش کاری خۆت کرد.. دەروێش بە مامزی گوت. هەر ئەوەندەی گوت و دەرپەڕی کەس نەیزانی بۆ کوێ ڕۆیشت.

دەروێش مامز فشەی بە فشەی دەکرد، قەشمەری بە قەشمەرجاڕ دەکرد، گاڵتەی بە گاڵتەچی دەکرد، خەندەیەکی بۆ کارۆ کرد و پێی گوت: گوێی مەدەرێ ئەو فش فشکەرەی ماڵی خۆم چاک دەناسم، هەنووکە دەچی وەکو تەڕاشی لەسەر چاو دەکەوی وەهەتا نوێژی سبەینێ چرچەی ناکا، دەزانم چەند مووی پێوەیە. هەر لێمگەڕێ با هەموو پۆخلەواتی بە گۆڕێ وەرنەکەم.

سەرو چایەی لە بۆ خۆی و (کارۆ)ی تێکرد و خەندەیەکی دیکەشی بۆ کرد: با من و تۆ سەرو چای خەست و شیرین بخۆینەوە، ئەویش سندانی بخوا.

کارۆ لەو دەروێشایەتیەی ئەوان و مرخێش مرخێشی نێوانیان سەری سوڕما:

دەروێش مامز، هەردووکتان لەسەر دەستی شێخەکەتان تۆبەتان کردییە، ئێوە ئەو مەزاقەی بە خۆتان بکەن دەبی خەڵکی دی چی بکەن.
مامز گاڵتەی بە دەروێشایەتییەکەی مێردەکەی کرد: تۆبەی چی و حاڵی چی؟ تۆبەی گورگی مەرگە.
کارۆ سەیری پێهات: ئەدی ئەو پرچ و کەزی و زیارەت و حەی حەی کردنەی لە چییە؟
مامز کارۆی دڵنیا کردەوە: هەمووی ڕێویاتییە، فڕی بەسەر دەروێشایەتییەوە نییە، دەروێشایەتی چی؟ گەوادە گەواد دیارە تۆش درەنگ تێدەگەی، مێشکت بە کاربێنەو بە چاوی کراوەش خەڵکی ببینە. بە ڕوخساری کەس فریو مەخۆ، مەلا بە مەندیل مەبینە، حاجی بە کەشیدە مەپێوە. سۆفی بە ڕدێن و دەروێشیش بە کەزی مەکێشە، بەوەی لە ناو دڵیاندایە هەڵیان سەنگینە، خۆ تێگەیشتی تۆخەی دەرمانی کۆخەی. دیاربوو (مامز) هەم گاڵتەباز و هەم سەوداسەری (کارۆ) ش بوو. بە قسە هەڵەشەییەکانیشی کارۆی بێدەنگ و سەرسام کردبوو،
کەچی ئەو دیسان دووبارەی کردەوە: تێگەیشتی تۆخەی دەرمانی کۆخەی؟
کارۆ ناچار وەڵامی دایەوە: بەڵێ تێگەیشتم. بەڵام ئەوەی گوت و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی: گەوادی بۆ کێ دەکا !؟
_ گەوادی داروەدەستەی ماڵی پاشایە، بە فرە چەلاوێکی چەور بەکرێیان گرتییە، وەکو ڕێوی دەچێتە بن گوێی ئەم و ئەو بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنەکان پرۆپاگەندەیان لە بۆ بکەن.
کارۆ دیسان لە مامزی پرسی: گەوادی بە کێ دەکا !؟
مامز وەڵامی دایەوە: بە کچەکانی خۆی و ژنی حیزی عالەمێ.
کارۆ نەک هەر سەری سوڕماو حەپەسا، چاویشی بە ئەبلەقی زەق زەق ڕاوەستا لە دڵی خۆیدا: چاک نەبوو بە کچەکەی ڕازی نەبووم، منیش دەبوومە دەییووس، ئەوە لە گەوادیش خراپتر، چاوشۆڕی دنیاو قیامەتێ دەبووم. هەر بە حەپەساوییەوە سەیری مامزی کرد: خۆ تۆشی نەخستۆتە ناو ئەو قوڕاوە بۆگەنییە؟
مامز بەو پرسیارە تووڕە بوو: چ حەددی هەیە، لەگەڵ بابیشی گووی خواردییە، پێت وایە من ئەوەندە ساویکە و نەفامم بە گوێی بکەم. بەڵام دوو چای دیکەی تێکرد، هەستایەوە یەکێکیانی بۆ کارۆ برد، چایەکەی لەبەر دەمی دا نا و بە

قیتی لە پێشی ڕاوەستا: چاکت کرد بە (گوڵێ) ڕازی نەبووی و سەری خۆت شۆڕ نەکرد، سەرت بەرز بکەوە و تەماشایەکی من بکە، پیاو هەیە لە پێشم بکۆخی، من (مامز)م مامز لەو جۆرە ژنانە نیم.
کارۆ ویستی لێی بپارێتەوە. دەوی لێک کردەوەو گوتی:دەروێش مامز.. ئەو قسەکەی پێ بڕی، زیاتر لێی چووە پێش، چاوی لێ زەق کردەوە و ترساندی: جارێکی دی دەوت لێکنەکەیەوە پێم بڵێی دەروێش، من دەروێشی کەس نیم، من مامزم مامز مەگەر تەنیا شێر بارم ببا. تۆ شێری یان ڕێوی؟ ئەگەر شێری وەرە مەیدانێ...بە توندی بە کارۆ ی گوت.
کارۆ ناورایەوە: شێرم شێر بەڵام ئەمڕۆ نا، شان و پیلم بریندارە ناوێرم بیجولێنم. چەتەکان بە چەقۆ برینداریان کردیمە، بە خۆڕایی یەخەیان گرتم و شەڕیان پێ فرۆشتم، ئەگەر کەمێک لێم دوور بکەویەوە بۆت دەگێڕمەوە.
مامز لاملی کرد: یەک پێم ناجولێنم هەتا بە تەواوی و بەڕاستی بۆم باس نەکەی.
ناچار هەر لە سیری هەتا پیاری گێڕایەوە. مامز پێشتر دینی تەبەش و گوێلاک و چاووبرۆو کەلەشی ببوو،بەو گێڕانەوەیەی بووە دیلیشی: وامزانی تەنیا جوانی چما پاڵەوانیشی !؟ مامز بە پێکەنینەوە بە کارۆ ی گوت.
کارۆ ناورایەوە: ئەمڕۆ تۆ پاڵەوانی لە بەرامبەرم ڕاوەستای و چەنگت لێم قژ کردۆتەوە دەمترسێنی.
مامز وازی نەهێنا پرسی: شانت زۆر بریندارە؟وەرسووڕێ با سەیری بکەم. ئەو هەرچەندە بە هەڵەشەیی هەڵسوکەوتی دەکرد، بەڵام ژیرانەش بیری دەکردەوە، بۆ ئەوەی دەنگ و باسی مێردەکەشی بزانی، بە کارۆ ی گوت: دوو نەینۆکت لە ماڵی خۆمان بۆ دێنم سەیری برینەکەت بکەی.
_ لەو هاتوچۆیەتدا لە مێردەکەت ناترسی گومانت لێ بکا؟
چاوی لە چاوی کارۆ ی ناو ڕشتی کرد: مەگەر تۆ زەندەقت لێی چووبی، ئەدی ئەوە تۆ نەبووی خۆت کردبووە پاڵەوان و سێ زرتە زەلامی چەتەو چەقۆکێشت دابووە بەر شاپ و شولاقان و هەناوت دڕیبوون؟ ئەو هەموو غیرەتە چی بەسەر هات؟ هەر دەتوێمەوە کە دەبینم لە دندووکی مریشکە کورکێک دەترسێی. تۆ خەڵکی کوێی !؟ هەر خۆی بە خۆی گوت: گرنگ نییە خەڵکی کوێین تۆ شێریە بزانە چیت بۆ دەکەم.. بە تەواوی لێی نزیک بووەوە، بە تەواویش خۆی

بە سەریدا شۆڕکردەوە: تەگەیەکی خورتە- مامز لە دڵی خۆیدا گوتی- ناهێڵم ئەم شەو لەبن دەستم ڕزگاربێ، لەچی بترسێم؟ نەلەوەی بەناو پیاومە و نە لە کەس وکارم، کەسیان لەم شارەدا نین و هەر ناشزانن ئەم شارە لە کوێیە.
قۆڵی لای شانە بریندارەکەی بە نەرمی بەرز کردەوە، کراسەکەی لەبەرداماڵی، سەیری برینەکەی کرد، لەپە خرپنەکەی بە نەرمی پێداهێنا، سەرزەنشتی کارۆ ی کرد: ئەو هەموو ئاخ و ئۆفەت لە چییە هەندەی نەمایە سارێژ بێت. قۆپچەکانی کراسەکەی داخستەوە، ڕەفتەکەی لە سەری خۆی بەستایەوە، ویستی بڕوا بە بیری هاتەوە گومانی لێکرد: پیاوێکی شەرمن و نەدیتکە دیارە، کلیلی سەر ئەم دەرگا دارە هەڵدەگرم و لەگەڵ خۆم دەیبەم، نەوەک لە ژوورەوەڕا کلیلی بداو لێم نەکاتەوە.
لە ترسی ئەوانەی ناو حەسارەکە کەروێشکانی ڕۆیشت، لە کەلێنی دەرگا دارەکەی ژوورەکەی خۆیان تەماشای ژوورەوەی کرد، بەبێ ترس دەرگاکەی کردەوە: ها دەروێشە فشە هێشتا نەنووستووی؟
دەروێش پیاوەتی و مەردایەتی ساختەی بەسەردا باراند: چۆن بنووم؟ تۆ بە تەنیا لەلای ئەو پیاوە نامەحرەمەی منیش بنووم.
مامز فشەی پێهات: بۆ !؟ خۆ ئەو پیاوە گورگ نییە بمخوا، پیاوێکی وایە لەسەر کۆشی بنووی ترست لێی نەبێ، ئەگەر بزانی ئەوە کێیەو چییە و چی دەگێڕایەوە، ئێستا بە خۆت دەمبەیەوە لای و دەستیشی ماچ دەکەی، خەتای خۆت بوو زوو تێت تەقاند ئەگەر نا بە گوێی خۆت گوێت لە قسەکانی دەبوو، ئێستاش پەلەی مەکە کە هاتمەوە بۆت دەگێڕمەوە. مامزخۆی سووڕاندو وەرچەرخایەوە،ویستی زیاتر پیاوەکەی گێل بکات: دەزانی تۆ پیاوێکی زۆر نەزانی، لەوەتی هەم و فام دەکەم پیاوی بێتامی وەکو تۆم نەبینیوە، قەت بووە پیاو بەبێتامی بە بەژن و باڵای کچی خۆیدا هەڵبڵێ، تۆ نەک هەر نەفامی گێلیشی، بەو پێوان و کێشان و هەڵکێشانەت (گوڵێ)ت سووک و چرووک کرد،وات نەکرد کوڕە پێی شاگەشکە بێ. دەبوایە ئەو مەسەلەیە لە بۆ من لێگەڕێی، ئەو کارە تایبەتە بە ژنان پیاو خۆی تێهەڵقورتێنی تێکیدەدا، بە تایبەتیش پیاوی کۆڵەواری وەکو تۆ.
_ من هەر چەندە نەزان بم تۆش پێڵەقەیەکت لە ئیشەکەیداو نغرۆت کرد.. دەروێشە فشە بە مامزی گوت.

مامز دەروێشە فشەی لە گێلان گێلتر کرد: ئای سڵاو لە ئەقڵت، ئەگەر بزانی دوای تۆ چیم بۆ (گوڵێ) کردووە دەستم ماچ دەکەی، چما گوڵێ هەر کیژی تۆیە؟ نەخێر زیاتر هی منە، هەر بە خۆشم دەزانم چی بۆ دەکەم، کوڕەم وا لێکردییە هەر لە سبەینێوە بێتە داخوازی.. پیاوەکە خۆ داخوازیش وەکو ئەوەی تۆ فشە نییە- دەستت بێنە و بیخە ناو دەستم و قبوڵم کرد- دەبێ هەردووکیان یەکدی ببینن و بە یەکدی ڕازی بن. دەزانم گوڵێ هیچ عەیبی نییە کوڕە ببینی شاگەشکە دەبی، بەڵام کێ دەڵێ گوڵێ بەوی ڕازی دەبێ، ئەویش بەشەرەو نەفسی هەیە.

دەروێشە فشە باوەڕی کرد و خۆی پف دا: چ حەددی هەیە پێی ڕازی نەبی، من باوکیمە نابێ لە قسەم دەربچی.چاوی دەرێ وا تۆش ناڵێی کوڕێکی ئەوهاو ئیوهایە.

مامز بەرە بەرە مێردەکەی گێلتر دەکرد: درەنگم بەسەرداهات، ناتەوێ بەو چەند ڕۆژەی لێرەینە بۆتی ڕازی بکەم. دەروێش خەنی بوو: ئەی ئافەریم ژنە ئاقڵەکەم، وەرە ماچێکم بدێ.

ڕوومەتی بۆ درێژکرد ماچێکی زۆر ساردی داێ: دەروێشە فشە وەکو پێم گوتی ئەو ئیشە هی ژنانە هی پیاوان نییە، لە بۆ منی لێگەڕێ، تۆی هەر پێناوێ چیدیکەش مەچووە لای ئەو پیاوەی و لەمن و لە (گوڵێ)ش تێک مەدە.

دەروێش لە گێلایەتیشی تێپەڕاند: هەر بە خۆت هەر بەخۆت شێری مەیدانی، غەوسی گەیلانی ئاگادارت بی.

_ نەفام، مردی ئاگای لە خۆی نییە چۆن ئاگای لە من دەبی..مامز گوتی.

بە پەلە گەڕا دوو نەینۆک و هەندێک زەنجەفیل و ڕۆن و کووزە شفتیەک و قاشە گندۆرەیەک و دووسێ سێوو خۆشداکەنەی لە ناو سینیەک دانا و نیشانی دەروێشی دا: خنس بەچە بڵێ لە گیانتان خۆش. دەروێش ئەوەی بەسەر زاریدا نەهات، تەنها گوتی: نەخۆشم زوو وەرەوە.

کەچی ئەو هەر باکیشی نەبوو پێی گوت: ئەو فنە فنەت چییە دەڵێی فرفینگت گرتییە، چاوەڕێی من مەبە، باش بخەوە چاک دەبیەوە.

دیسان بە پەنادزە خۆی گەیاندەوە ژوورەکەی کارۆی، دەرگاکەی کردەوە و لە لای ژوورەوە ڕا شمشێری دەرگاکەی ڕەپێش کردو کلیلیشیدا: بەغدا شارێکی گەورەیە پڕی هەرچی و پەرچی و نامەردە، هەردووکمان سیلاح سزین، ناکەس

بەچەیەک لێمان بە ژوورەوە بکەوێ حەیامان دەبا، دایبخەین باشترە.
هەڵسوکەوتەکانی مامز دڵەڕاوکێی بە کارۆ گرتبوو: کارێکی باشت کرد، بەڵام ئەگەر دەروێشی مێردت هات و دیتی دەرگا داخراوە چی دەڵێ؟
دیسان ترسای جوولەکە- مامز هەرچی بەسەر زاریدا هاتبوا نەیدەگێڕایەوە- ئەوا ئەوانیش خۆیان کۆکردەوە و شوێنێکیان بۆ خۆیان پێکەوەنا و ترسیان نەما، تۆ قەت ترست لێدەرناچێ، هەر ئەوە ماوە گۆڵمە مسێکت بەسەردا بتاوێنمەوە.
مامز هەردوو نەینۆکەکەی هێنا، کارۆی هەستاندەوە، ئەو شانەی بریندار بوو بە تەواوی ڕووتی کردەوە، نەینۆکێکی لە پشتەوە و ئەوی دیشی لە پێشەوە بۆ ڕاگرت:فەرموو ئەفەندی جوان برینەکەت ببینە. پێم نەگوتی پێت بڕوا نەکردم، جارێکی دی بڕوا نەکەی گوێت دەردەینم.
کارۆ دیسان ناورایەوە: لە هەر چوار پەلان گوێم ساغە بە تەمای ئەویش دەربینی.
_ ئەوهایە دەری دەینم.
_ حکومەتی پاشایە حوکمی قەرەقووشی دەکا.
مامز ترساندی: بەڵێ وایە پێدرێژییان بکەی بە گرتنیشت دەدەم.
کارۆ بە ڕاستی ترسا: ئەوەشت پێدەکرێ!؟
کارۆی کردبووە- گیسکەکەی هەیاسێ، لەلایەک گورگی نیشان دەدا و لە لایەکیش کاوجۆی بۆ دادەنا، بیری کردەوە: لامل دیارە، ترسی نەدەمێ بە گوێم ناکا، نەزان و نەدیتکەش دیارە لەوانەیە لە ژیانی خۆیدا، نە بینیبێ و نە تام و بۆنی کردبێ. چاوی لە کارۆ زەق کردەوە: بەڵێ پێم دەکرێ، دیارە لە گوێی گادا نووستووی، ئەوەی تۆ بە دەروێشی دادەنێی سیخوڕی داروەستەی پاشایە، هەر یەک فیکەی ئەوت بەسە، بە خۆشت نازانی لە چ دارێک بەسترایەوە.
مامز نەینۆکەکانی دانایەوە، ڕۆن و زەنجەفیلەکەی هێنا: ئەوە ڕۆن و زەنجەفیلە قالبت پێ چەور دەکەم، نەرم و شلت دەکاتەوەو ئەوەی ئازاریێ لە لەشت نامینێ. قۆڵی کراسەکەی لەسەر هەردوو لاباسکە بەفرییەکانی لابرد، خۆی لێ مشتوماڵ کرد: پاڵکەوە پاڵەوانی ترسنۆک، دەی پەلە بکە سەرەتا لەسەر زگ، کراسەکەشت داکەنە پشتت چەور دەکەم. لە ملیەوە دەستی پێکرد، بەرەو شان و پیل و ناوشان و هەردوو قۆڵ و پشتی ڕۆیشت، لەوێشەوە تاکو کلینجەو

خـوار کلینجەشـی دەسـتی هێنایـە خـوارەوە و لەگـەڵ چەورکردنەکـەش دەیشـێلا، مامـز هەسـت و دڵ وناخـی وەک بزنـە بـە تەگەیـەک دەقـاڕێ و بۆنیشـی کەللـەی کارۆی پڕکـرد بـوو، ناخـی خۆشـی دەدوانـد: مـن نـە مەلەوانـم و، نـە ڕاوی ماسـی نـاو دەریاکانـم کـردووە، بـەڵام ئەمـڕۆ بەردێکـی زۆر گرانبەهـا کەوتۆتـە نـاو تۆڕەکـەم.
هەستایەوە و بـەرەو چرادانەکـە ڕۆیشـت، هێنایـە تەنیشـتە خۆیـان و زۆر کـزی کـرد: حەسـارەکە جۆرەهـا خەڵکـی تێدایـە، بـا بـێ دینێـک سـەرمان لـێ خـوار نەکاتـەوەو داوە دولکەیەکمـان بـە دوادا بێخـی.
کارۆ لـە پێشـەخۆی ورتانـدی: ئـای لـەو بـە دینـەی !! وەلـلا ئـەم شـەو ئـەوەی دیـن بـی لـەم ژوورەی بـاری کـرد و نەمـا... مامـز لەپێکـی لـە ڕۆن و زەنجەفیلەکـەدا: وەرگـەڕێ سـەر پشـتت بـا زگ و بـەر زگـت چـەور بکـەم.
بە شەرمە خەنیلکەیەکەوە: زگیشم چەور دەکەی؟کارۆ لە مامزی پرسی.
_ ئا ئا، زووبە وەرگەڕێ.
وەک بڵێـی هیـچ برینێکـی لـە شـانی نەبـێ بـە پەلـە وەرگەڕایـە سـەر پشـت و بـە مامـزی گـوت: پشـتەوەم زۆر گەرمداهاتییـە ئـاگات لـە پێشـەوەم بـێ... کارۆ گوتـی.
_ خۆت ئاگات لە پشتەوەت بێ توند بیگرە،پێشەوەت عایدی من.
بەنەرمی بە مامزی گوت: ئەو دەرمانە زۆر گەرمی دەکا کەمی لێبدە.
_ ئەمر دەکەی مێردم، ها چ دەڵێی مێردمی یان نا؟
شەرمەخەنیلکەیەکی دیکەشی هاتێ: کەیفی خۆتە.
لـە گەردنیـەوە بـە قـۆرت مـل و گۆمەمـک و سەرسـینگ و زگیـدا هاتـە خـوارەوە، ئـەم دیـوو ئـەو دیـوی پێکـردو شـێلای، پـووش گـەرم بـوو گـڕی گـرت، ئاگـر بـە ئاگـرەوە نووسـا. مامـز گەرمتـر لـەو دەروێشـانەی لـە ئەلقـەی زیکـردا گـەرم دادێـن، لـە گەرمـان هەمـوو جەسـتەی دەکـوڵا، دەوی بـردە بـن گوێـی: بەڵـێ مـن دەروێشـم دەروێـش، دەروێشـی شـێخ و مێخـی وەک بەرماغـان نیـم، دەروێشـی شـێخ دارەلووسـم،ها دەیناسـی؟
_ نەخێر... کارۆ درەنگ تێدەگەیشت.
بـە هانکـە هانـک بایەکـی لـە کونـە گوێـی کارۆ کـرد: چـۆن نایناسـی !؟ کـەس هەیـە نەیناسـی؟ ژیانـی هەمـوو مرۆڤەکانـی سـەر زەوی پەیوەسـتە بـەو شـێخە نـازدارەی !! ئەگـەر ئـەو نەبـێ مرۆڤـی زینـدوو لـە سـەر ئـەم زەوییـە نابینـدرێ.
ئـەو بـەزم و خۆشـییەی ئـەو شـەوە (مامـز) بەچـاوی خـۆی بینـی و بـە جەسـتەی

چەشتی، ئەو هەستەی بەناو هەستە دەمارەکانیدا گەڕا، هەرگیز لە ژیانی خۆیدا، نە چەشتبووی و نە هەستی پێکردبوو. بە پێکیک شەرابی (کارۆ) ی گەشابووەوە و مەست ببوو، لەجیاتی پێکەنین گریاو جەنەی گرت، پێکۆڵی کرد:
ژنی تۆم لێرە ناڕۆم... هەر بە ئەوەندە نەوەستا خۆی بە باوەشیدادا: بۆکوێم دەبەی بم بە، تەنها لەو پیاوە تاوانبارەی ڕزگارم بکە.
سەرەتا (کارۆ) حەپەسا و ترسیش گەرووی گرت، بەڵام دواتر بیریکردەوە:
هەروەک دەروێش ڕەحیم دەیگوت- پەسیرەیەکی مزری خۆش و بە تامە و هەر زینەتە لێی بخۆی- بەڵام عانەیەکم نییە بۆ کوێی ببەم... بە ناولەپی پڕو قەلەش قەلەشی هەندێک سەروملی و ناوشانی مامزی شێلاو بە پرسیارێک هێوری کردەوە: بۆ هەندە لەو پیاوەی بێزاری؟
_ تاوانبارە تاوانبار، سەد تاوانیت بۆ بژمێرم، چۆن لێی بێزار نابم.
_ لەو سەدەی یەک دووەکیم بۆ بژمێرە.
(مامز) خۆی زیاتر بە سینگوڕک و هەناسەی (کارۆ) یەوە نوساندو دەستیپیکرد:
تەمەنم چواردە ساڵی ڕێک بوو، ماڵی گەورەی گوندی ئاهەنگێکی حەوت ڕۆژو حەوت شەوەیان سازدابوو، ژنیان بۆ یەکێک لە کوڕەکانی دەگواستەوە، بێجگە لە نێرو مێ وگەورەو بچووکی گوندەکەی خۆمان، خەڵکی دەیان گوندی دیکەو شارانیش داوەت کرا بوون. ئەو حەوت ڕۆژو حەوت شەوە دەبوایە کچ و کوڕو ژن و پیاوی گوندی بەبێ بواردنی کەسێک لەو ئاهەنگەدا بەشدار بن و جۆش و خرۆشی بە ئاهەنگەکە بدەن. شایی و هەڵپەڕکێی ڕەشبەڵەک لە بەیانییەوە تاکو درەنگی شەو نەدەپسایەوە، چەند سوار ئەسپێکی شارەزاش، کە ئەسپی بەهێزو ڕەسەنیان هەبوو، لە دەوری شاییەکەو چوار دەوری گوندی قۆشمەیان لێدەدا.
پیاوانی ماڵە گەورەش، کە سەرکارو خزمەتکارو پاسەوان و ناو ماڵیان بوون، هەر یەکەو تفەنگێکی برنۆ یان جامبێزاری بەدەستەوە بوو تەقەی بووکانەیان دەکرد،لە جیاتی شیرینی گوللەیان بەسەر سەری ئاهەنگگێڕاندا دەهاوێشت و دەیان ترساندن. یەکێک لەو خزمەتکارانەش ئەو ناپیاوەی من بوو کەتۆ بە پیاوی منی دەزانی. هەر خانەوادەیەک ژن و کچی خۆیان بۆ ئاهەنگەکە نەناردبوایە ئەو زەوی و زارەی لەبەر دەستی دابوو، هەمووی لێدەسەندرایەوەو لەگوندیش دەر بەدەر دەکرا، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو خانەوادەیە لە پشتی خۆی زەلامی بە وەجی نەبوایە.. باوکم جگە لە خۆی و کوڕەکانی، سێ برای

گەورەترو بچووکتر لەخۆی و چەند مام و ئامۆزایەکیشی لەو گوندەی هەبوو، هەر یەکە لەوانەش چەند کوڕێکی ئازایان هەبوو. باوکم پشت ئەستوور بەو نێرەوزانە نەیهێشت من بچمە ماڵی پاشاو خزمەتیان بکەم، بۆ ئەو کارەشی بۆچوونی تایبەتی هەبوو، ئەو کارەی باوکم پاشای تووڕە کرد، سێ شەوی یەک لە دوای یەکدی پیاوەکانی دەناردە سەر ماڵی ئێمە و بۆ ترساندن و ملکەچپێکردنمان گوللەی حەواییان پێوە دەناین، کەچی باوکم بەهیچ شێوەیەک خۆی نەدایە دەست ویست و ئارەزووەکانیان. چەند شەوێک دوای کۆتاییهاتنی ئاهەنگەکە، ئەو شەوە تاریکە شەو بوو، شەوێکی ئەنگوستە چاو بوو، چاو چاوی نەدەدیت، لەناکاو ئاگری گوللە بەسەرماندا باری و گوللە بە گوللەی دەکەوت. باوک و براکانم لەسەر بان و پەنا دیواران خۆیان قایمکرد، مامەکانم و کوڕەکانیان بە هانامانەوە هاتن، شەڕە گوللە تادەهات گەرمتر دەبوو، دەیان گوللە بە بنا گوێماندا گیزەیان دەهات و لە دەورو بەرماندا بە دارو دیواران دەکەوتن. ماوەی زیاتر لە دوو کاتژمێر شەڕە گوللە بەردەوام بوو، ئەو شەوە شەڕەکە بێ زیان بوو.. ئێوارەی ڕۆژی دواتر کە خۆر خەریک بوو لەناو زەردایی خۆی تارای سووریاوی بەسەرەخۆیدادەداوخۆی بە تەواوی لە چاوان دەشاردەوە، برایەکی ئەم دەروێش رەحیمە نەگبەتییەی مێردم بە ئەنقەست دووسێ جار بەبەر دەرگای ماڵی ئێمە تیپەڕیبوو، لەو کاتەشدا برا گەورەکەم لەبەر دەرگا دەبێت کە هەردووکیان بەدوای هەنجەتێکدا دەگەڕان، وەک پووش و پەلاشی وشک یەک دەنکە شخاتەیان بەس بوو بۆ ئەوەی ئاگر بگرن، پلارێک لەم و جوێنێک لەوی گڕی پێگرتن، لەپڕ بووە شەڕە شەق و شولاق و کەللە، ئاگری شەڕ بەتەواوی داگیرسا و پرپشکیدا، لە دوو زلە پووشەوە دوو دەسکە پووشی گرتەوە، لەوانیش پەرییەوە دوو بەرە باب تێکقژقژان. بە پەنادزە و بەسەر پێپلیکانەکانەوە و بە کوورە کوورە خۆم گەیاندە سەر بانی، لە پەنا دیوارەکان سەیرم دەکرد،ژمارەیەکی زۆر پیاوی دەست بە خەنجەرو چەقۆم دەدیت، شان و پیل و سینگ و ورگ و ڕانی یەکدییان دابووە بەر نووکی خەنجەرو چەقۆیان. باوک و براکانم دەبینی خوێن بە دەموچاوو سینگ و بەرۆکیاندا دەچۆڕایەوەو لەشەڕکردنیش هەر بەردەوام بوون و دەستیان نەدەدا. هەر بابایە و لە هەردوولا دەکەوتە خوارەوەو تەکانی دەدایە بەرە خۆی و ڕاست دەبووەوە، هی واش هەبوو دەکەوتە سەر زەوی و لە بێ هێزییان ڕاست نەدەبووەوە. بەرە بەرە

دەبووە شەوو تاریک دادەهات، لەبەر تاریکایی شەوەکە و خوێنی دەموچاوەکان بە تەواوی نەمدەزانی بریندار لە کامەلایە و لە چ بەرەیەکی شەڕدایە، پیاوی ئەوانە یان هی خۆمان. خەڵکی گوندی- منداڵی لێدەرکەی- ژن و پیاو بەبێ ئەوەی هۆکاری شەڕەکە بە تەواوی بزانن لەو شەڕەدا هاوکارو بەشداربوون، وا تێکەڵاوی یەکدی ببوون زۆربەی ئەوانەی دەچوونە ناو شەڕەکە نەیاندەزانی کێ لای کێیە... دەڵێن- گۆشت و نینۆک لەیەکدی جیا ناکرێنەوە- بۆیە من و دایکم و خوشکێکی لە خۆم گەورەتریش یەک و بەرچیخمان دەستداین و بووینە هاوکاری باوک و براکانمان، لە ئەنجامدا ئەوان کەلاکێکیان لە پەنا سەرتیلەیەکی خانووی ئێمە بەجێمابوو، جگە لەوەی چەندین بریندار لەهەردوو بەرەباب هەبوو، دووان لە براکانی منیش بەسەختی بریندار ببوون. چێشتەنگاوێکی درەنگ مەئموور مەرکەزێک و چەند پۆلیسێک بەناو گوندیدا وەربوون، باوکم و براکانم و دوو مامم دەستبەسەر کران و ڕەوانەی بەندیخانە کران، ئەو کوژراوەش کە لە پەنا دیواری خانووی ئێمە کەوتبوو دەرکەوت برای ئەو پیاوە ناپیاوە بوو کە تۆ بە دەروێش و مێردی منی دەناسی، ئەو ناپیاوە خۆشی بریندار ببوو. دوای ماوەیەک جگە لە هەردوو براکەم، هەموویان بە کەفالەت ئازادکران. بەرەبابی ئێمە زەوی و زارو خانووبەرەی خۆیان بەجێهیشت و بەرەو گوندێکی دیکە باریانکرد. گەورەی گوندی کێچی کەوتە کەوڵی و بە ڕێویاتی خۆی ویستی ڕۆڵی ناوبژیوان لەنێوان ئێمەو ئەواندا ببینی، بۆ ئەو مەبەستەو لە پێناو دڵنەوایی خانەوادەی ئێمە، ئەو دەروێش ڕەحیمەی خستە بەندیخانە کەبرای کوژراوەکە بوو. گوایە ئەو هاندەری هەڵگیرسانی شەڕەکە بووە. لەلایەکی دیکەشەوە لەرێگەی کێخوای ئەو گوندەی بۆی چووبووین پەیوەندی بە باوکم و براکانم کردو خۆی وانیشادا تەرەفگیری ئێمە دەکات و دەیەوێ کۆتایی بە دوژمنکارییەکە بهێنێ، باوکیشم چاک دەیزانی ئەگەر مەسرەتی نەکات کوڕەکانی لە بەندیخانە ڕزگاریان نابێت. ئەنجامی مەسرەتییەکەش ئەوە بوو من لە تەمەنی چواردە ساڵیدا لە بەدەل خوێن پێشکەش بەو پووخە پیاوە کرام.

مامز ئاخێکی قووڵی ناخ سووتێنەری شۆڕکردەوە هەناوی، نەک هەر هەناوی خۆی، هەناوی کارۆشی سووتاند. چەند قولانجێک لە کارۆ دوور کەوتەوە و لێی مۆڕ بووەوە: ها پەڕەسێلکە تێمگەیشتی؟ ئەگەر وا نەبوایە من و ئەو کاڵەکە سندانداریە هەناوپووچەیان گۆتبوو. بەسەری تۆ نا بەسەری خۆم، بەسەری

دایکم کەلە هەموو کەسێکم زیاتر خۆشدەوێ، چونکە ئەگەر بەهەڕەشەی کوشتن و ناچاری نەبوایە قەت دایکم ڕازی نەدەبوو من لەو گندۆرە دەربە مارە بکرێم.
بەسەری ئەو دایکە بەوەفایەم، سێ ساڵی ڕەبەق ئەگەر هەموو ڕۆژو شەوو مانگەکانی بخەیەوە سەر یەکدی، سێ مانگ لای ئەو کابرایە نەبووم، ئەو سێ مانگەش هەمووی بخەیەوە سەر یەکدی، واتە لەتەواوی ئەو سێ ساڵەدا پازدە شەو لەگەڵی نەخەوتووم.
کارۆ لەخەوان کارێژی نەدەچوونەوە پار یەکدی دەتگۆ پلایزی دەستی دارتاشانە بەردەوام بزماری لەداران دەردەکێشی، خاو ببووەوە و بە خاویش سەیری مامزی دەکرد، بەڵام چیرۆکەکەی بۆنێکی لێدەهات و بۆنەکەش هەستی دەورووژاند: سەربردەکە بۆتۆ ناخۆش بوو. بەڵام بۆمن..
مامز پێی بڕی: بۆتۆچی؟ بۆخۆتم دەبەی؟ لەدەست ئەو نامەردەی ڕزگارم دەکەی؟
_ پەلەی مەکە بیر دەکەمەوە....کارۆ هیوای بە مامز بەخشی.
_ باشە ترسنۆک پەلەی ناکەم، با تاوانیکی دیکەشت بۆبگێڕمەوە: بەر لەوەی بەزۆر بمخەنە باوەشی ئەو ڕێوییە گرووەی،بێوەژنێک لە کۆلانەکەماندا هەبوو، کوڕێکی تاقانەی هەبوو ناوی (زەندی) بوو، دایکی دەیگوت بە ناوی (کەریم خانی زەندی) مان کردووە، ئەو دەیگوت ئەو پیاوە- واتە کەریم خانی زەندی - بە ڕەچەڵەک کورد بووە و لە سەردەمی خۆیدا پاشای هەموو ئێران بووە..
ئەو دایک و کوڕەماڵیان بەرامبەر ماڵمان بوو،هاوتەمەن بووین، کەمنداڵ بووین پێکەوە یاریماندەکرد،پشتمان بەپشتی یەکدییەوە دەنوساندو یاری پشتەڕەقێمان دەکرد، چاوی یەکدیمان دەبەستایەوەو یاری چاوشارکێمان دەکرد، هەموو جۆرە یارییەکمان دەکرد، دەچوومە ماڵیان یارمەتی دایکیم دەدا پیاڵەو مەلاکەکانم بۆ دەشوشت، ئاوم بەدەستی دایکی دادەکرد، ئەوەندە متووی ئەو کوڕە ببووم دایکم دەهات بمباتەوە کەچی من دەگریام و جەنەم دەگرت بۆ ئەوەی نەمباتەوە، ناچارپەلی دەگرتم و پەلکێشی دەکردم بەزۆر دەیبردمەوە. کە منداڵ بووم ڕۆژانە ئەوە حاڵم بوو، کەگەورەش بووین پێکەوە دەچووینە کەنگرو ڕێواسان، بەمنداڵی چەندم خۆش دەویست بە گەورەیی دە هەندە، من چەندم خۆشدەویست ئەو دە هەندە منی خۆشدەویست. خۆشەویستییەکەمان ڕۆژ بەڕۆژ و مانگ بەمانگ و ساڵ دوای ساڵ، بست بە بست گەورە و گەرەتر دەبوو. کە وەک مشکێکی بێ نرخ

کلکیان گرتم و لەقەبەر ئەو پیاوە چلکنەیان کردم خەیاڵم هەر لای ئەو کورە بوو، ئەگەر ڕۆژێک نەمدیبا شێت و هار دەبووم، من زۆر بیرم لەوە دەکردەوە سەری خۆمان هەڵبگرین و بەرەو شارێک یان وڵاتێکی دیکە بڕۆین، بەڵام لەوە دەترسام نەوەک ئەو پیاوە پیسکەی من بە پشتیوانی گەورەکەیەوە بماندۆزێتەوە و لەناومان ببا. ئەو کورە بەتەنیا بوو، پشتیوانێکی نەبوو دایکێکی قوڕبەسەر چی پێدەکرا، تەنها ئەگەر شین و واوەیلای بکردبوایە... ڕۆژو شەوەکان زۆربەگرانی دەڕۆیشتن بەتایبەتیش شەوەکان. هەرلە ئێوارەوە تاکوبەیانی دەخەوتم و ڕادەپەڕیم، شەوی وا هەبوو خەو وردە پیاسەیەکیشی بۆ لای چاوەکانم نەدەکرد، لەناو جێگاکەمدا هەڵدەتوترکام وەدەگریام، نەمدەهێشت ئەو مێردە نامەردەم دەستم لێبدا. دوای دووساڵ لەو ڕەوشە ناهەموارەی تێیدابووم، کەتاکە هیوام ئەو کوڕە بوو، لەناکاو لێیان بزرکردم، زۆرلەو ژنانەم ڕاسپاردن کە جێی متمانەم بوون بێ سوودبوو. ئەو پیاوەو دارو دەستەی ماڵێ گەورە سەرەتا گوند بەدەریانکرد، دواتریش شوێنبزریانکرد، هەندێک گوتیان بردیانە گوندێکی دوورەدەست قەت نەگاتەوە ئێرە، بە بڕوای هەندێکی دی ڕەوانەی ئێرانیان کرد.
قەلەڕەشەی ترس باڵەکانی هەڵشەقاند لەسەر سەری کارۆ نیشت بە دندوکێکی قولابی ژانی پێگرت و سەری سووڕاند: ئەوە چ دەعبایەکە منیش شوێنبزر نەکا.
_ نا مەترسە بەنیازە تۆ بکاتە زاوای خۆی.
مامز دڵنیایی دایە کارۆی، بەڵام هەناوی لە مێردەکەی دەکوڵا لە گێڕانەوەی تاوانەکانی وازی نەدەهێنا، زیاتر خۆی بە کارۆ وە نووساند: ئەوەی باسمکرد چەنگێکەلە خەرارێک- هەردوو سێ مانگێک دوای ئەو تاوانەی، مەلاژنێکی تازە پێگەیشتووی جوانی گۆشاوگۆش سەربڕیبوو کۆرپەلەیەکیشی لە زگیدابوو، خۆو بەخت مەلا ی مێردی ئەو کاتە لەماڵ نەبووە ئەگەرنا ئەویشیان بەهەمان دەرد دەبرد. لەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا کون بە کون بە دوای ئەو مەلایەشدا دەگەڕێن بیکوژن. یەکێک لەوانەش ئەو (دەروێش ڕەحیم)ەیە، کە نە دەروێشەو نە بۆ زیارەتی غەوس هاتووە، بۆ سۆراخکردنی ئەو مەلایە گەڕەک بە گەڕەک، مزگەوت بە مزگەوت بە دوایدا دەگەڕێ.
وەک ئەوەی نەقیزەیەکی لە ناکاوی تێوەژاندبێ کارۆ بە توندی ڕاچڵەکی: تۆو خودا ئەو مەلایە ناوی چییە !؟
_ گیانەکەم خۆر خەریکە سەرەتاتکێمان لەگەڵدا دەکات، خەڵکی ناو حەسارەکە

بمانبینن حەیامان دەچی، سبەی شەوێ بە تەواوی بۆت باسدەکەم.
کار هەر بەو شەوە ڕانەوەستا، هەر گوناه بوو پەلی گوناهی ڕادەکیشا، نەک گوناهێک و دەیان بوونە گردەکانی زنجیرەی چیا، خودا زۆر بە پەلە نامەیەکی ئاگادارکردنەوەی بە هەموو زمانێک بڵاو کردەوە،بۆ کوێرو چاوساغ و شەلە، بۆ کوردو عەرەب و فەلە،کەسی ناو حەسارەکە نەما تێنەگا، بووە مقۆ مقۆی- شێر مامزی لە خرتۆرێ وەردا- هەندێ لە ماڵەکانی ناو حەسارەکە کورد بوون، منداڵی ئەوان و هەندێ منداڵی گەڕەکەکە، کردیانە چەپڵەڕێزان و بووە بنیشتە خۆشەی سەر زاریان (دەروێش ڕەحیم گەوادە پشتی ملی لبادە).
چیشتەنگاوێک ئیبتیسام بەسەرداچوو. ژنێکی بێ عەباو پەچە. کوپێک چاو قاپە ماستێک و دوو نانی لە سەر مەجمەیەک دانابوو، بەرەو چاوە خانووەکەی کارۆ دەچوو، کە ژنە چاوی بەوی کەوت وەکو کوتکێک بە ناوچەوانی کەوتبێ پاشەو پاش گەڕایەوە. ئیبتیسام ڕاوەستا بزانی بۆ کام لا دەڕوا، کەچی ژنە لە پەنا دیوارێکی ناو حەسارەکە خۆی حەشارداو لە بەر چاوی ونبوو. ئیبتیسام قرقرا بەلام بە سەرەخۆی نەهێنا، ئەو ڕۆژەی وەکو هەموو ڕۆژەکانی دی نەبوو، ناوە ناوە سەری بە دەرەوە دادەگرت، دەیویست ئەو ژنە ببینیتەوە بزانی جوانە یان نا،غیرەت گەیشتبووە کونە لووتەکانی، هەروەک منداڵیەکەی جارانی بیری دەکردەوە، وایدەزانی منداڵێک هاتووە بووکە شووشەکەی دەفڕێنێ و دایک و باوکیشی جارێکی دی بۆی ناکڕنەوە.
ئەو ڕۆژەش وەکو ڕۆژانی پێشتر ئێوارە داهات بەلام بە شکستی دڵ ئیبتیسام ڕۆیشتەوە، وەکو تەرمێک خۆی هاوێشتە باوەشی نوێنەکانی و پاڵکەوت، مۆلەقی چاوەکانی بنمیچەی ژوورەکەیان تیرباران کرد. شەو درێژ بوو، دەریای خەو لە ڕاست و چەپ شەپۆلی دەدا کەچی نقومی نەدەکرد، گاشە بەردێکی ناو قەفەزەی سینگی فشاری خستبووە سەر دڵی، هوڕێنە دوای هوڕێنە: خودایە چ گێلایەتیەکم بە مێشکدا هات ئەو حەسارەم بۆ گرت، ئەو حەسارە کاولگەیەی لە سیرە سیرەی دەرگای ژوورەکانی و گزە گزی مێشان زیاتر نابیستی، دەبێ لەو تەقە تەق و پیس و پۆخلانەی ئەوێ رزگاری بکەم. ئەوەی گوت وپلی بە پەلاپیتکەی مێشکە پەمۆییە پەرەکراوەکەی خۆیەوە نا، گوللەیەکی پێتەقاند و نیشانەکەشی پێکا: لەبەر گوتە گوتی خەڵکی حەسوود و چاوچنۆک، لەبەر جرت و فرتی چەتەو ڕێگران ناوێرم بە یەکجاری بیهێنمەوە ئەو ماڵەی خۆم،

باشتر وایە ئەم خانووە بفرۆشم، بە پارەی ئەم خانووە لە گەڕەکێکی دیکە خانوویێک بکڕمەوە، یان ئەمە بە کرێ بدەم و لە شوێنێکی دی خانوویێک بە کرێ بگرمەوە، هەر چۆنێک بێت گرنگ ئەوەیە لێرە بار بکەم.
وەکو شاخێکی پتەو بە بلدۆزەری دڵی نەڕووخا، دێنەمێتی مێشکی بەکارهێنا: ئەو کوڕە بە پێوەری پێشکەوتنخوازی پاشکەوتووە،لە زەلکاوی رابردوودا مەلە دەکا، لە رووباری تیژڕۆی ئێستا و ئایندەدا نایەوێ خۆی بشوا، هەتا تامی شیرینی ئێستای من نەچێژێ نەفرەت لە تاڵ و تفتی ئەوەی رابردوو ناکا،بۆ ئەوەی بەرەو رابردوو هەنگاو بنێم پێویستە ئەوەی ئێستامی لە دەست بنێم.
بەڵێ خۆ من کراسەکەی حەزرەتی داودم لەبەردا نییە، خۆ کفنەکەی ئەوم بۆ نەدروایە هەتا وەکو ئەو هەزار ساڵ بژیم، پێویستە بە پەلە هەنگاو بنێم.
(شەو) وەکو کەنفەر بازی دەدا، مەلۆتکەی خەمی (ئیبتیسام)یشی لە توورەگەی باوەشی خۆی هەڵگرتبوو، ئەویش باویشکێکی درێژ هەردوو پێلوەکانی داخست و لە ناو تەم و مژی ئەندێشە پەرتبووەکانیدا ونبوو.
کارۆ بە دارە دارە و بە پێی خۆی دەڕۆیشت، برینەکەی رانی سارێژ ببوو، زامەکەی سەر شانی هەندێک ئازاری هەر مابوو. لەو ماوەیەدا پەڕەسێلکەی ویست و حەزی گەیشتنی بە مەلای مزگەوتەکە زۆر بە پەلە بوو: ئەگەر بە شەلەشەلیش بێ دەبێ خۆم بگەینمە مەلای، مامز قسەیەکی کرد دەبێ دڵنیا بم ئایا مەبەستی ئەو مەلایە بوو یان نا؟ ئەگەر ئەم دەروێشە سیخوڕە بۆ ئەو مەبەستە هاتبێتە بەغدا خۆم دەزانم چی دەکەم، دەبێ ئەو شیرەی دایکی پێی داوە لە لووتی دەربهێنم. دایکم دەیگۆ- ئەگەر دەرزییەک بە یەکێکدا بکەی چاوەڕێی سووژنێکی لێ بکە.
نێوان عەسرو مەغریب بوو، بە هەلی زانی ئەو دەمە ئیبتیسام لەلای نەبوو، لە دەرەوەی حەسارەکە پەیتونێکی بە کرێ گرت و گەیاندییە مزگەوتەکە. مزگەوتی چی !!؟ دەرگا گەورەکەی دەرەوەی بە قایمی تۆپ و کلیل درابوو، لە دەرەزەکانی دەرگاکە سەیری ژوورەوەی مزگەوتی کرد، بە هەمان شێوە دەرگای ژووری مەلاش مکوم کرا بوو. پێی سەیر بوو: نزیکی بانگی مەغریبە دەبوایە دەرگای مزگەوت لەسەر پشت بێت. چاوی بەملاو بەولادا گێڕا، دوکانێکی تەنیشت مزگەوت کرابووەوە، لێی چووە پێش یەکدییان ناسییەوە، لێی پرسی: برا، نازانی دەرگای مزگەوت بۆ داخراوە !؟

دوکاندارەکە سەری هێنایە بن گوێی: هیچت نەزانیوە؟
_ نا وەللا.
دوکاندارەکە سەیری پێهات: ئەدی تۆ شەوان لەم مزگەوتە ناخەوی، چۆن نا وەلـلا !؟
دواتر دوکاندارەکە سەری زیاتر بردە بن گوێی، بۆ ئەوەی چۆلەکەش گوێی لە دەنگی نەبێت هەردوو دەستیشی بەرز کردنەوە و لەملاو لەولای دەوی خۆی گرتن: چەند شەوێک پێش ئێستا، نێوان نوێژی مەغریب و عیشا، من هێشتا دەرگای دوکانەکەم دانەخستبوو، چاوەڕێم دەکرد مەلای عیشا بانگ بدا، دەرگای دوکانەکەم دابخەم و نوێژەکەم بە جەماعەت بکەم و بڕۆمەوە، کەچی دەزانی چیم بینی !؟ حەشری بنیادەمی سەر زەویم بینی !! بینیم دوو پیکابی پڕ پۆلیس و جەندرمەی زەمانی کۆن، نازانم ناویان چی لێ بنێم؟ سیکەو گورگە بوون یان دەعبا. لەبەر دەرگای مزگەوت وەکو باشووکە دندووکیان تیژ هاتنە خوارەوە، هەر بە غار خۆیان کوتایە ناو مزگەوت. ئای خودایە چیم بینی !!؟ مەلایان بە کەوێ و سەلتەوە بە ڕاکێشان ڕادەکێشا !! هەر چوار پەلیان گرتبوو هەر بە فڕێدان فڕێیان دایە ناو پیکابێک و لەبەر چاوان بزریان کرد. بۆ بەیانیش هاتن دەرگای مزگەوتیان وەک ئەوەی دەیبینی تۆپ و کلیل دا، ئەوە چەند ڕۆژە هەر پێنج فەرزە یەک نوێژی لێنەکراوە.
کابرای دوکاندار هەنگاوێک بەرەو دواوە کشایەوە، کەچی کارۆ وازی نەهێنا: نەتزانی مەلایان بۆ بەو پەندە برد !!؟
_ تکایە، منجڕی مەکە با من و تۆش نەبینە خۆراکی کێچ و ئەسپێیان.
کارۆ لە مەبەستەکەی گەیشت، شار لەبەر چاوی ئاوەژۆ ببوەوە، ئەو وای دەزانی بووەتە چۆلەکەیەک لە نێوان چڕنووکەکانی باشووکەیەکی دەنووک قولابی بە ئاسمانەوەیە و دەنگی ناگاتە زەوی ناچار هەردوو دەستی بەرز کردنەوە و هانای بردە بەر ئاسمان: ئای خودا ی گەورە هەر ئەو پنچکەم هەبوو دەستی پێوە بگرم ئەویشت هەڵکێشا. لە هەمان شەقامی بەر دەم مزگەوتەکە بە شەلەشەل سواری پەیتونێک بوو، کە گەیشت و دابەزی- نەک هەر لاقە زامدارەکەی- لە خەفەتان ڕاستەو چەپەی پێکەوە چەقین، وەک ئەسپێکی سم براوی تازە ناڵکراو غەزرییبوون، سەیری لە سەرەوە تا خوارەوەی خۆی کرد: با وات لێبێ، وەکو کەری هیشکەڕۆ بە نەقیزان نەبی ناڕۆی.

## ١٦

مـەلای مەغریب تـازە بانگـی دابـوو ئیبتیسـام چەنـد جـۆرە خواردنێکـی لـە گـەڵ خـۆی بـۆ کارۆ هێنابـوو، لـە چاوەڕوانـی گەڕانـەوەی ئـەودا خـۆی کەوانـە و گرمۆڵـە کردبـوو: ئـای لـەو پیـاوە سەرکێشـەی؟ ئامۆژگاریـم کـرد بـە هیـچ لایەکـدا نـەڕوا کەچی بە بێ ئـاگاداری مـن ڕۆیشت، بـۆ کـوێ ڕۆیشت نازانم، وەختـە شێت بم لـە دەسـتی، لێـم بـووە بـەو کاکیلەیـەی دواوەی ددانەکانـم نـاوە نـاوە هـەو دەکا و ژانـە سـەری پـێ دەگـرم، بـە دەرکێشانیشـی کەلـۆس دەبـم و نانـم بـۆ ناخـورێ. هەمـووی بەخـت و ناوچەوانـە ڕەشـەکەی منـە، مـن خـووم بـەو بەدبەختییـەم گرتـووە لێـم بووەتـە ئاسـایی، گرفـت لەوەدایـە ئـەو بـە بەختەوەرییەکـەی خـۆی نازانـی.. خوێنـی دەمارەکانـی لـە فرکـە فـرک کـەوت، مێروولـە ئاسـا لـە سـەرەوە بـۆ خـوارەوە شـۆڕ دەبـووەوە و لـە خـوارەوەش بـۆ سـەرەوە بـە حـەلا وەلا بـەرز دەبـووەوە. هیچـی لـە دەسـت نەمابـوو هـەر خـۆی دەدوانـد: بـا هـەر دەرەوەم فێنـک بێـت سـوودی چییـە هەنـاوم تەنـدوورەو ناخـم دەسـووتێ... دەعبـای نائومێـدی خـۆی لـێ داممووسـاندبوو، سـەنگەری لـێ گرتبـوو، ئـەو دیسـان خـۆی دوانـد: نائومێـدی بـەر لـەوەی هەسـتی پـێ بکـەی بۆنـی دێـت، بۆنـی بـە بۆنـی ئـەو پیسـاییە شـلە دەچێـت کـە لـە پاشـەڵی هەنـاو بۆگەنییـک دەردەچێـت.

لـەو کاتـەی ئیبتیسـام لـە تـەک خەیاڵـە دابـڕ دابـڕو بەرەڵلابووەکـەی بـە لاپەڕەکانـی ڕابردوویـدا دەگـەڕا، هەمـان ئـەو ژنـەی پێشـتر بینیبـووی، ئـەو ژنـەی لـە پەنـا دیـوار و خانووەکانـدا لێـی بـزر ببـوو، ئـەو ژنـەی بەیانیـەک لـە سـەر مەجمەیـەک ماسـت و چایـە و نانـی بـۆ کارۆ هێنـا بـوو، ئـەو ژنـەی ئـەو بـە باشـی نەیدیبـوو، ئـەو ژنـەی ئـەو نـاوی نەدەزانـی، ئـەو ژنـەی ئـەو مەرەقـی بـوو بزانـی حوانـە یـان نـا، ئـەو ژنـەی بەبـێ ئاگایـی ئـەو چەندیـن شـەو بـە دەسـتە نەرمەکانـی کارۆی چـەور کردبـوو، بـە سـەری پەنجەکانـی شـێلابووی، بـە بـێ تـرس و بـێ شـەرم تاکـو بەیانـی لـە باوەشـی پاڵکەوتبـوو، ئـەو ژنـەی ژنـی ئـەو دەروێشـە درۆزنـە بـوو کـە حەزرەتـی غەوسیشـی شـەرمەزار کردبـوو، ئـەو ژنـەی تەکپـەڕ بـوو، سـۆزانی و دایـم پەڕنەبـوو. بەڵـێ ئـەو ژنـە لـەو کاتـەی ئیبتیسـام لـە ژووری کارۆی دانیشـتبوو، بـە خـۆو بـە مەجمەیەکـی پـڕ لـە خـواردن پێـی لـە کۆسـپی دەرگای ژوورەکـەی کارۆ ئاودیـو کـرد، کوتـک و سـنگی ڕووبـەڕووی یەکـدی بوونـەوە، کامیـان کوتـک و کامیـان سـنگ؟ هـەر خـودا دەیزانـی.

مامـز هیـچ پەناگەیەکـی بـەر چـاو نەکـەوت خـۆی تێـدا حەشـار بـدات، ئـەو گـەوزە گـەوزی لـەو ژوورەدا زۆر دیبـوو، حەپـە حەپیشـی لـە گەڵ دەروێشـە درۆزنەی مێردیشـی زۆر کردبـوو، لـەو جـۆرە تەنگانـەو هەڵوێسـتانەدا پەکـی نەدەکـەوت، نەدەحەپەسـا و پێـی ئـاو خواردنـەوە بـوو. کردییـە فشـە، پـڕ بـە زگ پێکەنـی و بـە دەو کردییـە قاقـا: ئـەو کـوڕە بەسـتەزمانە نەخۆشـە بـۆ خـۆی هیچـی پـێ دروسـت ناکـرێ، زگـم پێـی سووتا گوتـم بـا نانێکـی بـۆ ببـەم بیخـوا.

_ کوێت بۆ سووتا؟ ئیبتیسام لە مامزی پرسی.

مامز وەلامی ئیبتیسام ی دایەوە: زگم

_زگت یان بەرزگت؟ ئیبتیسام بە تووڕەیی بە مامزی گوت.

مامـز لایەکـی دیکـەی بـە ئیبتیسـام نیشـان داو دەیویسـت لـە خشـتەی ببـات: ئەیـەرۆ، سـەرت بـەرز بکـەوە ڕووت لـە ئاسـمانێ بکـەو خـوای بناسـە، مـن دەروێشـی غەوسـیمە تـازە لـە زیارەتـی هاتیمـەوە.

ئیبتیسـام ئەوەنـدە ئاسـان نەبـوو بکەوێتـە داوی ژنێکـی وەک مامـز: دەتـەوێ بـە زیارەتـی غەوسـی نـاو گەلـت پـاک بکەیتـەوە؟ زۆر سـەهووی. ئـەوەی گـوت و سـەری بـۆ ئاسـمان بـەرز کـردەوە: خودایـە باجـی گوناهەکانـی ئـەو جـۆرە کەسانە بـە ئێمـەی مـەدەوە. ڕووی لـە مامـز کـردەوە، ویسـتی بـە تفێـک ڕووی بشـواتەوە دواتـر پەشـیمان بـووەوە، لـە جیاتـی تـف پەندێکـی بـە ڕووی دادا: ئەگـەر درۆ بـە چـوار لاقـان بـڕوا، بـەڵام ڕاسـتی هێـواش هێـواش- ئـەو دەمامکـەی ڕوخسـارت پـێ شـاردۆتەوە ئەمـڕۆ نـا سبـەی بـەم دوو دەسـتانەم لایـدەدەم و ڕووی ڕاسـتەقینەت دەردەخـەم.

مامـز ڕەتـی دایـەوە: منیـش پێـت دەڵێـم- درۆ هاوڕێیەکـی بـێ وەفایـە ئەمـڕۆ نـا سبـەی لێـت هەڵدەگەڕێتـەوە و هەمـوو کردەوەکانـت ئاشـکرا دەکا، تـۆ کێـی؟ چـی ئـەو کوڕەی؟ کـەس نازانـی !! کـوا چیـت بـەو کـوڕە دەچێـت؟ زمانـە خوارەکـەت؟

مەسـەلەکە لـە نێوانیانـدا بـە جۆرێـک پەیـت و خەسـت ببـووەوە مڵاکـی تێنەدەچـوو، ئیبتیسـام ویسـتی هەناسـەیەکی زۆر قـووڵ و بـە پەلـە بـەرەو خـوارەوە شـۆڕ بکاتـەوە، لـە برووتنـەوەو هەڵپـەڕ هەڵپـەڕی سینگیەوە دیـار بـوو هەناسـەکە زۆر گـران و ئەسـتەم بـوو، ڕوخساریشـی لەگـەڵ ئـەو هەناسـەیە شـین و مـۆر هەڵگـەڕا بـوو، وەک بڵێـی دوژمنێـک ناولەپـی لەسـەر دەوی و بـە دوو پـل کونەلووتەکانـی گوشـیبێ و بیـەوێ بیخنکێنـێ. بـەڵام لـە سـاتە وەختـی خۆیـدا دیسـان مێشـک بـە هانایـەوە هـات، پلـی بـە زەنگـی دەرگای ژوورەوەی کەللەیـەوە نـا، زەنگێکـی نەرمـی بـۆ لێـدا: ئەسـپی

ئارەزووەکانی دڵت بەرەڵلا بووە و سنووری خاکی خۆتی بەزاندووە، چەند زووتر بیبەستیەوە هێشتا کەمە، ڕاستە ناخت ئازار دەکێشێ بەڵام بەو شێوازەش ژیانی خۆت وێران دەکەی، ئەو ژنە جوان و دڵکرە، نێچیرێکی چەورە بۆ رابواردنی پیاوان، هەڵەوەڕو بێ شەرمیشە- لە دەرگاوە دەری بکەی لە پەنجەرەوە دێتەوە ژوورەوە- تۆ چەندین جار بە خواردنەوەی ناخت وەک مەیخۆرەوە سەرخۆش بووی، پێت وابوو پاڵەوان و ڕۆستەمی زاڵی، کەچی ئێستا مستێ ئاوت لێ بووەتە دەریا، لە جۆگەلەیەکیش نەتتوانی بپەڕیەوە.. ئیبتیسام کەوتبووە بەر هێرشی ئازارو ژان، ڕوخساری بە خوێنی ڕەش پەندما بوو، پڕ ببوو، خڕ ببوو، زەنگی مێشک شێلان بوو، سۆراو بوو سپیاو بوو، خوێنی ڕەشی دەمارەکانی پەرت کرد: دەڵێن- دوژمنەکەت زیاتر لە دۆستەکەت لە خۆت نزیک بکەرەوە، تاکو هەردەم لەبەر چاوت بێت- بەڵێ شێوازی هەڵس و کەوتم بەرامبەری دەگۆڕم.. ئیبتیسام وای پێ باش بوو بۆیە شێوازی قسەکردنی خۆی گۆڕی، نەرمی نواند: خوشکێ شەڕی من و تۆ بێ هوودەیە، ئەگەر دەستمان لە تیتکی یەکدی بەر نەدەین خەڵکی ناو ئەم حەسارە گاڵتەمان پێدەکەن.
مامزیش ئارام بووەوە: خەتای تۆ بوو لە جیاتی سوپاسم بکەی شەڕم پێ دەفرۆشی.
_ خوشکێ، منیش مافی خۆمە، ئەو تاکە برایەم هەیە دەمەوێ بیپارێزم.
_ خۆ گورگ نیم بیخۆم، مرۆڤم، هەستی مرۆڤابەتیم پاڵی پێوەنام هەنار بۆ نەخۆش بهێنم، چی تێدایە؟ مامز گوتی.
دوو ژنی تەڵەکەبازو تەڵە تەقێن، یەکێکیان تەڵە دادەنێتەوە و یەکێکیان بە کلکی دەیتەقێنێتەوە. سوارە شمشێر لە دەستەکانی پێشتری ناو گۆڕەپانی کەللەیان چۆلیان کرد، توانج و پەلارەکان دەستی یەکدییان ماچ کرد، شەڕە قسەو شەڕە جوێن نەما، بوونە دەستە خوشک. ئیبتیسام باوەشی لە مامزێ وەرێنا ماچی کرد و لێی پرسی:من ماوەیەکە ئەو برایەم هان دەدەم هاوسەرێک بۆ خۆی پەیدا بکات کەچی ئەو هەر بێ دەنگە، تۆ لێی نزیکی و بیستوومە شەوان دێیە لای و زۆر دەمێنیەوە. مەبەستمە بڵێم قەت ئەو بابەتەت لەگەڵدا نەکردۆتەوە؟ئیبتیسام مامزی تاقی دەکردەوە.
مامز هەوڵ دەدا ئیبتیسام دەستخەرۆ بکات: ئەیەڕۆ خوشکێ، قسەیەکی وا بکە عەقل باوەڕی پێ بکا، من چۆن لەگەڵ زەلامی عالەمێ دەوێرم باسی ئەو جۆرە

بابەتانە بکەم.
ئیبتیسام بەمەزەندەی خۆی (مامز)ی بە ڕێوی دانابوو، تەڵەی بۆ دادەنایەوە، پێی دەگوت: چی تێدایە؟ ئەوە نییە هەستی مرۆڤایەتیت پاڵت پێوە دەنێ خواردنی بۆ دەهێنێ.
مامزیش ئاقڵ بوو، بەتەڵەیەوە نەدەبوو: چۆن چی تێدایە؟ دەتەوێ لووتم ببڕن.
_ کێ دەیبڕێ؟ئیبتیسام لە مامزی پرسی.
ئەو فیشەکانەی ئیبتیسام دەیویست لە (مامز)یان بگری هەموویان چرووکیان دەکرد، سەرباری ئەوەش مامز (ئیبتیسام)ی دەترساند، پێی دەگوت: با پێت بڵێم کێ دەیبڕی. مێردم لووتم دەبڕی، ڕا ت لێی نییە؟هەر کرپە با هەردووکمان زیندە بە چاڵ نەکا. دیارە لە گوێی گادا نووستووی؟ بە خوا هەر فیکەیەکی ئەومان بەسە. دەیویست زیاتریش ئیبتیسام بترسێنی: ئەو پیاوی ماڵی بابە گەورەیە،دەتوانی وامان لێبکا کەس گۆڕەکەشمان نەدۆزێتەوە.
ئیبتیسام تێگەیشت ئەو ژنە زۆر ڕەقەکارە و هیچی لێ هەڵناکرێ، ناچار ناخی خۆی دواند: ژیان ئەوەیە لە کاتێکدا یەکێک دڵخۆش دەکەی لە هەمان کاتدا ژیانی یەکێکی دی وێران دەکەی.
مەیلەو تاریک دا هاتبوو. مامز بە بێ خواحا فیزی، بە بێ قسە، بە بێ ورتە، بە بێ ئاوڕدانەوە خواردنەکەی بەجێهێشت و بە بێ دەنگی و بە بێ منەت ڕۆیشت. (ئیبتیسام)یش چووەوە دۆخی جارانی، ناو قاوغی ڕەسەنی خۆی، مێشکی لە جیاتی عەقڵ پڕ بوو لە ژەهر: ژنێک بە پێوەری پیاوان لە من جوانتر، لەبلەبانتر، بێ ترس و بێ شەرمتر، نیفۆی دەرپێی لەلاستیقیش لاستیقتر،لە خۆشداکەنەش خۆشداکەنەتر. پیاوەکەشی سیخوڕی ماڵێ بابە گەورەی بێ، چی لەگەڵدا دەکرێ؟. دەستەوەستان وەستا، ناچار وەکو هەر ئافرەتێک تاکە چەکی بەکار هێنا، چاوەکانی بەو ژانە دەروونیەوە ئاوس بوون و بە ناوادەیی زان، چەندین مەلۆتکەی جمکیان بە سەر لا ڕوومەتەکانیدا شۆڕکردەوە، گریا گریا گریا. لەو کاتەی ئەو لە تەک خەیاڵە دابڕدابڕو بەرەڵلابووەکەیدا بە قوڵپی گریان بەلاپەڕەکانی خۆشەویستی (کارۆ)دا دەگەڕا. کارۆ بەلابارێک خەم لە پڕ بەسەردا هاتەوەو هەمووی لێ دەق و نووشت کرد، لێی پرسی:خانمەکەم چی بووە بۆ دەگری !؟.. گۆڕانکارییەکی فسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی، جەستەیی و دەروونی بە سەر (کارۆ)دا هاتبوو، بۆیە بەو شێوەیە دواندی..ئیبتیسام پێشتر

وشەی خانمەکەمی لە کارۆی نەبیستبوو زۆر پێی خۆش و لای سەیر بوو، ئەویش بە نەرمی پێی گوت: ئەگەر ناتەوێ خەم بخۆم و بگرییم بۆچی خەمم دەدەیێ؟.
کارۆتامی چەورکردن و شێلانی کردبوو، ڕەفتاری زۆرگۆڕیبوو، لە ژیانیدا یەکەم جاری بوو ژنێک لە گەڵیدا ببێتە قیرو بنێشت و شەوانە بە یەکدییەوە بنووسێن بۆیە لە نەرمیش نەرمتر وەڵامی دایەوە: چ حەدم هەیە خەمت بدەمێ.
ئیبتیسام گومانی لەو هەڵسوکەوتە نوێیەی کرد بۆیە کەمێک بە توندی دابەزییە سەری: ئەدی ئەوەی دەمدەیێ ئەگەر خەم نییە پێم بڵێ چییە؟ تۆ لە کاتێکدا لە ژێر چاودێری پۆلیسان دای، چەتەو ڕێگرەکان لە خوایان دەوێ بتبینن و شوێنەکەت بدۆزنەوە، برینی سەرشانت سارێژ نەبووە و لەبەر ژانی ڕانت لاقت بە دوای خۆت ڕادەکێشی. سەرەڕای هەموو ئەوانەش بە پووشکەیەکم دانانێی و بە بێ پرسی من دەڕۆی. لە دوای عەسرێوە لەو ژوورەی تۆ کوورژەم کردییەو لە چاوەڕوانی تۆدا چاوم خێل بوو هەندی بڕوانمە دەرگای حەوشە، ملم خوار بوو هەندی بەملاو بەولایدا خواری بکەمەوە، بیر دەکەمەوە ئایا گیرای؟ فڕێندرای؟ بریندار کرای؟ خوانەکا کوژرای؟ پێم بڵێ بۆچی ڕۆیشتی؟ بۆ کوێ چووی؟ چیت بەسەرهات بۆ دواکەوتی؟
کارۆ بۆنی مێینەیەک کەڵلەی تەزاندبوو، لە کونەکانی لووتیشیەوە ئەو بۆنە هێشتا هەر مابوو، بە نەرمییەکی ئەوتۆ ئیبتیسام ی دواند کە لە خودی نەرمیەکەش نەرمتر بوو: خانمەکەم، تۆ لە منت پرسی بۆ کوێ ڕۆیشتی؟ بۆ چی چووی؟ ڕۆیشتم سەردانی مزگەوتەکەم کرد بزانم کەل و پەلەکانم ماون یان نا، کە چووم دەرگای مزگەوت تۆپ و قوفلێکی هەندی سەری منی پێوەخرابوو، بە کلیلیش کلیل درابوو، لە یەکێک لە دوکانەکانی تەنیشت مزگەوتم پرسی، گوتیان: پۆلیس و ئاسایش بە شەو بە سەر مزگەوتیان دادابوو، مەلایان ڕاپێچ کردبوو کەس نازانی بۆ کوێیان بردبوو، ئەو سیخوڕە نارەسەنەی تۆ باسی دەکەی هەر ئەو دەروێشە فشەیە بە گرتنیداوە... خەنیلکەیەک ڕوخساری ئیبتیسامی گۆڕی: داخستنی ئەو مزگەوتە باشترین هەلی ژیانمە. لەمەو دوا جێلەق دەبێت، لە منیش زیاتر کەسی دیکەی نییە بیحەوێنێتەوە،خەون و هیواو ئاواتەکانم تەنیا یەک هەنگاو لێم دوورە.
سەیری کارۆی کرد وەک قەرەجێک لە جیاتی ناولەپی سەیر بکات ڕوخساری خوێندەوە:بەڵام ئەگەر ترسێک هەناسە برم نەکات و بتوانم ئەو هەنگاوە باوێم. دەترسم ئەو هەشبەسەرەش تێوەگلابێت. ئەگەر تێوەگلابێت ئەو دەفەوتێ و منیش

ڕەنج بە خەسار دەبم.بەرە بەرە ترسە ڕەشەکە بەری چاوی تاریک دەکرد: ئەو مەلایە دەست و پێ سپییە لە ژێر زەبرو زەنگی جەلادەکانی ناو بەندیخانە چۆن خۆی پێ ڕادەگیرێ،زۆر زۆر دەترسم و دڵم شتێکم پێ دەڵێ.. دەترسم ئەو ژنە وەڕ وەڕە، ئەوەی سیخوڕی سیخوڕان شەوان هاتبێتە بن پاڵی و هەموو شتێکی پێ درکاندبێ... خۆی پێڕانەگیرا بە کارۆ ی گوت: مەلا زۆرزانن، دەترسم تۆشی لە قوڕە خەستەکەی خۆی وەردابێ،تۆش بە سادەیی خۆت کەوتبیە ناوی. کارۆ بێدەنگ بوو وەڵامی نەبوو، ئیبتیسام تووڕە بوو، زۆر جار تووڕە دەبوو تووڕە بوونەکەی بە خەندەیەکی خۆکرد دەشاردەوە، ئەم جارە وا نەبوو، لە مامزو مێردەکەی و لە خۆشی تووڕە بوو. بە زاراوەیەکی توندو تیژی ئەوتۆ هاواری کرد دەنگەکەی بە دەنگی ئەو چەکوچە دەچوو کە بەردی پێ دەشکێنن: بۆ بێدەنگ بووی دیارە تێوەگلاوی؟

_ نە بە خوای ئاگام لە هیچی مەلای نییە.. کارۆ بە ترسەوە وای گوت.

کەمێک هیوربووەوە: ئەدی کە شەوان پێکەوە دادەنیشتن باسی چیتان دەکرد؟

_ ئامۆژگاری دەکردم یان کتێبی بۆ دەخوێندمەوە، یان فێرە خوێندەواری دەکردم.

ئیبتیسام ئافەرینی لە کارۆ و لە مەلای کرد. بەڵام کارۆ ئاخێکی قووڵی لە ناخی کرد: هەر ئەوە نەبوو، زۆربەی خواردنەکانی مەلای لەسەر دەرو دراوسێ و خێرەو مەندان بوو، قەت منیشی لێ بێ بەش نەدەکرد.

ئیبتیسام هەوڵیدەدا کارۆ دڵنیا بکاتەوە کە دوای مەلا کەسێک هەیە لەخۆی بگری، زۆر بە میهرەبانی پێی گوت: بە قوربان مەترسە - ئەوەی دەوی بەم جۆرە تلیشاندووی هەر خۆشی چارەی خواردنت بۆ دەکا - خودا هۆکارت بۆ پەیدا دەکات، ئەگەر پێت وایە ئەو مەلایە نەما هۆکاریش نامینێ زۆر بە هەڵەدا چووی.

کارۆ وەک پێشتر نەمابوو، پشتەوەی قسەکانیشی دەخوێندەوە و لە ناڕاستەوخۆیەکانیش دەگەیشت، بۆیە لە (ئیبتیسام)یش گەیشت: نێرو مێیاتی لێ دەرچێ، تۆ و مەلا بۆ من هیچ جیاوازییەکتان نییە،بەڵکوتۆ لە هەموو لایەکەوە زۆرلە مەلای باشتر نەبی خراپتر نی. چەندین ڕۆژە هاودەم و هاوخەمی منی، هەر چەندی بتوانی هانم دەدەی، دەملاوێنیەوە، بێ خواردن و بێ پارەت نەکردووم، ناهێڵی هەست بە تەنیایی بکەم، لەگەڵ ئازارەکانی من ئازار دەکێشی.بەڵام مەلا شتێکی جیاوازی هەبوو زۆر ئاگاداری باس و خواسی دنیایێ بوو، زوو زوو دەنگ و باسەکانی لای

خۆمانـی پێدەگەیانـدم و دڵخۆشـی دەکـردم. ماوەیـەک لەمەوبـەر دەنگوباسـی ڕاپەڕینـی گوندەکانـی لای خۆمانـی پێڕاگەیانـدم زۆر دڵخۆشـکـەر بـوو. ڕۆژ بـە ڕۆژ سـەرکەوتنی جوتیارانـی دەشـتی هەولێـری دەدامـێ، دەیگـوت ئـەو پارچـە زەوییـەی بـرا گـەورەی گوندەکەتـان بـە زۆری لەبـەر دەسـتی دەرهێنـای دەبێتـەوە هـی خـۆت و بـە خـۆت و بـۆ خـۆت دەیکێڵـی، مـەلا قسـەیەکی زۆر خۆشـی دەکـرد، دەیگـوت: مـن هاوڕێـی شـوان و گاوان و شـان بـە قوڕانـم، بـرای جوتیـارو سـەپان و کرێکارانـم، دژی چەوسـاندنەوەم، پشـتیوانی زولـم لێکراوانـم، وەک بەڵگەیەکیـش لەسـەر ڕاسـتگۆیی قسـەکانی وێنـەی چەکـوچ و داسـێکی بـە گەورەیـی لـە نـاو قورئانەکـەی دانابـوو.
ئیبتیسـام زۆر بـە باشـی تێگەیشـت بـۆ دەسـتگیرکراوە، بیـری کـردەوە: باپیریشـم جێـی ناوەنـدی بەهەشـت بێـت وێنـەی ئـەو چەکـوچ و داسـەی هەبـوو- منـداڵ بـووم وەک چـۆن ئەمـڕۆم لەبیـرە ئـەو کاتیشـم لـە یـاد مـاوە-لەبـەر خۆشەویسـتی بـۆ ئـەو چەکـوچ و داسـە چەندیـن جـار گرتیـان و نینۆکیـان دەرهێنـا، هـەر وازی نەهێنـا تاکـو دواجـار گرتیـان و ملیـان پەڕانـد.
ئیبتیسـام بـە کارۆی گـوت: گیانەکـەم ڕاپەڕینـی سەرکەشـانە سـوودی چییـە؟ ڕاپەڕیـن بەرنامـە و پـلان و یەکدەسـتی دەوێ. مەبەسـتی ڕاپەڕیـن دەبـێ لـە ناخـی هەمـوو مرۆڤـە ڕاپەڕیوەکانـدا چەکـەرەی کردبـێ، ئامانجەکەشـی لەبـەر چـاوی هەموویانـدا ڕوون و ئاشـکرا بـێ، ئەگەرنـا سـەرناکەوێ... کەمێـک پشـووی دا دەسـتی لەسـەر شـانی کارۆی دانـا: بـە قوربـان ڕاپەڕیـن و شۆڕشـەکانی کوردانـت بیسـتووە؟
_ هەندێکیانم بیستووە، (بەردە قارەمانە) و (داری کەلی) م لە لاوکەکانی (کاوێساغا) بیسـتووە کـە دەڵـێ-هـاواری تـورکان بکـەن کـورد خائینـە- خاڵـم هەمـووی ئەزبەر بوو وەکـو کاوێسـاغای دەیگـوت و دەیگوتـەوە. ئیبتیسـام ژیرانـە ڕۆیشـتبووە نـاو بابەتەکـەو بـۆی ڕوون دەکـردەوە: پێویسـتە پرسـیار بکەیـن ئایـا ئەوانـە هیچیـان سـەرکەوتنیان بـە دەسـت هێنـا؟ هـەر خـۆم وەڵام دەدەمـەوە و دەڵێـم نەخێـر، هـەر خۆشـم پرسـیار لـە خـۆم دەکـەم دەڵێـم بـۆ؟ هـەر خۆشـم- بـەو ئەندازەیـەی تێیگەیشـتووم-وەڵامـی ئـەو (بۆ)یـە دەدەمـەوە: چونکـە هـەروەک لـە لاوکەکـەی کاوێسـاغا دەردەکەوێـت خائـن و خۆفرۆش هەنـە، ئـەوەی هاواریشـی بـۆ دەبـەن پشـتیوان نییـە.
کارۆ سەری سوڕما: ئەو ڕاپەڕینانەی باست کردن هی کوردانن تۆ چۆن دەیانزانی؟
_ لە کتێبانم خوێندۆتەوە، بزانە خوێندەواری چەند باشە.
کارۆ بـە ئیبتیسـام ی گـوت: منیـش بەباشـی فێریبوویمـە. کەچـی ئیبتیسـام گوتـی:

پێویستیت بە زیاترە، لە ماوەی چەند مانگێکدا بە تەواوی فێرە خوێندەواریت دەکەم، لەمەودوا بۆ ئەو خولە پەروەردەییانەت دەنێرم کە لە وەزارتی مەعاریف ساڵانە چەندین جار بەپێی پێویست دەکرێنەوە، لەوێ خوێندەوارییەکەت زیاتر بە هێزدەبێ.

ئیبتیسام کە زانی کارۆ ئارەزووی کەوتۆتە سەر خوێندن، سەرباری خولەکەچەند مامۆستایەکیشی ڕاسپارد وانە گرنگەکانی فێر بکەن، ئەوانە دەهاتنە لای زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و بیرکارییان فێر دەکرد.

ئیبتیسام بیری خۆی لە ڕەندەدا، مریەندی مێشکی بەکار هێنا: من ئەو هەموو مولک و ماڵەم بۆ چییە ئەگەر بۆ ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆ نەبێت. دوو دوکانم لە کرێیە،کارۆ کاری عەرەبانچیاتی پێناکرێ لە ناوچەوانی من وای لێهاتووە. کرێچی دوکانەکەی شەقامی (شێخ عومەر) دەردەکەم با کارۆ لەسەری دابنیشی. زێڕیشم زۆرە، گوارەو حەڕانەو خلخالەکانی کاتی بووکینی بۆم کڕاون مۆدیلیان نەماوە دەیانفرۆشم. هەندێ پارەی هیشکەشم هەیە، بەو پارەیەو پارەی زێڕەکە کەلوپەلی پێدەکڕم و دەیخەمە ناو دوکانەکە.

دەروێش ڕەحیم و دەروێش مامز بە چەپڵەی دەستان لە حەسارەکە قاودران، دەروێش رەحیم ئەو کارە گرنگەی بۆی هاتبوو ئەنجامیدا،شوفی خۆی هاوێشت، بە زانیاری تەواوەوە هاتبووە بەغدا. پیلانگێڕەکان پلانی تۆکمەیان بۆ دانا بوو، لە ناو (بەغدا)ش هاوکاری بوون. دەروێش ڕەحیم وەک عەلی عەبدوللای شوون هەڵگر شوێن هەڵگر بوو- شوون هەڵگر بوو-جیاوازییان ئاسمان و ڕێسمان بوو، عەلی مەرد بوو شوێن پێی دزانی هەڵدەگرت، لە باوەشی ژنەکانیاندا، لە کۆشی دایکەکانیاندا دەری دەهێنان و بە گرتنی دەدان. دەروێش ڕەحیم بە هاوکاری نامەردەکان شوێن پێی پیاوە مەردەکانی هەڵدەگرت، لە ناو قوتابخانەو مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکان- دوای ئەوەی شوێنی دەدۆزینەوە- دەری دەهێنان وشوێن بزری دەکردن. عەلی شوون هەڵگر و نموونەکانی وەک ئەو کارناسانیان بۆ حکومەت دەکرد. دەروێش ڕەحیم و ئەوانی وەک ئەو ئاسانکاریان بۆ ژۆفارو شەڕانگێزەکان دەکرد. دەروێشە فشە وەک قامیشێکی قانگ هەناوی بە پشتیەوە نووسا بوو، دڵی-لە جیاتی خوێن-پڕلە ژەهری ڕەش بوو.

ئەوەی کارۆ لەگەڵ مامز کردبووی تەنها کسپەو بروسکەی گڕی ئاگری چەند شەوێک بوو، ڕێکەوتێک بوو دووبارە بوونەوەی ئەستەم بوو، ئەو لە خەونەکەی

شـەوی یەکـەم بالـق بوونـی زیاتـری نەبینیبوو،یەکەمجـار بـوو دەسـتە دەسـتارپیەکەی بۆ دەسـتێکی نـەرم دریـژ بـکات و پەنجەکانیـان وەک شـەقرەکانی دارەڕێـی خانـووەکان بچنـە پـاڵ یەکدی و هیـچ درزێـک نەهێڵنـەوە، یەکـەم جـار بـوو وەک ئەسـپی کەحێلـی تێرجـۆ بحیلێنـی، وەک شـەکە بەرانـی دونـگ خـڕ بمرقێنـی.
دوای ڕۆیشـتنی مامـز، (ئیبتیسـام)یش خەریکـی تێکـەو لێکەیـەک بـوو کەمتـر دەهاتـە لای، ئـەو دڵنیـا بـوو لـەوەی کارۆ لـەوی زیاتـر هیـچ جێگـەو پێگەیەکـی دیکـەی نەمـاوە.
کارۆ بیـری لـە سـەر چوارپایەکـەی نوسـتنی نـاو ژوورەکـەی چـڕ ببـووەوە، یادگارییـە خۆشـەکانی شـەوانی ڕابـردوو، وەک ئـەو شـەپۆلانەی لـە لێـوارە زیـخ و لماوییەکانـی دەریـا و لـە بـەر تیشـکی زێرینـی خـۆر دەبریقێنـەوە، کەللەیـان دەتەزانـد، شـەوان ناخـی خـۆی دەدوانـد: فێـرە چەورکـردن و شـێلان بوویمـە، هـەر ئەوەشـە بووەتـە هـۆی نەمانـی ژان و ئازارەکـەم، ماوەیەکـە لێـم بـڕاوە قالبـم دەخـوری..
شـەپێکی لـە بـەری ڕانـی خۆیـدا. ناولەپـی بـە ناولەپـی دا دا، پەشـیمانی نیشـان دا: ئەگەرچـی مامـز دەرپێـی لاسـتیق بـوو، بـەڵام بڕواناکـەم بـۆ هەمـوو کەسێکی هێنابێتـە خـوارەوە، ئـای چـۆن هێشـتم ئـەو پەسـیرە مـزرە بـە تامـە لـە دەسـتم دەربچـی !؟ ئـادم لەگـەڵ خـوای خـۆم کـرد بـوو لـە بـەر دەسـتی ئـەو سیخوڕە پیسـەی دەریبهێنـم، کەچـی بـە بـێ ئاگایـی مـن ئـەو دەیوسـە بـە فـڕان فڕانـدی.
لـە سـەر چوارپایەکـەی هەسـتایەوە، بـە نـاو ژوورەکەیـدا گـەڕا: ئێسـتا وەکـو جـاران نەمـاوم، هەڵـس و کـەوت و ڕاوبۆچوونـم گـۆڕاوە، فێـرە خوێنـدن و نووسـینیش بوویمـە، ئیبتیسـام هەنـدێ کتێبـی قەبـارە بچووکـی بـە سـوودی بـۆ هێنـاوم هێـواش هێـواش دەیانخوێنمـەوە.
لـە درزەکانـی دەرگا دارەکـەو جامـە شـکاوەکانی پەنجەرەکـە سـەیری دەرەوەی کـرد: شـەویش وەک دڵـی مـن بووەتـە نێچیـری قەلەڕەشـکەو باڵـی ڕەشـی بـە سـەرداهێناوە.
چـووە سـەر چوارپایـە دارەکـەی ئـەم تەنیشـت و ئـەو تەنیشـتی کـردو چەنـد جیـڕە جیڕێکـی لێهێنـا هـەر نەیتوانـی بخـەوێ: شەویشـم لـێ چیـڕ بوویتـەوە هەرچەنـدی دەکـەم نـاڕوا، سـەرەڕای ئـەوەش خـەو لاملیـم لـە گـەڵ دەکا.
کارۆ ماوەیەکـی زۆر بـوو بـە تەنیـا لـە کونـی ژوورێکـی مزگـەوت دەخـەوت، خەونـی بـە جنـان، بـە لەمەچێتـران، بـە مـردووان، بـە زینـدووان، بـە ئاژەڵـی دڕنـدەو بـە مـارو دووپشـکان دەدیـت باکـی نەبـوو. کەچـی ئـەو شـەوانەی دوای ڕۆیشـتنی مامـز، تەنیایـی لـێ ببـووە عەزیـا، ببـووە دەعبایەکـی دەو گـەورە ی ددان شـەلفە خـەوی لـە

چاوانی تار کردبوو، هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: تەنیایی هەر لەبۆ خوای باشە، کە منداڵ بووم لە باران و برووسک دەترسام، ئێستا لە تەنیایی، هەتا زووە دەبێ چارەیەکی خۆم بکەم. وتەیەکی مەلای هاتەوە بیر: مەلا دەیگوت- هەر کارێک دەتەوێ ئەنجامی بدەی خێر لەوەدایە پەلەی لێ بکەی. مێشکی سەراوبن بوو، بیری وەر سووڕا، کەواو سەڵتەی، جوببەو عەبای، مەندیلە بەفرییەکەی سەری مەلای کەللەیان پڕ کرد: ناوی مەلام هێنا دەبێ ئەو پیاوە چی بە سەر هاتبێ؟ ئەو بەستەزمانە بڕوا ناکەم جوجکەیەکی لە ناو کردبێ، پێی لە زادەکی نابێ، مێرووڵەیەکی پانکردبێتەوە، سەری بچووبوایە نوێژی نەدەچوو، وەکو کۆلکە مەلایان نەبوو مەلای دوازدە عیلم بوو، سەرم لە کاری خوای دەرناچی، هیچم پێناگوترێ، خۆ وەکو خۆشناوەکەی ناکەم بڵێم (ئەزی تێدا...)ئەستەغفیروللا خودایە هەر بە خۆت کاری خۆت چاک دەزانی، تۆ ڕەحمان و ڕەحیمی بە زەبیت پێیدا بێتەوە. بەڵام هەتا ناپیاوی وەکو ئەو (دەروێش ڕەحیم) ە بە دەروێشایەتی و بە گەوا دی سیخوڕی بۆ ئەوستەمکارانە بکا حاڵمان هەر ئەوها دەبێ.. وای دەنا ڕۆژێک بیوومایە پاشای ئەم وڵاتە، بەس خودا دادپەروەری پێ ببەخشیبوومایەو نەیهێشتبوایە پێ بە خواری دابنێم، سێپێکێکم لە ناو ئەم حەسارەی دا دەچەقاند، هەرچی دووزمان و ماستاوچی و مل پانی ئەم وڵاتە هەنە لێرە لە قنارەم دەدان.

جەستە شەکەتبووەکەی دیسان ئەم دیوو ئەو دیو پێکرد: مەلا لە بۆ من لە بابیشم باشتر بوو، کاتێ پێکەوە بووین دەستی لە سەر سینگی دانا پێی گوتم وەرە مەردبە و ژنێ بێنە پارەت لە سەرە من، نەمکرد بە گوێی بکەم، ئێستاش بە بێ ژن ناحەوێمەوە. لە ژیانتدا هەر جارێک دووجار دەرفەتت بۆ دەڕەخسێ ئەگەر نەیقۆزیەوە لە دەستت دەچێ، حەوت هەشت ساڵە هەڕەتی ژنێمە، قەت بیرم نەدەکردەوە و نەمدەزانی ژن ئەوەندە خۆشە...

گزنگی بەیان منداڵێکی تازە لە خەو ڕاپەڕیبوو، خۆر هێشتا چاوی هەڵنەگلۆفی بوو، کارۆ کێچی کەوتبووە کەوڵی و هەراسانی لێ هەڵگیرا بوو، وەک کووری دابڕاو لە مێگەلە بزن، بە بۆنی بزنە بە تەگەیەک لە نێوان ژووری نووستنەکەی و دەرەوەی حەسارەکە دەگەڕاو دەسووڕاو دەیبیلاند، بە دوو چاوی شێرێکی برسی لە بۆسەدا بوو بۆ ئەوەی نێچیرێک هەرس بکات. فێرە ڕاوە مامز ببوو بێنی بە پاشەڵی کەران نەدەشکا. ئەو نەک هەر ڕەنگی جلەکانی گۆڕیبوو، بە پۆشاکی

خاسەڕەنگیش خۆی داپۆشیبوو، بەلکو خەونە ڕەشەکانیشی کاڵ ببوونەوە. ئەو-
شەوا نە لە هەڵمی خەونەکانیدا ژنێکی ڕوخسار جوان ودەنگ خۆش و پەنجەنەرمی
دروستدەکرد. بیری لە هەموو تەمەنە بە فیڕۆچووەکەی خۆی دەکردەوە، کە لە
ژووره بێ هەست و خوستەکانی شەوە تاریکەکاندا چۆن بە تەنیایی بەسەری
دەبرد، لە دەنگی هاتو چوونی هەناسەی و ترپەی دڵە ماندووەکەی خۆی
زیاتری نەدەبیست، نە دەست و پلێکی نەرم پارووە نانێکی گەرمی بە خاوێنی
دەدایێ و نە بۆنی مێینەیەکی تەڕ مێشک و کەللەی دەتەزاند.
خۆر چەند باڵێک بەسەر بانەکانی دەورو بەری حەسارەکە بەرزتر ببووەوە، کارۆ زگ
و بەرزگی برسی بوو، لە هاتو چوونیدا چاوی دەگێڕا، لە هەمان کۆلان و لە دووری
نزیکەی پەنجا گەزێک یان مەترێک نانەواخانەیەک جۆشی دابوو، چەند کەسێکیش
لەبەر دەمی ڕیزیان بەستابوو، کارۆ بۆ ئەوەی دوو سێ نانان بکڕی و برسیەتی
زگی بشکێنی بەرەو نانەواخانەکە ڕۆیشت. ژنێکی عەبا لەبەری پەچە لەسەر لە
هەمان نانەواخانە چاوەڕێی برژانی چەند نانێکی دەکرد، ژنە نانەکانی وەرگرت
بەرەو دواوە گەڕایەوە، لە یەکێک لە کۆلانەکانی نێوان حەسارو نانەواخانەکە
لە پەنا خانوویێک ڕاوەستا و چاوەڕێی کارۆی کرد، کارۆ لە گەڕانەوەیدا بۆ ناو
حەسارەکە بەوێداتێپەڕی، ژنە بە عەباو پەچەکە پەچەکەی هەڵدایەوە، ڕوخساری
بە تەواوی بەدەرخست و بانگی کرد، کارۆ ئاوڕی لێدایەوە بە وردی سەیری کرد
شاگەشکە بوو: ئای خودایە ئەوە مامزە !! لێرە چی دەکات؟ ئەوەی گوت و بە
دوایدا ڕۆیشتە ناو کۆلانەکە. مامز کەم کەمە بەرەو قولایی کۆلانەکە دەڕۆیشت،
جارجارەش بۆ ئەوەی کارۆ دڵنیا بکا، پەچەکەی هەڵدەدایەوەو دایدەخستەوە.
کارۆ بە دوای کەوت لە پەنا خانووێکی قوڕی دوور لە حەسارەکە ڕاوەستان، مامز
بەتووڕەیی لە کارۆی پرسی: تۆ پیاوی یان نا؟
_ پیاوم ئەدی چیم...کارۆ بە نەرمی وەلامی مامزی دایەوە.
_ ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی هەڵمبگرەو بۆ شوێنێکی دوور ڕزگارم بکە.... مامز
بە هەنسکدانەوە بە کارۆی گوت.
کارۆ بە سەرسامی بە مامزی گوت: بۆ کوێت ببەم؟
_ تۆ دەزانی، چۆنت چاند وای بدوورەوە. تۆ نالێی پیاوم؟ ئەگەر بە ڕاستی
پیاوی دەبی پیاوەتی خۆت بەدەر بخەی... بە هەڕەشەکردن مامز بە کارۆی گوت.
مامز هەر بەوەندە نەوەستا زیاتر پێدرێژی کرد: ژنی عالەمێ چما بەلاشە !!؟

خۆ کەر نییە سواری پشتی بی و بەرەڵلای بکەی، شەوانە پێم دەگوتی ڕزگارم بکە ڕزگارم بکە، بۆ تێنەگەیشتی؟ بۆ خۆت لە گێلی دا؟ ئەو مێردەی من بەر لەوەی من بگوازێتەوە گوللەیەکی بەر زگی کەوتبوو خەسابوو، هێلکەدانی پیاوەتی دەرهێنرابوو. واتە بە کوردییەکی ڕوون و ڕەوان ئەو منداڵی نابێت، واتە ئەو منداڵەی لە منداڵدانی مندا بەرە بەرە گەشە دەکا و گەورە دەبێ لە تۆیەو هی تۆیە. وا تە ئەگەر چارەیەکم نەکەی دوای ماوەیەکی کەم ئەو سیخوڕە پیسە هەست پێدەکا و باوک و براکانیشم دەمکوژن، ئەو کاتە گۆڕەکەشم نابینیەوە.
کارۆ بە هەموو قسەکانی باوەڕی کرد، سەروەشێن بوو، سەری لێ شێوا، شلەژا، دەوی قرمسا تەنها توانی بڵێ: یارمەتیم بدە چی بکەین؟
_ یەک هەفتەمان لەبەر دەست ماوە، دوای ئەو هەفتەیە ئەم شارە بەجێ دەهێلین نامبینیەوە، کە ئەو حەسارەمان بەجێ هێشت لە حەسارێکی دی ژوورێکمان بەکرێ گرتووە، دوو کۆڵان لە دوای ئەم کۆڵانەیە، بنەدارێکی زۆر گەورە لە پێش حەسارەکەیە، شەوانە دوای نوێژی عیشا وەرە بن ئەو دارە لەوێ یەکدی دەبینین، هەر لەوێ تەگبیری خۆمان دەکەین چی بکەین و چۆن بڕۆین.

## ١٧

ئیبتیسـام هیـچ ڕێگـە چارەیەکـی دیکـەی لـە بیردانیـدا نەمابـوو تەنیـا ئـەوە نەبێت ئـەو پلانـەی بـەر لـە ماوەیـەک دایڕشـتبوو، لـەو چەنـد ڕۆژەش جێبەجێـی کردبـوو، وەک نەخشـە ڕێگایـەک بـۆ ژیانـی داهاتوویـان بـە کردەیـی کارۆی لـێ ئـاگادار بکاتـەوە: هەسـتە خـۆت خـڕ بکـەوە، ئـەو کـراس و شـەرواڵ و گۆریـەو پێـڵاوەی چەنـد ڕۆژێـک لەمەوبـەر بـۆم کـڕی، هەموویـان بـە جوانـی لەبـەرە خـۆت بکـە، پیاسـەیەکی دوو بـە دوویـی دەکەیـن.

(کارۆ) کـە پیاسـەی دوو بـە دوویـی بیسـت بـە بـێ پرسـیار کـردن فەرمانەکـەی (ئیبتیسـام)ی جێبەجـێ کـرد، لـە دەرەوە تاکسـییەکیان گـرت و یەکـەم جـار بـەرەو ئـەو شـەقامە ڕۆیشـتن کـە بـە تەنیشـت مەزارگـەی (ئیمـام موسـا ئەلـکازم) دا دەڕوا، لـەوێ لەبـەر دەمـی دوکانێـک ڕاوەسـتا، ئیبتیسـام هـەر لەنـاو تاکسـییەکە بـە دەسـتی سـڵاوێکی لـە دوکاندارەکـە کـرد: سـڵاو بـرام، کارتـان چۆنـە؟

_ سـڵاو خوشـک، وەک تۆپێیـە... کرێچـی دوکانەکـە وەڵامـی (ئیبتیسـام)ی دایـەوە.

بـەرەو شـەقامی شـێخ عومـەر سـووڕانەوە، لەبـەر دەمـی دوکانێکـی داخـراو ڕاوەسـتان، ئیبتیسـام و کارۆ هاتنـە خـوارەوە، ئیبتیسـام دەرگای دوکانەکـەی کـردەوە لـە کارۆی پرسـی: ئـەم دوکانـەت پـێ چۆنـە؟... کارۆ بـە ئیبتیسـام ی گـوت: ئەمـە چـاوە خانوێکـە نـەک دوکان.

سـواری تاکسـییەکە بوونـەوە و بـەرەو شـەقامی (سـەعدوون) و لەوێشـەوە بـۆ گەڕەکـی (بەتاویـن) چـوون، لەبـەر دەمـی خانووێـک ڕاوەسـتان ڕووی بەرامبـەر ڕووبـاری دیجلـە بـوو، هەردووکیـان دیسـان هاتنـە خـوارەوە، دەرگای خانووەکەیـان کـردەوە، چوونـە ژوورەوە تەماشـایان کـرد: ئـەم خانـووەت پـێ چۆنـە؟

_ ئەمە قەسرە نەک خانوو !!.. کارۆ وەڵامی دایەوە.

ئیبتیسـام سەرسـامی کرد:ئـەم خانـووە و هـەردوو دوکانەکـەی بینیمـان هـی خۆمـن.

_ بە ڕاست !!؟ بە سەرسوڕمانەوە کارۆ بە ئیبتیسام ی گوت.

بەکارۆی گوت: بەڵێ بە ڕاست، خۆ درۆش ناکەم.

کارۆ بە بێ پێشەکی و بەدەر لە هەموو داب و نەریتەکان، ویستی کوتک و سنگی ڕایمووسێ، کەچی ئەو بە جوولەیەک و قسەیەک لێی تێکدا: تۆ ماوەیەکی زۆرە بێ کارو کاسبی، من و تۆ ئێستا هەردووکمان لە کەوڵی خۆمان دەخۆین، بێگومان ئەگەر کانییەک هەر لێی بخۆیەوەو ئاوی نەیێتەوە ناوی وشک دەکات. بۆیە دەمەوێ بتکەمە دوکاندار.. ئیبتیسام ڕا و بۆچوونی کارۆی وەرگرت.

_ دوکا ندار !!؟ کارۆ بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری کرد.

_ بەڵێ دوکاندار، ئەو دوکانەی لە شەقامی شێخ عومەر چەند ڕۆژێک لەمەوبەر بۆ تۆ بە تاڵم کردووە، هەندێ کەلوپەل دەکڕین و لە ناوی دادەنێین، تۆش بەدیاریانەوە دانیشەو بیانفرۆشە، بە پارەی فرۆشتنی کەلوپەلەکان، کەلوپەلی دیکەی پێ بکڕەو قازانجەکەشی بە نیوەیی پێکەوە دەیخۆین،بیر لەوەش مەکەوە بڵێی قازانج دەکەم یان زەرەر، با چەند جارێکیش قازانج نەکەی یان زەرەر بکەی، بەرە بەرە فێرە هەموو کون و قوژبنەکانی کڕین و فرۆشتن دەبی، وا ی لێدێ نازانی پارەی قازانجەکەت لە کوێ دابنێی. هەر ئەمڕۆ پێش خۆر ئاوا بوون، بەر لەوەی ببێتە شەو، هەتا حەسحەس و ڕێگرو سەگە بەرەڵلاکان بە ناو شاردا نەکەوتینە، دەبێ کەلوپەلەکانی ناو حەسارەکە بگوازینەوە ناو ئەو خانووە بە تاڵەی بینیت، خۆشت هەر ئەمڕۆ حەسارەکە بەجێدەهێڵی و دەچیە ناو هەمان خانوو. ئەوە پاداشتی قەرزێکت بوو لەسەرم دەبوایە زووتر بتدەمەوە، سوودو باجی دواکەوتنی قەرزەکەشت هێشتا ماوە، دەبێ ئەویشت بە زووترین کات بدەمەوە.

کارۆ کەوتە ناو دەریای بیرکردنەوە، گێژەنێک لوولیدا تاکو تەپانی بنی دەریاکە ڕاپێچی کردو خنکە خنکی پێخست: بێگومان تاقیم دەکاتەوە، دەیەوێ بزانێ لەو کارەمدا سەرکەوتوو دەبم یان نا، ئەگەر قازانجم زۆر نەبێ لەوانەیە دوکان و خانووەکەم لێ وەربگرێتەوە. بۆقە مەلەیەکی بە هێز هێنایەوە سەر ئاوەکە: بەختیاری بۆم بووەتە کۆترێکی سپی بە دەوری سەرمدا باڵەکانی لێکدەداو دەگەڕێ، بۆچی لە باوەشی نەگرم؟..باسکە مەلەیەک لە گێژەنەکەی دوورخستەوە: ئەو خانووە سەربەخۆیە، ئیبتیسام دەتوانی شەوانیش لە گەڵمدا بمینێتەوە. پشتە مەلەیەکیش گەیاندییە

کەناردەریاکە: دڵنیام ئەو باجەی ئەو دەیەوێ بە زووترین کات بمداتەوە، هەر ئەوەیە دەیەوێ مێردم پێ بکات.
چەندین هەستی دژە یەکدی لە سەرسوڕمان و حەپەسان، لە بڕواکردن و بڕوانەکردن دڵەڕاوکێیان پێکگرتبوو. بە سەیرکردنێک لە تکاکردن و پاڕانەوە دەچوو، سەیری ئیبتیسام ی کرد: بەو هەموو چاکەیەت دەمخەیە ژێرباری قەرزێکی گەورە قەت لە ژێری دەرناچم.
خۆر لە یاری چاوشارکێ دا بوو، لە نێوان باڵاخانە باڵا بەرزەکاندا سەرەدیقانێی دەکرد، جار جارە خۆی بزر دەکردو ناوە ناوەش لە ناوەندی ڕووبارەکە بە ڕووتی خۆی نیشان دەدا و دەیویست بە پشتە مەلە بپەڕێتەوە ئەو بەری. شان بە شانی یەکدی لەسەر قانە گیایەکی کەناری ڕووباری دیجلە، نزیکی خانووەکەی خۆیان دانیشتبوون، بە پانتایی ڕووبارەکە گڤە گڤی کزە بایەکی زۆر فێنک و جریوە جریوی باڵندەکانی سەر دارە باڵابەرزەکان دەبوونە دەنگی شمشاڵ و ڕەبابە، ئاوازی حەیران و عەتابە، هەستەکانی سەرخۆش دەکردن و دەیهەژاندن، تەڕایەتی شێی قۆپەنە گیایەکە و جۆرێک لە ئارەزوو بەملاو بەولادا دەیجولاندن، هەر یەکەو بە دزی چاوی کامێراکان، بە قەد چەند پەنجەیەک لەوی دی نزیک دەبووەوە. کارۆ هەروەک گۆڕابوو شەرمیشی نەما بوو، تەپوتۆزی هەموو شتە کۆنە بە خۆڵ و خاشاکەکانی داوەشاندبوو، پشتی لە ڕابردوو کردبوو، لە دوای خۆی بە جێیهێشتبوو، یادگارە خەمناکەکانی لە بیردانی خۆی سڕیبوونەوە.
لە تەندووری گەرمی لاران و برکی هەناسە لە یەکدی نزیکەکانیاندا، کرمی ئارەزووەکانی کارۆ جوولا، چاوەکانی جەستە ئارمووشییەکەی (ئیبتیسام) یان کردە ئامانج و لە تەپانی بنی دەریاچەی هەوەس و دەستبازییەکانیدا خنکان، وەک زۆربەی پیاوە هەوەسبازەکان تەزوێکی گەرمی ئاژەڵی بە ناو دەمارەکانیدا گەڕاو کەوتە ناو کایەیەکی موگناتیسی.. هۆش لە کەللەیدا فڕی و ئەقڵ باریکرد. بە لەپە دەستارییەکەی دەست و مەچەکە نەرمەکەی (ئیبتیسام) ی ڕاکێشا. ئیبتیسام هەستی بە تەڕایەتی دەستی و نەرمی پێستەکەی کرد، وا یزانی گیانە مردووەکەی ناو جەستەی بەرە بەرە لە خەوە ساڵەها ساڵیەکەی تەمەنی تازە زیندوو دەبێتەوە. تیشکی زێڕینی

خۆشەویستی بە کەلێنە تاریک و کاولگەکانی دڵیدا و بە ناو بیابانی ژیانی چۆڵەوانیدا تێپەڕی، لە ناو خۆڵەپۆتە وشکەکەی دڵیدا گوڵێکی جوانی ڕواند. چەند دڵۆپە فرمێسکێکی شادی بەسەر هەردوولا ڕوومەتیدا بازرەقەیان کرد و بەسەر چەناگەیدا بەرەو سینگ و بەرۆکی شۆڕبوونەوە. لێوەکانی تەتەڵەیان کرد، خەریک بوو لە هاڕژنی گریانی خۆشی بدا، کەچی بە هەردوو ناولەپی دەموچاوی خۆی سڕییەوە و لێوی کرۆژت و گریانەکەی قوتدایەوە. لە چاوەکانیدا دڵۆپە فرمێسکێکی یاخی ڕەق ڕاوەستا بوو، چاوی ئەوەندە بە ڕەونەق و جوان کرد بوو، کارۆ دەیویست بە زمانی بیلێسیتەوە، کەچی ئەو دەستپێشخەری کرد، بە هێنکەبڕایی و بە لێوە پەمەییەکانی ماچێکی شەرمنی بە پەلەی لە هەردوولا ڕوومەتی کرد. کارۆ پێی وا بوو ئەوەش هەر (مامن) ە، نەیزانی دیواری ئەقلی ئیبتیسام پۆڵایە:

ـ با زوو بگەڕێینەوە ناو خانووە نوێیەکەو ئەمشەوە پێکەوە بنووین.. بە ئیبتیسام ی گوت.

تۆزێک لێی مۆڕ بووەوەو خێسەیەکی بۆ کرد: منت خۆش دەوێ؟

کارۆ وتەیەکی مەلای هاتەوە بیر: مەلا دەیگوت- بەخت هەر جارێ و دوو جار لە دەرگات دەدا و دەیەوێ ببێتە میوانت، ئەگەر ڕێزی نەگری و زوو دەرگای لێ نەکەیەوە، لێت دەڕەوێتەوەو جارێکی دی ڕووت تێناکاتەوە- ئەو لە خۆشییان مووەکانی گڤ بوونەوە و بوونە پەڕی سیخوڕ، ویستی شەکرێک بشکێنی، کەچی ئیبتیسام سیخورمەیەکی نەرمی خێواندێ: چییە پشەکە زمانی خواردووی دەنگت بڕا؟

کارۆ هەروەختبوو لەخۆشییان باڵ بگری، زمانی کرایەوە شەکرەکەی هەر شکاند- قسەیەکی شیرینی کرد: بەڵێ زۆرم خۆش دەوێی، لەوەی زیاتر چی بڵێم؟ مەگەر ببمە شێخی سەنعانی و بۆت وەربگەڕێم.

ئیبتیسام چەند شیرین بوو، شەکرە شکاوەکەی کارۆ شیرینتری کرد: پێویست بە وەرگەڕان ناکا، هەردووکمان یەک ئایین پەیڕەو دەکەین، با شێوازی پەیڕەو کردنیشمان جیاواز بێ. کەواتە ئامادەی هاوسەرگیری بکەین؟. کارۆ لە خۆشیان هەستایەوە: بەڵێ، هەر ئێستا هەستە دەستت بدە من با بچین لەلای مەلایەک مارەت بکەم.

ـ با ئەمە بۆ سبەنێ بێت، سبەینێ بە شەرعی خوا دەبینە هاوسەری یەکدی، منیش ماڵی خۆم دەگوازمەوە ناو ئەم خانووە و شەوانی بووک و زاوایەتی لێرە بەسەر دەبەین.. ئیبتیسام گوتی.
بەو قسە نەرمە کارۆ کوچکە بەردی سەری دڵی درزی کەوتێ، لە پێش چاوی دنیا بووە شایی و لۆغان و هەڵپەڕکێ..ئەو شەوە لە ناو خانووە نوێیەکەی ئیبتیسام بەتەنیا مابووەوە، هەرکە پێڵووەکانی لە یەکدی دەبوونەوە یەکسەر دیوارەکانی ژوورەکەی، لەلایەک وێنەی مامز و، لەلایەکی دیش وێنەی ئیبتیسام دەیانڕازاندەوە و تاریکی ژوورەکەیان ڕوناک دەکردەوە، شەوی لێ ببووە ساڵ نەدەڕۆی، هەر دەیورتاند: ئەم شەوە دەعەجانییە مێ و مۆڕە، دەڵێی سواری پشتی کیسەڵێ بووە هەر ناڕوا.
ئەو ژنێکی زیرەک بوو، دەیزانی چۆن بای ڕووداوەکان بەلای خۆیدا ببا و هەڵکردنی ئەو بایەش بۆ بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە، زیرەکانە بیری دەکردەوە و بە خۆی دەگوت: پەندێک هەیە دەڵێ- ئەگەر لووت نەبێ چاو چاوی دەخوا- کەواتە دەبێ دوو شایەدی باش بدۆزمەوە، بە تەواوی ئاگاداری هاوسەرگیریەکەمان و سەوداو مامەڵەی نێوانمان بن، نەوەک وەکو ڕیویەکەم لێبێت، پێم بڵێن- کێت شایەدە بڵێم کلکم.
سبەینە داهات بە دوو ئەلقەی زێڕو دوو شایەدو مەلایەک بوونە پرۆژەیەکی هاوسەرگیری شەرعی.. دوای هەفتەیەکیش لەلای دادوەری باری شارستانی، بە پێی گرێبەستێکی یاسایی بوونە ژن و مێردی یاسایی. زۆربەی عەسرەکان، ئێوارەکانی بەر لە خۆر ئاوابوون، دەستی یەکدییان دەگرت، سەرەتا پیاسەیەکی نەرمی دوو بە دوویان بە ناو شەقامی (سەعدون) دا دەکرد، لە وێوە بەرەو شەقامی (ڕەشید) شۆڕدەبوونەوە. لەو شەقامە پان و درێژەدا لە (باب ئەلشەرجی) یەوە دەستیان پێدەکرد تاکو کۆتایی شەقامەکە هەر بە نەرمە پیاسە دەگەڕان و چاویان بەملاو بەولادا دەگێڕا، بە ناو بازاڕی شۆڕیجەدا دەگەڕان، سەردانی بازاڕی مسگەرانیان دەکرد، بە سەرو شەربەتی (زبالە) هەناویان فێنک دەکردەوە. دواتریش لە کۆرنیشی کەناری ڕووباری دیجلە (ئەبو نەواس) دەگیرسانەوە، هەر لەوێش بە ماسییەکی سوورکراوەی (مەسگوف) لەلای یەکێک لە ماسی فرۆشەکان، لیکە هارەکانی ناو گەدەی خۆیان دادەسەکناند.

هەمـان ئـەو سـاڵە بـوو کـە لافاوەکـەی ڕووبـاری دیجلـە دڵەڕاوکێـی خسـتبووە نـاو دانیشـتوانی شـاری بەغـداو خەڵکـی هەراسـان کردبـوو. بـەڵام ماوەیـەک بـوو کارەسـاتەکە تێپەڕێندرابـوو، ئـەو کاتانـە شـەوانی بەغـدا زۆر فێنـک بـوو، بـە تایبەتـی لـە هـەردوولا کەنـاری ڕووبـاری دیجلـە، خـۆر لـە نـاو زەردەپەڕێکـی تەمـاوی خـۆی لـوول دابـوو، هەتـا ناوکـی خـۆی حەشـاردابوو. داوە داوەی ڕووناکیەکـەی ئـەو دیـوی کـەل، چەنـد پارچـە هەورێکـی تاقـی ئاسـمانیان زەرد هەڵگەڕاندبـوو. بـە یـادی یەکـەم دانیشـتنیان لـەو شـوێنەو یەکـەم بەڵێنـی هاوسـەرگیرییان، لـە سـەر هەمـان قۆپەنـە گیـاو لـە نزیـک ئـاوازی زوڵاڵـی بڵندگۆیـەک ڕایەخیـان لـێ ڕاخسـت. دەنـگ و ئـاوازە بـە جـۆش وخرۆشـەکەی (ڕەزا عەلـی) ئـەو نـاوەی هێنابـووە سـەما و (ئیبتیسـام) یشـی جۆشـاند، لـە گەڵیـدا دەسـتی پێکـرد (سـەمەر سـەمەر یـا سـەمەر. مینـنـەک یەغارولگومـەر. عێنـی سـەمەر وێـن تـروح. ئەنتەلگەلـب وەنتەلـڕوح). دیـار بـوو گۆرانیەکـە نـوێ بـوو، ئەوانـەی لـە سـەر فریـزی نـاو باخچـەکان دانیشـتبوون، ئەوانـەی لـە پێڕێـی لێـواری ڕووبارەکـە پیاسـەیان دەکـرد، ئەوانـەی بـە سـەر شۆسـتەکان دەهاتـن و دەچـوون، ئەوانـەی لـە چایەخانەکانـی ئـەو نـاوە بـوون، ئەوانـەی هـەر بـە ڕاوەسـتانەوە لـە کافتریـاکان شـەربەتی پرتەقـاڵ و مێـوژو سـێویان دەخـواردەوە، ئەوانـەی ماسـی مەسـگوفیان دەبرژانـد، ئەوانـەی دەیانخـوارد، دمبگچـی و چەقەنەچیـەکان، کـچ و کـوڕە خۆشەویستەکانی بـە جووتـە لـە پەنـا دارەکان خۆیـان حەشـاردابوو، هـەر هەموویـان کردیانـە سـەما، هەڵدەپەڕیـن و هەمـان گـۆرا نییـان دوویـارەو دە بـارە دەکـردەوە.

(کارۆ) یەکـەم جـار بـوو ئـەو گۆرانیـەی گـوێ لـێ دەبـوو، هیـچ گۆرانیەکـی کوردیـش لـە مێشـکیدا تۆمـار نەبـوو، بـەڵام لـە خۆشـی ئاوازەکـەو لەبـەر نـازی چـاوی (ئیبتیسـام) جـۆش و خرۆشـی گرتبـوو. گوێیەکانـی لـە سـی سـانتیمەتر بـە دواوە هیچیـان نەدەبیسـت، هـەردوو چاوەکانـی لـە نێـوان سـێوەکانی باخـی سـینگی ژنەکەیـدا بـزر ببـوون، کـە گۆرانیەکـە تـەواو بـوو، کـە نیمچـە بێدەنگییـەک باڵـی بەسـەر شـوێنەکەدا کێشـا، ئەویـش سـەری بـردە بـن گوێـی: مـن ژیانـی ڕاسـتەقینەم ئـەو کاتـە دەسـتپێکرد کـە تـۆم ناسـی، تـۆ توانیـت ژیانـم بگـۆڕی، بـە تایبەتـی ئـەو کاتـەی هەسـتم بـە خۆشەویسـتی تـۆ کـرد، پێشـتر وەکـو جوجکەیەکـی پەڕپووتـی ئاوەڕووتکـرا ی بـە بـێ پەڕوبـاڵ دەگـەڕام

و دەسـووڕام، لـە دارەتـی دنیایـێ کەچـە عەرەبانەیەکـم شـک دەدیـت پـارووە نانێکـی پـێ پەیدا بکـەم و پێـی بژیـم، ئەویش بـەم دواییـە لـە ترسـی چەتـە و ڕێگرەکان تەشـکە بـەڕی بەسـەر دادرا و تاکـو ئێسـتا نازانـم چـی بـە سـەرهات. مـاڵ و سـامانم شـان و پیلـم بـوو، ئەویـش تـا ماوەیەکـی زۆر لـە لایـەن نامەردەکانـەوە پـەک خـران. شـەوە تاریکەکانـی تەمەنـم لـە نـاو چـوار دیـواری ژوورێکـی تەنگەبـەری مزگەوتێـک بـە تەنیاییـم بەسـەر دەبـردن، کـە خەونـی جڕنـا و فڕنـام دەدیـت هـەر چەنـدە هـاوارم دەکـرد و دەمقیژانـد، کەچـی دەنگـم تخووبـی گەروومـی نەدەبەزانـدو لـە خـۆم زیاتـر کەسـی دی نەیدەبیسـت.
(ئیبتیسـام) یـش وەکـو هـەر ئافرەتێـک گرینـۆک بـوو، وەک ئـەوەی چاوەکانـی لـە نـاو دوکەڵـی جغـارەی توتنێکـی تیـژ خنکابـن، ئاویـان تێـزا بـە کارۆی گـوت: توخـوا دیسـان مەمگرییێنـە.
_ گریانی ناوێ، هەروەک دەڵێن: بەری ڕۆژێ بە بێژینگێ ناگیرێ.
کارۆ وای گـوت و لەسـەر قسـەکانی بـەردەوام بـوو: ژنەکـە لـەو کاتـەی پەیمانـی هاوسـەرگیریمان بەسـتا، مێـژووی لـە دایکبوونێکـی نـوێ دەسـتیپێکرد، لـەو ڕۆژەوە بـاری گرانـی ژیانـی دەربـەدەری و پـڕ مەینەتـی لـە سـەر شـانم هاتـە خـوارەوە. بیسـت و چـوار سـاڵی تەمەنـم بـە یـەک ڕۆژی خـۆش گۆڕییـەوە. ساویلکەیی و گەمژەییـم، بـێ ئاگایـی و نەزانیـم، هەمـوو گوناهـ و تۆبەکانـم بـە نووکـی تیـژی چەقـۆی ئـەم ڕۆژە، جیـڕ بـە جیـڕم کـردن.. بیسـت و چـوار سـاڵ هەسـتم دەکـرد تەنیـا یـەک کەچـە عەرەبانـەم هەیـە، کەچـی ئەمـڕۆ وا هەسـت دەکـەم هەمـوو دنیـام هەیـە. هەسـت دەکـەم گفـە گفـی بایـە فێنکـەکان، قاسپە قاسـپی کـەوەکان، جریـوە جریـوی چۆلەکـەکان، هاشـە هاشـی ئـاوی تافگـەکان هەموویـان لـە گـەرووی مـن دەردەچـن. هەسـت دەکـەم هەتـا دە دوازدە سـاڵی منداڵیشـم لـە تۆمـاری مێـژووی تەمەنمـدا دەسـڕێنەوە.. تەمەنـی منداڵـی چـی !؟ هـەر بـە نـاو تەمـەن، هـەر بـە نـاو منداڵـی، ئێسـتاش کـە دەبینـم منداڵـەکان بـە هەمـوو دڵخۆشـییەکانیان، بـە هەڵـە بـێ تاوانەکانیـان، بـە غـارە غـارو دەرپەڕیـن و ڕاپەڕینـە شـادی بەخشـییەکانیان، بـە هەڵبـەزو دابـەزو قیـژە قیـژو هـاوار هاوارەکانیـان، وەک تۆپەڵـە بەفـر لـە ئاسـمانەوە دەبـارن و هیـچ شـتێکی شـاراوەیان نییـە، هـەر هەموویـان لـە هەناویانـەوە پێدەکەنـن و هەمـوو هەسـت و هـۆش و بیـرو جەسـتەو جوولـەی خۆیـان بـۆ ئـەو چرکەیـە تەرخـان دەکـەن

کە تێیدا دەژین، هیچ مەبەستێکی ناڕوونیان نییە، بە بێ هەڵچوون و شەرم کردن و خۆنواندن تەنها بۆ ئەوە سەما دەکەن چونکە دڵخۆشن..
کە ئەوانە دەبینم هەست دەکەم لە هەر چوار پەلە ساردو سڕەکەم خوێن فرکەی دەکات، نەستم دەجوولێ، یادەوەرییە تفت و تاڵەکانی منداڵیم بیردێتەوە، ئەو یادەوەرییانەی لە ژێر تەپ و تۆزو کەڵەکە بەردی بیست و چوار ساڵ بە سەر بردنی ژیانی کۆڵەمەرگیم، بە دیتنی ئەو منداڵانە دەبنە تەزوێکی کارەبایی، هێزم بە بەردەهێنن و تانم لێدەدەن بۆ ئەوەی لە ژێر قورسایی ئەو کەڵەکە بەردەدا، سەردەربهێنمەوە و ببمەوە ئەو منداڵە ساوایەی دایکم غدی غدی لێدەکردم و لە سەر ئاوازی- لایلایە کۆرپەکەم لایلایە- هەڵپەڕم و سەما بکەم، وەک ئەوەی تازە لە دایک بووبم. بەڵێ ئێستاش سۆزو خۆشەویستیم بۆ منداڵان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خۆم لەو قۆناغەی تەمەندا لێی بێ بەش بوویمە.
بەو قسانەی کۆترە کیویلکەی دڵی (ئیبتیسام) ی دا بەر تیران و دوو سێ تەقڵەی پێ لێدا، لەگەڵ ناخی خۆی دووا: ڕاستییەکی ون لە نێوان هەموو ژن و مێردێکدا هەیە، بەڵام ئەوەی نێوان من و ئەم پیاوە، ون نییە و ئاشکرایە. ڕۆژێک لە ڕۆژان نەیپرسی- ئەرێ ژنەکە تۆ چەندین ساڵ لەلای مێردی یەکەمت بووی بۆچی منداڵت نییە؟

# ١٨

مانگی تەممووز بوو، بەغدا برکی دەکرد، ئاسنی دەرگاو پەنجەرەکانی بەندیخانە تاریکەکە بە پەنجەوانەش نەدەوێرای دەستیان لێبدەی، هەر ژوورێک لە ژوورەکان تەندووری فڕنییان و کوورەی کەرپووچان بوو. بەندیەکان ئاوخواردنەوەیان تف و بەلغەمی جەلـلادەکان بوو، نانخواردنیان شەق و شولاقی دەرگاوانەکانیان بوو.
مەلای تەنگەستوور هەناوی بە پشتیەوە نووسابوو، ببووە داری قامیش و بە پلی منداڵێک دەقرچایەوە، چەند لۆچێکی ئاسۆیی پڕ بە ڕووبەری ناوچەوانی و هەندێکی ئەستوونیش بە هەردوولا چەناگەیدا هاتبوونە خوارەوە.. کەوانی چاوەکانی هەموو زیندانیەکان تیریان دەباراند، لە ڕوخساری هەر یەکێکیاندا چیرۆکێک دەخوێندرایەوە، هەموو چیرۆکە نووسراوەکانی ئەو ڕوخسارانەش هاو شێوە بوون.
لە ناو بەندیخانەدا، لە ژوورەکانی تەنیشتیەوە، مەلا هاواری هاوڕێکانی دەبیست، هی وایان هەبوو دەینالاند: هەر یەک قوم ئاو گەرووسی پێ تەڕ دەکەم. هەرزەیەک تازە هەژدە ساڵی تەواو کرد بوو، هەر ئەوەتە دەنگی دەبیسترا: دەستتان لە سەر دەوم لابەن، لێم بگەڕێن با قسەتان لە بۆ بکەم. یەکێکی دی ئاخ و ئۆفی بوو: وەی بابە نینۆکەکانم. یەکێکی دی هاواری دەکرد: بەسە بەس خەسام. هی واش هەبوو لە ژێر ئەشکەنجەدا بە گوتنەوەی شیعرەکەی (قانع) دەینەڕاند:

گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابخانەیە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بە سەر ئەو دوژمنە هیوای بە بەندیخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیرو کەلەپچە لام وەکو ئەفسانەیە

کەچی مەلا کە لێشیان دەدا نقەی لێوە نەدەهات، ئەو ئەفەندییە چاکەت و پانتۆل لەبەرو ملپێچ لە مل و خاوەن ناسنامەی چەکوچ و داسەکەی دەهاتەوە بیر کە دەیگوت: ئێمە لە گۆڕەپانی جەنگدا ناجەنگین، بەلکو لە مێشکی مرۆڤەکاندا دەجەنگین، ڕاستە ناسنامەمان چەکوچ و داسە، بەڵام نە

چەکوچمـان بـۆ لێدانـە و نـە داسیشـمان بـۆ سـەربڕین.
کاتژمێر (٩) ی بەیانـی، ڕۆژی (١٨) ی ئـەو مانگـە بـوو، بـە دوو پۆلیسـان (مـەلا) یـان پەلکێش کردبـوو، پۆلیسـەکان دەیانویسـت بـە بـێ دەنگـی بـۆ لێکۆڵینـەوە ڕایبکێشـن، کەچـی ئـەو بـۆ ئـەوەی هاوڕێکانـی بزانـن بـۆ کوێـی دەبـەن، هـاواری دەکـرد: لێکۆلینـەوەی چـی شـەرەف بردنـە، شـکۆی مـرۆڤ کوشـتنە، پێشـێل کردنـی هەمـوو داب و نەریتێکـی مرۆڤایەتییـە. بـە لاکـەلاک بـۆ بەردەمـی دادوەر ڕایانکێشـا. نەیتوانـی لـە بەردەمـی دادوەر ڕابوەسـتێ، کـە ئـەوان بەریانـدا ئەویـش لـە سـەر زەوی ژوورەکـە دانیشـت و ڕووی لـە دادوەر کـرد: گـەورەم ببـوورە پێـم عـاردی ناگـرێ.
هـەردوو پۆلیسـەکان قۆڵیـان گـرت ویسـتیان قیتـی بکەنـەوە، دادوەر (گـۆ ئـاوت) ێکـی لێکـردن و دەری کردنـە دەرەوە. دادوەر هەسـتایەوە نیـو پـەرداخ ئـاوی لـە نـاو ئاوتەزێنەکـەی تەنیشـتە خـۆی دەرهێنـاو دایـە مـەلای، مـەلا دەسـتی بـۆ نیـو پەرداخـە ئاوەکـە بـرد، تۆزێـک سـلەمیەوە و لـە خـۆی پرسـی: دەبـێ ئـاو بـێ یـان ژەهـر؟ ئەگـەر ژەقنیـش بـێ هـەر دەیخۆمـەوە لەشـم بووەتـە داری وشـک و چـاوم تاریـک بووە.بەلێدانـی پلێـک و تامکردنـی زمانـی کەمێـک دڵنیـا بـووەوە و خـۆی دوانـد: دیـارە ئـەو دادوەرە دەمارێکـی پیاوەتـی تێـدا مـاوە.
چاوەکانـی شـتەکانی نـاو ژوورەکەیـان تێکـەڵ و پێکـەڵ دەکـرد، هەتـا ڕوخسـاری دادوەریشـیان بـە حوانـی نەدەخوێنـدەوە. مـەلا هەسـتی کـرد تەقـە تەقـی پاژنـەی پێڵاوێـک لێـی نزیـک دەبێتـەوە، ئـەو ترسـا کەچـی دادوەر بـە دوو دەسـت باوەشـی تێوەرینـا و زۆر بـە نەرمـی بـەرزی کـردەوە: لـە سـەر ئـەم کورسـییە دانیشـە.
مـەلا لـە نزیکـەوە زەینـی دایـە ڕوخسـاری، یەکـە یەکـەی ئەندامەکانـی جەسـتەی بـە سـەر کـردەوە، پەیکەرێکـی بـە شـان و شـەوکەت لـە بـەر دەمـی دەجـوولا، پێـی سـەیر بـوو: نـا نـا، ئـەوە دادوەری پاشـا نییـە، بـە کرێگیـراوی داگیرکـەر نییـە، هەبـی و نەبـی هاوڕێیەکـی خۆمانەیـە.
پەشیمان دەبووەوە: نەخێر، شوان هەڵخەڵتێنەیە، دەیەوێ دانەخۆرەم بکات.
چـاوی نوقانـد نەیویسـت ببینـی، کەچـی دادوەر دەسـتی خسـتە سـەر شـانی و ئازارەکانـی مـەلای بـە زەردەخەنەیـەک کەمێـک دامرکانـدەوە: چۆنـی؟ مەترسـە لێکۆڵینـەوەی ئەمـرۆت ئەشـکەنجەدانی تێـدا نییـە.
ـ چۆن بم، لە ناو جەستەی خۆمدا بەند کراوم.. مەلا بە دادوەری گوت.

ـ لە ناو ژوورە تاکە کەسییەوکەتدا ئازارت هەیە؟ دادوەر لێی پرسی.
ـ چۆن ئازارم نییە !! بەڵام قوربان، شێرەکان کە لە ناو قەفەزەکانی باخچەی ئاژەڵان دەبەسترێنەوە، سەرەتاو تاکو ماوەیەکی زۆریش، بە هیوای چوونە دەرەوەو ئازاد بوون، بە هەموو هێزیانەوە هەوڵ دەدەن قەفەزەکان بشکێنن، کەچی دوای ئەوەی تێدەگەن قەفەزە پۆلاییەکان لە وان بە هێزترن، بێ هیوا دەبن و لە گەڵیاندا ڕادێن و چی دی هەوڵ نادەن.
دوای چەند خولەکێک مەلا بەو ئاوە و بە هەوای فێنکی ژوورەکە، وەک ئەو کۆتەرە دارە وشکەی تەنها ڕەگەکانی مابنەوە، تەڕایەتییەک بە دەمارەکانیدا چووە خوارەوە و ناخی ئاوداو گەشاندییەوە.ئەگەرچی هەر لە سەرەتاوە سووربوو لەسەر ئەوەی لێوەکانی لە یەکدی نەکاتەوە، ئەوەک بە بێ ئاگایی وتەیەک بزەلێنی، بەڵام ئەو خەندەیەو نیو پەرداخ ئاوەو بەڵێنی ئەشکەنجە نەدانەی بوونە کلیلی دەرگا دوو دەرییەکەی دەوی، بە قسە هات: بەڕێز قەت چاکەی ئەو نیو پەرداخە ئاوە لە بیر ناکەم، بۆ من کەمییە لە بەر دەمی پیاوێکی وەک جەنابت ڕانەوەستم، خودا لە هەموو نا دادپەروەرییەک بتپارێزێ.
دادوەر نیو پەرداخ ئاوی دیکەشی بۆ برد: فەرموو ئەوەندە ئاوەش بخۆوە.
ـ ئەی خودا گەورە ترو پایەدارترو دادپەروەرترت بکا جەناب...مەلا بە دادوەری گوت.
ـ بڕوات بە خودای هەیە ئەوەندە ناوی دەبەی؟ دادوەر وای بە مەلا گوت.
ـ بەڕێز، من وتارخوێن و ئیمامی مزگەوتم، چەندین ئایەتەکانی قورئان و دەیان حەدیسم لە بەرە، هەموو کتێبەکانی زانستی فیقهو شەریعەم خوێندووە، لە زانستی بەلاغەو سەرف و نەحودا تاکم نییە، هەر دوازدە زانستی مەلایەتیم لە سەر دەستی باشترین مەلا وەرگرتووە. چۆن بڕوام بە خودا نییە، نەک هەر بڕوام پێی هەیە، بەڵکو لە هەموو کەس زیاتر دەزانم بۆ دەیپەرستم.
دادوەر سەری خۆی بادا: ڕاپۆرتی ڕاپۆرت نووسان چی دەڵێ و ئەم پیاوەش چی دەڵێ !! دەی با لە ڕەوتی لێکۆڵینەوەی ئاسایی دەر نەچم، پرسیاری لێکرد: دیارە عارەبی باش دەزانی پێویستیت بە وەرگێڕ نییە؟
مەلا وەڵامی دادوەری دایەوە: بەڵێ جەناب عەرەبی باش دەزانم.
دوای پرسیارکردنی لە ناوی چواری خۆی و دایکی و نازناوی و، شوێن و کاری ئێستا ی وکەسە نزیکەکانی، لێی پرسی: عەشیرە تت؟

_ عەشیرەتم نییە.. وەڵامی مەلا بۆ دادوەر.
_ خۆ نێرکی عاردی نی؟ دادوەر گوتی.
_ نێرکی عاردی نیم، بەڵام بڕوام بە عەشیرەتگەری نییە، ئەگەر عەشیرەتم هەبێت دەبێ خاوەن عەشیرەتیشم هەبێت، من لە خودای زیاتر کەس بە خاوەنی خۆم نازانم.. جەناب ئەو عەشیرەتانە هەمیشە لە ململانێ دان، هەر ئێمەش سووتەمەنی ئەو ململانێیەی ئەوانین.
_ باری خێزانیت؟ دادوەر حەزی لە درێژدادڕی نەبوو.
مەلا گوتی: ئێستا بێوەمێردم.
دادوەر بە مەبەست ئەو پرسیارەی وروژاند: واتە پێشتر ژنت هەبووە؟
ئەو پرسیارەی دادوەر کرمێکی ناو مێشکی مەلا ی جولاند، بەڵام بەمجۆرە وەڵامی دایەوە: بەڵێ هەمبوو نەما.
دادوەر پرسی: منداڵیشت هەبوو؟
کرمەکەی ناو مێشکی مەلا زیاتر جولا: نەخێر نەمبوو.
دادوەر دیسان پرسی: ئەو ژنەت چی بەسەر هات؟
مەلا سەیری بەو پرسیارانە هات: جەناب باس و خواسی ئەو ژنەم هیچ پەیوەندییەکی بەو تاوانەوە هەیە کە دراوەتە پاڵم؟
ئەگەر پەیوەندی بەو تاوانەوە هەبێت و کەمێک لە ئازارەکانم کەم بکاتەوە، بێگومان باسی دەکەم. ئەگەرچی هەروەک دەڵێن- ئەوەی کاری بکەوێتە دادگا، ئەگەر چۆلەکەیەک بە دەست بهێنی، گایەک دەدۆڕێنی.
دادوەر بە قسەکەی مەلای سەرسام بوو، هەروەها بۆنی شتێکی نامۆشی کردبوو، بۆیە پێی گوت: لەوانەیە پەیوەندی هەبێت.
ڕووی بەتەواوی بۆ دادوەر وەرگێڕا و لێی پرسی: گەورەم بە تەواوی گوێم بۆ دەگری؟
دادوەر خەندەیەکی بۆ کرد. مەلا زۆر پێی سەیر بوو- قەسابێک خەندە بۆ گایەک بکات کە بۆ سەربڕینی دەبەن- کەچی هەموو هێزە ناوخۆییەکانی جەستەی کۆکردنەوەو چۆلەکەی خەیاڵی بەرەو سەردەمی سادەیی و دڵسافی فڕی: جەناب، هەرچەندە ئەو ڕووداوە ماوەیەکی زۆریشی بە سەردا تێپەڕیوە، بەڵام هەموو کاتێ کە هەستە توندو تیژەکانی بۆ ناو گۆڕەپانی فراوانی بیردانم دەگەڕێنەوە، هەر یەک لە شانەکانی جەستەم لە گەڵیدا دەژی. قوربان- بە

کەسم نەگوتـووە (قوربـان) بـەڵام لـە بـەر خاتـری ئـەو فـرە ئـاوەو ئـەو ڕێـزەی لێـم دەگـری بـە تـۆی دەڵێـم- لـە بیرچوونـەوە هەمـوو شتێک دەگۆڕی، لـە بیرچوونەوە ئـەو چەنـد ترپەیـەی لـە دڵمانـدا مـاوە، ئـەو دەنگانـەی لـە گەرووماندانـە، ئـەو ئازارانـەی چێشتـوومانە، هەموویان بـە ئـاوی دەریاکانـدا دەدات و دەچنـە قورگـی نەهەنگـەکان و لێمـان ون دەبـن، کاتێکیـش ئەوانـە ون دەکەیـن تامـی ژیانمـان نامینـێ و تەنهـا وەک جەستـەیەکی مـردوو لـە نێـوان زیندووانـدا دەژین..گـەورەم، ئـەم دنیایـە جەنگەڵـە بـاش و خراپـی تێدایـە، هەندێک هەنـە لـە پێنـاوی بـاوەڕی پتەویانـدا دەجەنگـن و دەبنـە پاڵـەوان، بـۆ ئـەوەی خەنـدەی هیـوا بخەنـە سـەر لێـوی هـەزاران باجـی ئـەو پاڵەوانیەتـە بـە خوێن دەدەن، ئەوانـە پەیکەریـان لـە شـەقامەکاندا هەڵدەواسـن، منـداڵان لـە کتێبەکانـی قوتابخانـە ناویـان دەخوێنـن. هـی واش هەنـە ئامانجیـان کوشـتنی ئـەو خەنـدە پـڕ هیوایانەیـە، خەڵکـی بـێ تـاوان ئـازار دەدەن و دەیکەنـە ئێسـک و پێسـت، ئێسـک و پێستەکەشـیان فـڕێ دەدەنـە بـەر سـەگەکانیان، سـەگە گـەورەو زەبەللاحـەکان بـە زەقـەی چـاوی سـەگە بچووکـەکان تێیـان بەردەبـن و دەیـان پچـڕن و دەیـان خـۆن، سـەگە بچووکەکانیـش هەرچەنـدە لیـکاوی حـەزو ئارەزووەکانیـان بـە لالغاوەیانـدا دێتـە خـوارەوە، ناتوانـن بسـتێک لێیـان نزیـک ببنـەوە، ناچـار بـە نهێنـی لاقـی سـەگە گـەورەکان دەگـەزن و ڕادەکـەن و خۆیـان دەشـارنەوە.

دادوەر تـا ئـەو سـاتەش حـەزی لـە درێـژ دادڕی نەبـوو: بـە خـۆی یـەک قسـەیە ئـەم درێـژ دادڕیـەی بـۆ چییـە؟

مـەلا پێـی گـوت: بەڕێـز، بایەخـدان بـە قسـەی بەرامبەرەکـەت بریتییـە لـە قوربانیـدان بـە هەنـدێ کاتـی خـۆت، سـەرەتا پێـم گوتـی گوێـم بـۆ دەگـری نکولیـت نەبـوو، ئێسـتا بـۆ قیسـکانەت تەنـگ بـووە؟ بـە چـاوان دەچمـە نـاو بابەتەکـە بـەس ئەگـەر دەکـرێ فرێکـی دی ئـاو دەخۆمـەوە.

دادوەر خـۆی نیـو پـەرداخ ئـاوی بـۆ هێنـا، ئەویـش ئـارەزووی گریـان هێرشـی بـۆ هێنـا، قوڵپـی گریـان ئەوکـی گـرت، بـەڵام غیـرەت گرتـی: لـە بـەر دەمـی دادوەرێـک کـە بـە تۆمەتـی سیاسـەتکردن دادگاییـم دەکات چـۆن دەبـێ لاواز بـم و بگریێـم. تەنهـا دوو داوە فرمێسـک بـە چاوەکانیـدا شـۆڕبوونەوە و لـە پەنـا لۆچەکانـی ڕوخسـاریدا پاڕانـەوە: خودایـە هەڵێنەگـری، زوڵـم هـەر زوڵمـە گـەورە بـێ یـان بچـووک.

ـ زولمی چی زوو برۆ ناو بابەتەکە.. دادوەر پێی گوت.
ـ بەڵێ گەورەم، دەڵێن- تۆوی ئارامگرتن تاڵە، بەلام ئەگەر بیچێنی بەرەکەی شیرینە-منیش بەو پارانەوەیەم هەر وەک دەتەوێ چوویمە ناو بابەتەکە، ئەگەر تۆ کەمێک ئۆقرە بگری و هەناسەت سوار نەبی تەواوی دەکەم.
مەلا پاشماوەی فرمێسکەکانی سەر برژانگە درێژەکانی خۆی سڕیەوە: بەڕێز، هەژدە مۆمی تەمەنم داگیرساندبوو، کە باسی مۆم دەکەم تکایە پێکەنینت بە قسەکەم نەیێ. باوکم مەلایەکی کراوە بوو، دنیاو دینی پێکەوە گرتبوو، وەکو خەڵکە ڕەش و ڕووت و نەحوێندەوارەکە نەبوو، لە بەر ئەوەی لە گەڵ ئەفەندی و رۆناکبیرانی دەڤەرەکە هاموشۆی زۆریان لە گەڵ یەکدیدا هەبوو، باوکیشم وەکو ئەوان مێژووی لە دایکبوونی هەموومانی ئەزبەر بوو،هەموو ساڵێ لە (١٨) ی مانگی تەمووز بە قەد تەمەنم مۆمی دادەگیرساندو بە بۆنەی لە دایکبوونم ئاهەنگی دەگێڕا.
دادوەری وا لێکردبوو پێش و پاشی خۆی نەبینی، بە جۆرێک سەیری کرد، سەیرکردنەکەی بە سەرسام بوون و سەرسوڕمان دەچوو، لە هەمان کاتدا بە زەییبوونێکیشی پێوە دیار بوو، لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: بەیانی (١٨) ی تەمموزە و یادی لە دایکبوونیەتی. هەر ئەوەندەی لە ناخی خۆی نەتوانێ میهرەبانی دواندی: دەی بەردەوام بە، چەند خولەکێکم بۆ زیاد کردی.
مەلا بەردەوام بوو: بەڵێ، لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا-چۆن بڕوام وایە خودا هەیە ئەوهاش دەزانم بیست ساڵی بووم، چونکە هەر ئەو ساڵە بە بۆنەی بیستەمین ساڵی لە دایکبوونم باوکم بیست مۆمی داگیرساندبوو- لەو تەمەنەدا لە یەکێک لە گوندەکانی دوور لە دەڤەرەکەی خۆمان فەقێ بووم، فەقێ چ فەقێ، چوست و چالاک و پاک و خاوێن و بە زەوق بووم، بەلام فەقێیاتیش ئاوارەیی و دەربەدەرییە، دەست پانکردنەوە و سواڵکردنی نان پەیداکردنە، ئێواران دەبوایە بە ناو گوندیدا بگەڕێین و بسووڕێین بە (ڕاتبەڕەحمەتت لێ بێ) نان و شیو پەیدا بکەین و زگی خۆمانی پێ تێر بکەین. من چەند ماڵێکی گەڕەکێکی ئەو گوندەم پێ سپێردرا بوو، خاوەن ماڵێک لەو ماڵانە دەسەلاتدار بوو، کچێکیان هەبوو سێ چوار ساڵێک لە خۆم بچووکتر بوو، کچە چونکە بە دەسترۆیی و هەبووەیی و نازو فیزو بێ ئارەقەی بەر هەتاوێ پەروەردەو گەورە کرابوو. پێی ناوێ جەناب ئەوەندە باسی جوانی بکەم،

هەر چەندە بە ڕوخسارو بەژن و بالایدا هەڵبڵێم هەر کەمە، منیش ئەو کاتی - هەروەکو پێشتر گوتم- خرت و خورت بووم.ئێواران کە بۆ نان و شیوەکە دەچوومە بەر دەرگای ماڵیان، ئەو نەیدەهێشت لە خۆی زیاتر کەسێکی دی بێتە دەرەوەو خواردنەکەم لە بۆ بهێنێ، کە دەستی بەر دەستم دەکەوت و چاوی لە چاوم دەنا، خۆشی لە کەللەی دەدام و گڕکانی عەشقێک لە موولوولەکانی مێشکمەوە درزەی دەکردە شادەماری دڵم و لە وێشەوە سەرتاپای ئەندامەکانی جەستەی دەگرتمەوە. ڕۆژەکان بە پەلە دەهاتن و دەڕۆیشتن، خۆشەویستی من و (نیشتمان) یش بە پەلەتر بەژنی بەرز دەبووەوە. دوای شەش مانگ لەو عەشقە پاک و خاوێن و پیرۆزە، کە تەنها ئێواران دەستمان بە دەستی یەکدی دەکەوت و لەوە زیاتر نەبوو، چەندین حاجی و مەلاو پیاوی زەریفم نارد بۆ داخوازی سوودی نەبوو نەیاندامێ، باوکی خۆم و کەسانی خزمی خۆشیانم نارد هەر سوودی نەبوو. دیار بوو باوکی عاردێکی قەسپۆکی ڕەق بوو نەدەکێڵدرا و نەدەهاتە رایێ. ناچار بڕیارم دا (یان نیشتمان یاخود نەمان).

کاتەکەی دادوەر بۆی دانابوو تەواو ببوو، بەڵام دیار بوو چیرۆکی خۆشەویستییەکەی بۆنی تاوانێکی لێدەهات سەرنجی ڕاکێشا بوو، بۆیە پێی نەبڕی تەنها دیسان ئاگاداری کردەوە: زۆر درێژت کردەوە، بە کورتی بیبڕەوە.

_ بەڵێ گەورەم، ناچار- هەرچی دەبی با ببی- هەرێمان بە یەکدی دا سەرمان هەڵبگرین و ئەو گوندە بەجێ بهێلین و ڕوو لە شوێنێک بکەین نەماندۆزنەوە.. ماڵی باوکی کچەی سپیان و ڕەشانێکی زۆریان هەبوو، مەڕو بزنەکان لە دەرەوەی حەوشە لە ناو هەوێزی خۆیان مۆڵ ببوون. ئەگەرچی بەهار بوو، ئاوو هەوا خۆش ببوو، بەڵام چەند پارچە هەورێکی ڕەش و چڵکن بەری ئاسمانیان گرتبوو، شەوەکە خۆی تاریکە شەو بوو، هەورەکانیش تاریکتریان کردبوو. ماڵی باوکی (نیشتمان) سەگێکی زۆر دڕیان هەبوو، بەڵام نیشتمان بەهۆی چەند نانێکی چەورەوە سەگەکەی بردبووە ناو حەوشەو بە نان خواردن خەریکی کردبوو، هەتا (نیشتمان) ی یارم بزگوڕو بوخچەی تێکناو خەناوکەو پۆزمک و گوارە چوار گۆیەکەی هێنا، من لە ناو مەڕو بزنەکانی ناو هەوێزەکە خۆم حەشاردا بوو، دڵم لە جیاتی شەست و حەفتا لێبدا، سەدو بیستی زیاتر لێدەدا، لەوەی دەترسام نهێنیەکەمان ئاشکرا بێت

و خۆشەویستەکەم ئازار بدەن، بەڵام خوا کردی هەندەی نەبرد (نیشتمان) بە پەنادزە خۆی گەیاندە من. کە دەرچووین چەند سەگێکی هارو هاج بە دوامانددا شریتەیان کرد، بە ناو چەغەلوورانێی سەگان و بەلارێ و پیادەرێدا و بە بێ زادو توێشوو، دەستمان لە ناو دەستی یەکدی ناو بە تەمای خودا ڕۆیشتین. ڕۆیشتین بەڵام زیاتر لە مەترێک پێشە خۆمان نەدەبینی، ئەوەندە بە پەلە دەڕۆیشتین لە ماوەیەکی کورتدا زیاد لە پێویست لە ئاواییەکە دوور کەوتبووینەوە، هەندێک خۆمان حەساندەوە و چاوەڕێشمان کرد ئاسمانە ڕەشەکە کەمێک کاڵ بێتەوە، یان هەرنەبێ شین هەڵبگەڕێ، هەندەی نەبرد لە بەختی ئێمە، هەورە ڕەشەکە زەنگی ئاگادار کردنەوەی لێدا، زەنگ چ زەنگ دەبوایە بە هەردوو ناولەپەکانت هەردوو گوێیەکانت توند بگری، لە هەمان کاتیشدا هەورە ڕەشەکە هێلنجی دەهاتێ دەترساین لە ناکاو بە سەرماندا برشێتەوە. ناچار دیسان ملی کوێرە ڕێگاکان و ناوەنی تەبارەی گەنم و جۆیەکانمان گرت و ڕۆیشتین،حەدو سەدی بەیانی بوو ئاقاری دوو سێ گوندمان تێپەڕاندبوو، هەورە ڕەشەکانیش پەرش و بڵاو ببوونەوە و هەڵیبرینگاندبوو، دنیا سپیولژ ببووەوە، چاومان بڕی دەکرد دەورو بەری خۆمان ببینین. لە دوورەوە دەنگی زەنگوڵی ملی نێری و قرە قری لاوژۆکەی ملی بزنی شوانەکانمان دەبیست کە بەرەو ڕوومان دەهاتن و لێمان نزیک دەبوونەوە، ماوەیەک خۆمان دایە بنگەڕێکی کەندەڵانێک و خۆمان لە چاوی شوانەکان شاردەوە. هەرچەندە هیلاکی دەستی لێستاندبووین و برسێتیش پرزەی بڕیبووین، نە خەوتنی ئەو شەوە درێژەش خەوەکوتکەی پێ دەبردینەوە، جار جارەش (نیشتمان) ی دۆستم هەر بە ڕۆیشتنەوە بە لادا دەهات و من زوو دەمگرتەوە، بەڵام کە دەنگ نەما و شوانەکانیش تێپەڕین، چوومە سەر گردێک گوندێکم بەرچاو کەوت، لە شێوەی ئەندازەیی گوندەکەدا زانیم ئەو گوندەم پێشتر دیوە. هاتەوە بیرم ئەوە ئەو گوندەیە کاتی خۆی مامم تێیدا دادەنیشت، کە ئەویش ئەمری خوای کرد ئێستا مامۆژنم بە بێوەژن کۆشی هەر لەوێیە. سێ و دووم لێنەکرد ناوی خوام لێهێنا، بە ڕاکێش ڕاکێش (نیشتمان) م پەلکێش کرد و هەندەی پێنەچوو گەیشتینە ناو گوندەکە، پرسیار بە پرسیار ماڵی مامۆژنم دۆزییەوە، کە دۆزیمەوە بەختەوەری وەکو تیشکە بنەوشەییەکانی خۆری بەیانیان لە ڕوخسارمدا تیشکی دایەوە و گەیشتە قوڵایی دڵم و پڕی لە هیوا

کرد. مامۆژنم ژنێکی زیرەک بوو، هەر زوو ڕوخساری هەردووکمانی خوێندەوە، بە پەلە نان و ماست و چایەکی گەرمی داینێ، هەر یەکەمانی بە جیا جیا لە ژوورێک پەستا، هەر بە پەلەش چوو مەلایەک و دوو شایەدی بۆ هێناین و لە یەکدی مارەی کردین. دوای ماوەیەک حەسانەوەو پێکەوە نووستنمان، دوو وڵاغی بەرزەو دوو کوڕی برای چەکداری بە گەڵداین و ڕەوانەی گوندێکی دی کردین کە ماڵی مامێکی دیکەم بە خۆی و چەند کوڕێکی لەوێ بوون. دەنگ و باس گەیشتەوە ماڵی خۆمان ئەوانیش هاتن سەردانیان کردین. ماڵی باوکی کچەی کە بە ئاگا هاتبوون و زانیبوویان کار لە کار ترازابوو، ناچار چەند سیخوڕێکی خۆیان تێگەیاندبوو بە دوامانداا بگەڕێن و بمان دۆزنەوە، ئەوانیش کون بە کون بە دوامانداا دەگەڕان و نەیان دەتوانی بماندۆزنەوە. حەیامێکی پێچوو بوو باوکم هەر هەوڵی دەدا، لەملاو لەولا پیاوی ماقووڵ و خەڵکی بەڕێزی دەنارده ماڵی باوکی کچەی مەسرەتی بکەن، دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، بە سەفتە پارەیەکی قەبە مەسرەتییەکە کرا، بە مەرجێک من و ژنەکەم نەچینەوە بەر چاویان.

دادوەر دیسان ئاگاداری کردەوە، بەڵام ڕێگەشی پێدا تەواوی بکات: حەز دەکەم چیرۆکەکەت برگە بە برگە ببیستم، بە مەرجێک کورتی بکەیەوە.

ـ بە چاوان بەگم، بەس ئەگەر ڕێگەم بدەی لەسەر کورسییەکە دێمە خوارەوە لە سەر زەوی دادەنیشم، پشتم دەدەمە دیواری لە سەر ئەم کورسییە زۆر ژان دەکا.

دادوەر نەک هەر ڕێی پێدا، شەربەتێکیشی داێ. مەلا کە شەربەتەکەی خواردەوە ویستی سۆزی دادوەر بۆ خۆی ڕابکێشی، سەری بۆ بەرزکردەوە پێی گوت: گەورەم تۆ بۆنی ئەم خاکەت لێدێ کە من لە سەری دانیشتووم، دڵنیام تۆ لەوان نی !! بەڕێز، جەناب ڕۆژەکان وەکو قلە تەسبێح ئاودیو دەبوون و مانگیان تەواو دەکرد، بنی مانگێ دەگەیشتەوە سەری مانگێ و ئەوانیش بە هەمان شێوە دەبوونە کووچ کووچە، مانگ دوای مانگیش (نیشتمان) ی خێزانم زیاتر هەڵدەپەندما. هەموو ڕۆژێ دەستەو دوعا هەردووکمان داوامان لە خودای دەکرد، کوڕێکی چاوگەشمان پێ ببەخشی. زەمانە دەستێکی پڕ لە پەمۆی بۆ درێژ دەکردم، بەڵام من چرنووکی قەلەڕەشەیەکم تێدا دەبینی، ناوە ناوە قرە قرِی ئەو قەلەڕەشەم گوێ لێدەبوو لە نزیکمانەوە دەیقڕاند، کە

لە من و (نیشتمان) ی ژنم بترازێ کەسی دیکە نەیدەبیست. کوندەپەپوێک بە سەر ماڵماندا دەگەڕاو باڵی هەڵدەشەقاند، جەنگی ترس و هیوا لە دڵی هەردووکماندا هەڵگیرسابوو، ساتێک هیوامان بە خۆمان دەبەخشییەوەو ساتێکیش دێوەزمەی ترس دەیکردینە پارووێک و قوتی دەداین، من دەمزانی زەمانە - وەک ئەو خووەی پێی گرتووە - لە یەکدیمان جیا دەکاتەوە.

(مەلا) لاتەنگەیەکی دەیتریواند و لاسەنگی تێکدابوو، دیسان داوایەکی دیکەی لە جەنابی دادوەر کرد: بەڕێز، ئەگەرچی لە پێش جەنابتان بێ ئەدەبیە، بەڵام ئەم لایەم زۆر ژان دەکا و هەراسانی کردووم، ئەگەر ڕێگەم بدەن ئەم لاقەم درێژ دەکەم.. مەلا ئەو هەڵسو کەوتانەی بۆ ئەوە بوو دادوەر تێبگەیەنێ زۆر ئازار دراوە.

هەرچەندە گێڕانەوەی بە سەرهاتەکە درێژەی کێشا بوو، هەڵسوکەوتەکەی مەلای بێزارکەر بوو، زۆر نەرمی نواندنەکەی دادوەریش لە کەسێکی تاوانبارکراو بە تاوانێکی سیاسی، لە ڕەوتی ئاسایی لێکۆڵینەوە دەرچوو بوو، کەچی دادوەر بە مەزەندەی خۆی سەرە داوی تاوانێکی دیکەی کەوتۆتە دەست، پێویستە بە درێژایی داوەکەدا بڕوا تاکو دەگاتە کۆتایی و ڕاستییەکان دەردەکەون. دادپەروەرییەک ناخی جولاندو بەزەییەک کەوتە کەللەی، بیری جولاند: ئەو داوەی سەرەکەی کەوتۆتە دەستم لە وانەیە بمگەیەنێتە ئەنجامێکی دادپەروەرانە. تۆکەیەکی بۆ مەلای کرد: فەرموو لاقەکەشت ڕاکێشە، بەس بمگەیەنە بە ئەنجام.

_ گەورەم، هەندەی نەماوە پیازێکی سپیکراوت بدەمە دەست، بەڵام شتێک لە دڵم بوویتە کەسەر،لە کاتی خۆیدا بە سەریدا بازمدا.باسی ئەوەم بۆ جەنابتان کرد کە من و هاوسەرەکەم دەپاڕاینەوە کۆرپەکەی ناو زگی کوڕ بێ، کە دەڵێم کوڕ ئەوە وا ناگەیەنێ من کوڕم لە کچ پێ باشترە، نەخێر قەت لای من جیاوازییان نییە، بەڵام چی بکەم دیارە مێشکی مرۆڤەکان بەمجۆرە پڕکراوەو پڤدراوە، لەوەتی هەمە دەبیستم دەڵێن- ناوی زۆر ناوی کەم دەبا - ئەو کەم و زۆرییەش لە ناو هەر میللەتێک بە جۆرێک شرۆڤەی بۆ دەکەن و لێکدەدرێتەوە، وڵاتە پێشکەوتووەکان بە شێوازی دیموکراسیانەو لە ڕێگەی پەرلەمانەکانیانەوە، زۆرینە و کەمینە یەکلا دەکەنەوە. لای ئێمە زۆرەکان کەمەکان دەمامک دەدەن و دەیانچەوسێننەوە. بەڵێ لە هەر گوندێک،

لە هەر شارێک، لە هەر شوێنێک لە شوێنەکانی لای ئێمە، ئەوەی کوڕی زۆرە- چ کوڕی پشتی خۆی چ ئەوانەی فریودراون و خۆیان بە کوڕی ئەو دەزانن-بەشی بێ کوڕەکان دەخوا.. گەورەم، بێگومان مێژووت خوێندۆتەوە، خوێنی پیسی زیندەبەچاڵکردنی سەدان ساڵی پێش ئێستا بە ناو دەمارە ڕەقەکانی ئێمە فیچقەی دەکا. هەموومان درۆ دەکەین ئەگەر بڵێین نامانەوێ کورمان زۆر بێ، کار لەکار ترازاوە بووەتە کارێکی بۆماوەیی خۆڕسک و باپیرانمان وایان ویستووە، دەزانی بۆ کوڕی زۆرمان دەوێ؟ من با پێت بڵێم. بۆ شەڕە خەنجەرو شمشێرو تیران دەمانەوێن، بۆ ئەوەی دەمانەوێن تاکو لە کاتی پرسەکانمان لە بەردەمی مزگەوتەکان سینگیان دەرپەڕێنن.. گەورەم، ژانە سەرم پێگرتی زۆرم گوت، چی بکەم دڵم پڕە، جۆگەلەیەکی پڕ ژەهر، لە جیاتی خوێن، لە ناخمەوە بە دەمارەکانمدا دەڕواتە ناو دڵم. هەرچەندی تۆقەی بکەم، هێلنج بهێنمە خۆم، بیتفێنمەوە، بیرشێنمەوە، بێ سوودە هەر ئەو ژەهرەی هەناوم کۆتایی نایێ. کەواتە با بتگەیەنمە کۆتایی داوەکە، یان تەقاندنی تەڵەکە، ئەو تەڵەیەی بۆ مرۆڤی پاک دادەندرێتەوە نەک بۆ ڕێوی فێڵباز: نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی بوو، وتاری نوێژی هەینیم بۆ موسلمانان دەخوێندەوە، تفێکی گەورە لە ناو دەوم خۆی کۆکردەوە، ویستم قوتی بدەمەوە نەمتوانی گەرووم گیرا، تفەکەم کارەساتێکی لە گەڵدابوو، زۆر لەوە گەورەتر بوو بە گەروومدا بڕواتە خوارەوە. دڵم ئەوەندە بە توندی لێی دەدا سینگم لە گەڵیدا بەرزو نزم دەبووەوە، هەندەی نەما لە ناو دەفەی سینگمدا دەربپەڕێ، بە پەلە نوێژەکەم تەواو کرد، کە گەڕامەوە چیم دی !!؟ ئەوەی من دیم کافر نەیبینی، فەرمە سۆن نەیبینی، ئەوەی مرۆڤە، ئەوەی تۆزێک هەست و سۆزی هەیە، ئەوەی هەر گیان لە بەرە نەیبینی. (نیشتمان) ی دۆستم، هاوڕێم، هاوسەرو هاودەم و هاوتا و هاوکوفم، ئەوەی خۆشم ویست و بوو بە ژنم، لە سەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو، دوو خزمەتکاری ماڵی باوکی، دوو دڵڕەشی بێ ویژدان تاویان دابوێ و بە خەنجەران وەکو کاریێ سەریان بڕیبوو... لەو کاتەوە گوڕییە ئاگرێک لە بۆشایی کەللەمدا بەرز دەبێتەوە و لە سەرم گڕپەی دەکا، خوێنی دەمارەکانی دڵم دەکوڵێنێ، لەو کاتەوە جۆش و خرۆشی دڵم بووینە خۆپیشاندان و ڕاپەڕین، بووینە شۆڕشێکی سەرتا سەری هەموو شەقامەکانی شاری جەستەمیان گرتۆتەوە.

دادوەر لە ناخیەوە لەرزی، خۆی پێ نەگیرا: سەربڕینی دایکێک و کورپەکەی ناو زگی تاوانێکی زۆر نامرۆڤانەیە، پێویستە تاوانباران بدرێنە دادگاو سزا بدرێن.
_ قوربان، سزادانی چی !!؟ کێ بیانگرێ و کێ سزایان بدا؟ ئەوانە خۆیان هەموو شتێکن، دامودەزگاکانی پۆلیس و- دوور لە جەنابت- دادگاکانیش هەر بە خۆیانن، ئەگەر جەنابت لێم بە عەتەب نەگری، دەڵێم حکومەتیش هەر بە خۆیانن، دەبڵێ بۆ؟ سەیر لەوە دایە- ئەگەرچی سەیریش نییە- هەر بە فیتی حکومەت تاوانەکەیان لە لایەن دادگاکانەوە بۆیان پنج کراو بە (غسل العار) داندرا. لەو رۆژەوە تاکو ئێستا وەکو بەرزەکی بانان لەو وڵاتە بێ خاوە نەدا دەسووڕێنەوەو کەسیش ناوێری بڵێ (لە پشتی چاوتان دوو برۆیە) منی بێ دەسەڵاتیش لە ترسی ئەوان نەوەک لە ناوم ببەن و بمفەوتێنن، لە وڵاتی خۆم دەر بە دەر بووم و بەختی خۆم هاوێشتەمزگەوتێکی ئەم شارە جەنجاڵە، گوتم بەڵکو بۆم دەبێتە ئەشکەوتی (الثور) و لە ناو تەونی جاڵجاڵۆکەکان بزر دەبم و نامدۆزنەوە، کەچی دیارە هەر دۆزیمیانەوە.
_ کێ تۆی دۆزیەوە؟ دادوەر لە مەلای پرسی.
_ جەنابی دادوەر تۆش مافی خۆتە لە پلەو پایەکەت بترسێی، ئەوانە لە پاشای نزیکن و هەموو شتێکیان پێدەکرێ، لە وان زیاتر کێ هەیە، هەر ئەوانەن کە ژن و منداڵەکەمیان بە زیندوویتی کوشت، خۆزگە منیش ئەو کاتی لە وێ بوومایەو بە هەمان شێوە منیشیان شەهید بکردبووایە، نەوەک بەم جۆرەی ئێستا بە پەندیان ببردبوومایە. گەورەم فەرمان بفەرموون با بە گوللە ی تفەنگێک یان بە پەتی سێدارە، مێشکم بپرژێنن، دڵم بوە ستێنن، ملم بپەڕێنن، نەک بمنێرنەوە ناو ئەو دۆزەخەو بە ئازارەوە بمرێنن..
دادوەر حەپەسا، سەری سوڕما، بیری جولا: ئەم پیاوە بە تۆمەتی تاوانێکەوە بەند کراوە هیچ پەیوەندییکی بەو کێشەیەوە نییە.
دادوەر لە سەر کورسییەکەی هەستایەوە نیو پەرداخ ئاوی دیشی دایێ، زۆر بە وردی سەیری ڕوخساری مەلای کرد: لە گێڕانەوەی سەربردە دڵتەزێن و جەرگبڕەکەی بۆم دەردەکەوێت ئەم مەلایە بە یەکێک لە دوو هۆ، یان بە هەردوو هۆ بەند کراوە، یا نیش دەتوانین ناوی لێ بنێین دوو گریمانە، گریمانەی یەکەم ئەوەیە: قسەکانی ئەم مەلایە ڕاستن، ئەو کەسانەی بکوژی

ژن و منداڵەکەین، تۆمەتیان بۆ هەڵبەستاوە و بە هۆی نزیکییان لە دەسەڵاتەوە لە ڕێگەی سیخوڕەکانیانەوە لە بەندیخانەیان پەستاوە. گریمانەی دووەمیش ئەوەیە: ئەم مەلایە لە پێناو تۆڵە سەندنەوە لەو بکوژانە، لە وانەی زولم و ستەمیان لێکردووە، تێکەڵ بە گرووپە چەپڕەوەکان بووە.

دادوەر بەر لە بڕیاردان، پاڵە پەستۆی خستە سەر مێشکی خۆی، چەندین مادە و بڕگەی یاسایی تاوتوێ کرد، نەخشەی بڕیارێکی پەسندو گونجاوی لە مێشکی خۆی وێنا کرد، پێنووسەکەی هەڵگرت، دۆسییەکەی ڕاکێشایە بەردەمی خۆی، ئەمانەی لە سەر نووسی:

یەکەم: سێ هەڵە، یان جیاوازی لە نێوان وتەکانی تاوانبارکراوو نێوان دۆسییەی تاوانبارکردنەکەیدا هەیە، کە ئەمانەن: ناوی سێیەمی تاوانبارکرا و لە دۆسیەکەیدا بە (جاسم) هاتووە، کەچی لە ناسنامەکەیدا (هاشم) ە، ناوی سێیەمی دایکی تاوانبارکرا و لە دۆسییەکەدا بە (باین) هاتووە، کەچی لە ناسنامەکەیدا (باپیر) ە، لە دۆسییەکەیدا نووسراوە (خێزاندارە)، کەچی بەگوێرەی ئەوەی لە ناسنامەی باری شارستانی نووسراوە ئەو (بێوە مێردە).

دووەم: لە ماوەی (١٥) ڕۆژدا ئەو جیاوزیانە بە بەڵگەی ڕاست و دروست ساغ بکرێنەوە.

سێیەم: بە گوێرەی وتەکانی تاوانبارکراو، هەم تاوانبارکراوە و هەم تاوانلێکراویشە، بۆیە ڕەوتی لێکۆڵینەوە - بە بێ زەبرو زەنگ و ئازاردانی جەستەیی و دەروونی - بەردەوام دەبێت، چونکە بە پێی وتەکانی تاوانبارکرا و پرسی سیاسی تێکەڵ بە پرسێکی کۆمەڵایەتی کراوە.

چوارەم: لە ماوەی ئەو (١٥) ڕۆژە و تاکو لێکۆڵینەوەش تەواو دەبێت، مامەڵەی بەندکراوێکی ئاسایی لە گەڵدا بکرێت.

## ١٩

ڕۆژەکان وەکو بەفری بەر هەتاوی هاوین دەتوانەوە و بە هەڵەداوان لە ناو زگی ڕووباری مانگەکان خۆیان فێنک دەکردەوە، مانگەکانیش لە وان بە پەلە تر دەڕژانە ناو دەریای ساڵەکان، ساڵەکانیش وەکو دەروێشی سەرگەرمی عەشقی خودایی تامەزرۆی ماچی لێوی یەکدی بوون، بە خێرایی لە سەر پێپلیکانەی مانگەکان بازیان دەداو ڕۆژو شەویان لە بن پێی خۆیان دەپلیخاندەوە، دەریای ساڵەکانیش لە بەر بەڕۆژکی تیشکی خۆرەتاو خۆی گەرم دەکردەوەو تەمەنی دەکردە هەڵم، هەڵمی تەمەنیش بست بە بست بەرەو ئاسمان بەرز دەبووەوە، لە جیاتی ببێتە هەورو جارێکی دی ببارێتەوە سەر زەوی، لە قووڵایی ئاسمان و لە ناو عەرشی خودا بزر دەبوو.

ناوەڕاستی هاوینی ساڵی (١٩٥٧) بوو، ئێوارەبوو کارۆیە هیلاکی لە دوکان دەگەڕایەوە، ئیبتیسام بە ڕووێکی گەشاوە پێشوازی لێکرد، وەک ئەوەی نەوەک جنۆکەکان گوێیان لێبێ، خۆی بۆ خوار کردەوە و سەری بردە بن گوێی، بە ئاستەم چرپەیەکی بۆ کرد.

_ گیانەکەم دڵنیای !!؟ کارۆ بە سەرسوڕمانەوە پرسی.

ئیبتیسام بە پێداگریەوە وەڵامی دایەوە و چەند فرمێسکێکی شادیش ڕوومەتیانی تەڕ کرد: زۆر دڵنیام.

کارۆ شاگەشکە بوو، هەروەخت بوو لە خۆشییان بفڕێ، باڵەکانی وەکو چەترێک کرانەوە و باوەشی تێوەرینا، هەر بە سەرو ڕوومەت و چاوەکانی نەوەستا، هەتا گوێ و گەردەن و قۆرتی ملیشی ماچ کرد، بە زمان شیلەی ئاسمانەی دەم و مەلاشووی یەکدییان لێستەوە. هەر بەوانەش نەوەستا، زۆر بە نەرمی دەستێکی بە سەرو بەری ناوکی داهێنا، هەستی بە پەندمان کرد: بەڵێ فەرخە کەروێشکێکی ماڵی زگی هەڵپەندماندووی.

ژنەش بە شلەژاوییەوە گوتی: دوای زیاتر لە سێ ساڵ پاڕانەوە نزاکانمان گەیشتە ئاسمان.

کارۆ هەر خۆی هەڵپەرکێیەکی تەنیایی دابەستا، ویستی پڕ بە گەرووی هاوار بکات، ژنە توند دەوی گرت: نەکەی جنۆکە خراپەکان گوێیان لێدەبێ، وەرە دانیشە نهێنییەکت بۆ دەگێڕمەوە... ئیبتیسام بەمجۆرە دەستپێکردو گێڕایەوە:

تۆ لێت نەپرسیم بۆچی لە مێردەکەی پێشترم منداڵم نەبووە، منیش تاکو ئەمڕۆ دەنگم نەکرد، بۆیەش دەنگم نەکرد چونکە بەر لە هاوسەرگیریمان ڕۆژێک پێکەوە دانیشتین، لە باس و خواسی منداڵاندا تۆ گوتت منداڵ میوە ی بەهەشتە، منیش لێم پرسی ئەگەر نەبوو، تۆ زۆر بە پەرۆشییەوە فەرمووت: ئەوەش دەبێ خودا بیدا، هەبێ و نەبێ تۆ هەر خۆشەویستی منی.
ئەمڕۆ بە بۆنەی ئەم بەخششە پیرۆزەی خودا پێی بەخشین، ئەم فەرخە کەروێشکە ماڵییەی تۆ ناوت وا لێنا، ئەم کۆرپە دەڵەمە تازە خولقاوەی بە پشتیوانی خودا کوڕ دەبێت و من ناوی لێ دەنێم (پشتیوان). بەڵێ ئەمڕۆ بە بۆنەی ئەوەی ناو هەناوم ئەو نهێنی منداڵ نەبوونەم ئاشکرا دەکەم:
نزیکەی دوای ساڵێک لە هاوسەرگیری یەکەمم زگم کرد، واتە منداڵێک کەوتە ناو منداڵدانم، بەڵام دوای سێ مانگ ڕۆژێک هەر لە ژوورەوەی ماڵی خۆمان خلیسکم برد و بە سەر زگمدا کەوتمە سەر کورسییەکی تیژ، کە کەوتم زانیم زەبرێکی گەورەم پێکەوتووە، دوای چەند کاتژمێرێکیش ژانم گرت و بەری نەدام تاچەند پلیتە خوێنێکی قاوەیی تاریک یەک لە دوای یەک لە دامەنم هاتنە خوارەوە. بەمجۆرە ئەو جاری منداڵبوونێکی ئاساییم بە نسیب نەبوو، دەربارەی ئەو لەبەرچوونەم لە چەندین مامان و ژنانی شارەزا لە بواری زاوزێ و منداڵبوونم پرسی، ئەوان دەیان ترساندم و دەیان گوت: لەبەرچوونی، یان بەر هاوێشتنی، یەکەم جێی مەترسییە، لەوانەیە ئەو حاڵەتە چەندین جاری دیکە ڕوو بداتەوە. بە ڕاستیش ڕاستیان فەرموو، دوای دوو ساڵ جارێکی دی گەرای منداڵێک لە هێلکەدانم داندرایەوە، بەڵام دیسان دوای چەند مانگێک بووە خوێن و خیزاوو بە نا ئاسایی هاتە خوارەوە ئیتر هەیبڕ هەیبڕ منداڵم لەو پیاوەی نەبووەوە.ئەو نهێنییەی زیاتر پەیوەندی بە من و تۆوە هەیە ئەوەیە: ماوەیەک لەمەو بەر بە بێ ئەوەی ئاگاداری تۆ بکەمەوە، ڕۆیشتمە لای دکتۆرێکی شارەزا لە بواری زاوزێ و زگ و زاری ئافرەتان، دوای پشکنین پێی ڕاگەیاندم پەچەدانم سووڕایە، ئەو گوتی-بەشەرت بۆت چاک دەکەمەوەو منداڵت دەبێت- منیش ناچار خۆم خستە بەر دەستی، دواتر داوای لێکردم دوای دوو ما نگ و نیو سەری لێبدەمەوە، ئەمڕۆ ماوەکەی دانابوو تەواو بوو، دوای پشکنینێکی ورد مزگێنی دامێ کۆرپەکەم دوو مانگانەیە
کارۆ ئاگای لەوە نەما بوو ژنەکەی چی دەڵێ و چی ناڵێ، ئەو کەوتبووە ناو

گێژەنی دەریایەکی قوڵی بیرکردنەوە: ئێستا هەست دەکەم کەنگرە بێ کەسە نیم، وەک هەموو ئەو پیاوانەی خاوەن ماڵ و ژن و منداڵن، منیش پیاوم، ژنێکم هەیە لە بەر چاوی من لە هەموو ژنان جوانتر و قەشەنگترو ئاقڵترو مەند ترە، لە سا یەی سەری ئەو ژنە بە وە فایەم سەروەت و سامان و ماڵم هەیە، لە زۆر پیاوانیش زیاترم هەیە. لە هەمووشیان خۆشتر دەبمە خاوەن منداڵ.

ئەو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: خوا بکا بە دڵی (ئیبتیسام)ی بکا و کۆرپەکەمان کوڕ بێ، منیش دڵی ناشکێنم ناوی لێدەنێم (پشتیوان). هەم دڵی ژنەکەم خۆش دەبێت و هەم منیش لە دواڕۆژدا خوێنگرو ئێستاش پشتیوانێکم دەبێت.

من لە بەر ژنەکەمە وا دەڵێم، ئەگەرنا یەک بە خۆم کچم پێ باشترە، کچ بۆ دایک و باوکی لە کوڕ میهرەبانترە، ئەوەتە من کوڕم چ ئاگام لە دایک باوکمە، کەچی خوشکەکانم خزمەتیان دەکەن. هەروەها ئەو بیری لە داهاتووی خۆی دەکردەوە دەیگۆ: تەمەن و تاقیکردنەوەیەکی ئەوتۆم دەستکەوتووە بتوانم تام و چێژ لە ژیانی ئاسایی وەربگرم لە سەر پێی خۆم بە باشی بوەستم، لە سەر دەستی باشترین مامۆستای ئەم شارە فێرە خوێندەواری بوویمە، لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی دەرەکی هەردوو قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیم بە زۆر باشە بڕیوە، خولی بەهێز بوونیشم بینیوە، ئەوانە هەمووی لەلایەک، لەلایەکی دیگەش بوویمە توجارپاشی ئەم شارە، دەیان کرێکارو کۆڵهەڵگر بە کارو باری من خەریکن و لە ڕێگەی کارەکانی منەوە ژیانی ڕۆژانەیان دەگوزەرێنن، من خۆم کرێکاری و کۆڵهەڵگریم زۆر کردووە، هەست بە مەرگەساتی ئەوان دەکەم، وەکو هەموو خاوەن کارێک نایانچەوسێنمەوە.

ئیبتیسام جگە- لە خۆشەویستی- دەیویست بە دوو هۆکار، بە دوو ڕێگا، بە دوو پەیوەندی بە هێز کارۆی بە خۆی ببەستێتەوە- سامان و کۆرپەکەی -هەریەکە لە (ئیبتیسام و سامان و کۆرپەکەی) بە گوێرەی ئەو ڕێژەیەی کارۆ لە دڵی خۆیدا بۆی دانا بوون، خۆشەویستیەکەی کارۆیان بە سەردا دابەش ببوو، هەریەکەیان چەندی بەرکەوتبوو بەرنەکەوتبوو، ئەوە نهێنیەک بوو لە ناو دڵی کارۆی دا بوو.

هەردووکیان شەوان لەسەر سیسەمێکی دوو نەفەری پێکەوە دەنووستن، لەو ژوورەی لێی دەنووستن فانۆسێکیان وەک یەدەگ دا نابوو، شەوانە ئەو

فانۆسەیان زۆر کز دەکرد، ئەگەر کارەبا بکوژابوایەوە بۆ ئەوەی بەر پێی خۆیان ببینن فانۆسەکەیان بەکار دەهێنا، زۆربەی شەوەکانیش بۆ دەست بە ئاوگەیاندن یان هەر پێویستییەکی دی جارێک دوو جار لە خەو هەڵدەستان.
ئەو شەوە دوای نیوەی شەو بوو، ئیبتیسام لە خەو هەستایەوە تاریک بوو، چاوی بەتەواوی کردەوە تروسکاییەک ڕۆناکی نەدیت: ئای خودایە، ئەم شەو کارەبا کوژاوەتەوە،لەبیریشم چوو سەر لە ئێوارە فانۆسەکە پڕ نەوت بکەم کوژاوەتەوە.
ژنە دڵی بەروەستی نەدا مێردەکەی لە خەو ڕاپەڕێنی، لە لایەکی سیسەمە تەختە دارەکە چووە خوارەوە، هەرکە چووە خوارەوە و چەند هەنگاوێک ڕۆیشت بووە تەقە تەق و هۆڕە هۆڕ، کارۆ بە ئاگا هات، بەڵام لەبەر تاریکی هیچی نەدیت، ئەو پێی وابوو پشیلەیەو خۆی بە چەند کەلوپەلێکی ناوماڵ دادایە، چەند جارێک دەنگی داو ختە ختی لێکرد، کەچی بووە هاوار هاواری ئیبتیسام: کورە کارۆ بمگەیێ ماڵم کاول بوو.
کارۆ لە ناو تاریکایی ژوورە تاریکەکەدا تەنها بە هاوار هاوارو جوولە جوولی ئیبتیسام، زانی لە چ لایەکە و لە کوێ گیری خواردووە، بە دەست کوتان خۆی گەیاندێ و قیتی کردەوە، لە باوەشی گرت، دڵی دایەوە، هیچێک لەمانە بۆ ئیبتیسام سوودی نەبوو.گریا، گریانێک نە بۆ باوکی و نە بۆ دایکی وا گریا بوو، نە دڵدانەوە و نە باوەش تێوەرینان و نە ماچەکانی کارۆ هێوریان دەکردەوە. کارۆ بەرەو فانۆسەکە ڕۆیشت، ڕایشەقاند تریی نەوتی تێدا نەبوو، بە پەلە هەندێک نەوتی تێکرد و دایگیرساند. بەباشی سەیری ژنەکەی کرد، ئەوەی ئەو نەیدەویست بە چاوی خۆی بینی. پارچە خوێنی سووری زۆر تۆخ، پارچە گۆشتی دەڵەمەی خوێناوی، ئەویش گریا، بۆ خۆی نا بۆ دڵی پڕ زامی ژنەکەی گریا. کارۆ تێگەیشت کار لە کار ترازاوە و گریان دادیان نادا، سەری بردە بن گوێی ئیبتیسام و پێی گوت: با ناشوکری نەکەین، دیارە کاری خوایە، گرنگ نییە دووەمیشی بۆ خۆی بردەوە، خەمی لێ مەخۆ، ئەو ڕۆیشت ئێمە ماوین، ئەو (پشتۆ)یەش نەبێ یەکێکی دی دەبێ.

## ٢٠

ساڵی (١٩٦٠) بوو، نانی ئێوارەیان خواردبوو، هەردووکیان- ئیبتیسام و کارۆ - لە بەرامبەر دیتنۆکی ناو هۆڵی ماڵی خۆیان بە ئارامی دانیشتبوون، کارۆ ناوە ناوە ڕاچەنینێک بە جەستەیدا دەگەڕاو ڕادەجڤری، چاوە بلاجکتۆرییەکانی بۆ دیتنۆکەکە و گوێیە کەروێشکییەکانی بۆ بڵاوگۆیەکە ڕاگرتبوو، هەستیشی بۆ هەردوولا دابەش کردبوو: ئەوە دەنگ و باسی کاتژمێر (١٠) لە بەردووکیاندا تێپەڕی، کەچی ئەو بڕیارەی باسی دەکەن نەخوێندرایەوە.

کارۆ بێزاری و ناڕەزایی دەردەبڕی. بیری وەکو مەشکەی دۆی دەهەژاو چەوری نەدەگرت: دیارە هەر گۆتە گۆت بوو.

ڕستێک (ئاخ) هەناوو سینگ و بەرۆکیان گرت، ئاخەکان وەکو تەسبێحی سەدو یەک قلی تۆبەکاران داوەکەی پسابێ، قل قل دەردەپەڕینە دەرەوە: خۆزگە قەت ئەو مەلا نازدارەم نەدیتبوایە و نەمناسیبوایە، ئەگەر نەمناسیبوایە ئەوەندە خەفەتیشم بۆ نەدەخوارد.

ئیبتیسام هەندێ قرتەی بۆ مێردەکەی هێنا: من دەچمە ناو ناندینەکە، هەندێ ڕێژەو پێژەم هەیە جێبەجێی دەکەم، تۆش هەتا من تەواو دەبم ئەو قرتەیە بقرتێنە و خۆت خەریک بکە.

کارۆ لە ژنەکەی مۆڕ بووەوە: هەر ئەم چەنگە؟ ئەو قجی و فجیەت لە چییە؟

_ پیاوەکە شەو درەنگە، هەر بای خۆ خافڵاندنم بۆ هێنا ی.. ژنە گوتی.

_ ژنەکە دەرگاخنی مەڕدۆشێک برێشکەمان هەیە، بۆ بە قنیات دەمدەیێ !؟.

ژنە چەنگێکی دیکەشی لە ناو ڕەشە دەمبەشەکە بە جوانی هەڵقرچاند، بۆی هێناو جامیلکەیەکی بۆ پڕ کرد.

کارۆ قرتە قرتی دەکردو لە مەودایەکی داخراویشدا دەخولایەوە، تەنیا یەک پرس مێشکی داگیر کردبوو: هەتا سعات دوازدەش دادەنیشم، ئەگەر بێت و ئەو بڕیارە ی وەزارەتی مەعاریف ببیستم، ئاد بێت بەیانی بچمە مەیدانی ئاژەڵفرۆشان، مێنگوینێک یان هەر کوشتییەک بکڕم و بیکەمە خێر.

هەندەی نەبرد دەعبای بێزاری بەرە بەرە گیانی دەخوارد، باویشکێکی قووڵ وەختبوو هەردوو کاپێژی لە بار یەکدی دەربهێنێ، چاویشی لێرو وێر بوون: باشتر وایە سەرێک بە دەرەوەدا بگرم، بایێکم لێ بداو خەوەکەم برەوێنمەوە.

شەوێکی تاریکی سامناک و ترسناک وەکو زارەترەکی گۆڕستانەکان، ڕەشەبایێکی ساردی سەر بەفری کوێستانەکان، هەورێکی تیری کورتە باڵای تازەزای وەکو ڕەشماڵی شوانکاران بەڵام بە بێ چیغ و سنگ و ئەستوندە، هەورەکە وەکو بۆمبا ئەتۆمیەکەی سەر هیرۆشیما بڵاچەی دا و تەقییەوە. بە هۆی وژە وژی با و خوڕە خوڕی باران هەر پێیەکی کردە دوو، خێرا خۆی لە ژوورەوە نایەوە. سەیری کرد لووره لووری بایە بە هێزەکە شاشەی دیتنۆکەکەی ڕەش هەڵگەڕاند و سەرو سیما و دەنگی بێژەرەکەش لە ناو با و باراندا خنکا، دەنگی بڵاوگۆیەکەش بووە نووسکە نووسک و خنخناگەی گیرا. کارۆ وەکو دەبدەبە، وەکو میزڵدانێکی پڕ پف کرای پف هەڵما و پلت لێ بدابوایە دەتەقی: وەختی ئەم هەورە ڕەشە چڵکنەی بوو !! ئەم بایە هیوا بڕو گورچکبڕە لە کوێ بۆ من پەیدا بوو !!؟ ئای ناوچەوان نایکەی.. کارۆ بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لە ئاسمان دەکرد.
هەردووکیانی کوژاندەوە، برێشکەکەی بە جامیلکەوە هەڵگرت و لە شوێنێکی بەرزی دانا، بەرماوەی قرتاندنەکەی کۆکردەوە و بردییە ناو زبڵدانی ناندینەکە، هەر لەوێش دەم و ددانی خۆی جوان شوشت. بەرەو خەوگەکەی ڕۆیشت و خۆی دواند: مرۆڤی ئارام ئەگر وەکو چرایەکە نەوتی لێبڕابێ، با پەلەی نەکەم هەر بڕیارێک هەبێت ڕۆژنامەکان بڵاوی دەکەنەوە.
دوای زڕخەویەکی زۆر و ئەم تەنگێش و ئەو تەنگێشکردنێکی بێزارکەرو هەراسانکردنی سەرجێیی ژنەکەی و چەندین خەونی کەس نەدیتە، بەیانی زوو لە خەو هەستا، چووە دەرەوە و خۆی گەیاندە ناو باخچەکەی حەوشەکەیان، سەیری ئەم لاو ئەو لای ئاسمانی کرد لە دوو سێ ملە هەوری زیویی دوور بە دووری زیاتری نەدیت. چەپکێک تیشکی خۆر بەلادیواری حەوشەکەوە خۆی حەساندبووەوە، هەوا بە نەرمی گەڵای دارەکانی دەجولاند و پشتی خۆشی بە هەمان لادیوار دەخوراند. نە ئەو ڕۆژەو نە چەند ڕۆژێکیش دواتر شوێنەواری دەنگ و باسی ئەو بڕیارە دیار نەبوو.
مانگەکانی ئەو ساڵە لە بەرچاوی کارۆ بە پێی مێروولە دەڕۆیشتن، ناوە ناوە دەنگ و باسی بڕیارەکە دەکەوتە سەر زاری هەندێ کەسەوە و ماوەیەکی زۆریش دەکەوتە بن بەردی. بەیانییەک بۆ ئەوەی دوکانەکەی بکاتەوە لە ماڵ چووە دەرەوە، لە ڕێگا چاوی بە چەند ڕۆژنامەیەکدا گێڕا، سەرەتا سەیری مانشێتەکانی کرد، لە یەکێک لە ڕۆژنامە ڕەسمییەکان بە مانشێتێکی گەورە بڕیارەکە نووسرا

بوو، خوار مانشێتەکەشی بە تەواوی خوێندەوە، خەنی خەنی لە جیاتی بڕواتە دوکانەکەی بە پەلە گەڕایەوە ماڵەوە، ڕۆژنامەکەی دایە ژنەکەی ئەویش بە تەواوی خوێندیەوە، ژنە سەری سوڕما، بە مێردەکەی گوت: چۆن دەبێ مەلا ببنە مامۆستای سەرەتایی؟ ئەوانە ئەلف و بێی مەلایەتیان خوێندووە، خۆ دەروونناسی و ڕێگاکانی وانە وتنەوەیان نەخوێندووە.

کارۆ خۆی لە ژنەکەی تووڕە کرد: خوێندویانە نەیانخوێندووە کاری ئێمە نییە، حکومەت خۆی دەزانی چی دەکاو چی ناکا، ئەوانە ژیان و گوزەرانی کۆڵەمەرگیان زۆر دیوە، چاویان لە دەستی خەڵکی خێرەمەند بووە، ئێستا ئەو حکومەتە لێیان بە ئاگا هاتووە دەیەوێ قەرەبووی ڕابردوویان بۆ بکاتەوە، پێویستە دەستخۆشی لەم بڕیارە بوێرەی حکومەت بکەین نەک تانەی لێبدەین.

گرنگترین شت لای کارۆ ئەوەبوو دەیویست بە هۆی دەرچوونی ئەو بڕیارە ڕۆژی تاقیکردنەوە مەلای ببینی: ئەوە باشترین دەرفەتە دەتوانم مەلای ببینم، لە هەمان کاتدا منیش لەگەڵ مەلای خۆم تاقیبکەمەوە یان دەردەچم یانیش تێدەچم. هەخۆشی دڵی خۆی دەدایەوە: لە هەندێ لەو مەلایانەم زیاتر خوێندووە بۆ دەرناچم؟

کەمێک دۆش داما دواتر بیری کردەوە: ئەو نهێنییەی خۆم ئێستا لای ئیبتیسام نادرکێنم، بۆ دوای تاقیکردنەوەکە هەڵیدەگرم، ئەگەر دەرچووم وەک کارێکی سەرسوڕهێنەر سەرسامی دەکەم.

ئیبتیسام تێی گەیشت بۆ هەندە سەرسەختانە بەرگری لەو بڕیارە دەکات و بە ڕەوای دەزانی:

_ هەناسەم خۆ ئەو بڕیارە مەلای برادەریشت دەگرێتەوە؟

_ ئەدی چۆن نایگرێتەوە.

لە بیرکردنەوەیدا کە شپرزەییەکی پێوە دیار بوو، لە هەنگاوەکانیدا کە هێشتا دیار نەبوو بۆ کوێیان بهاوێ، دیار بوو گوریسکێشکانێ و ڕاکێش ڕاکێشێک لە مێشکیدا هەبوو. وێنە کۆنەکانی تەمەنە مەرگەساتییەکەی، شەش ساڵ لەمەوبەر لە ناخ و مێشکیدا سڕابوونەوە، کەچی وێنەی مەلا شاشەی کامێرای مێشکی بە تەواوی پڕ کردبووەوە و نەدەسڕایەوە، هەرچەندە پلی دادەگرت و لادەچوو، بەڵام کە پلی لادەبرد یەکسەر دەهاتەوە: عەجیب غەریب، تەنیا ئەم وێنە کۆنە لە ئەلبوومی یادگارییەکانم وا چەسپ بووە، نەلادەبرێ و نە دەسڕێتەوە.

چاکەکانی مەلای دەژمارد: یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج. هەتا (دە) ی ژمارد، لە وێ راوەستا و بیری کردەوە: مەلا نەبوایە لە کوێ بەم رۆژەی دەگەیشتم، ئەو رێگای بۆ خۆشکردم، چەوریێژی کرد، پەستایەوە، قیرتاوی کرد، من بە خۆم و بە عەرەبانەکەم نەمدەزانی چۆن پێیدا برۆم، قۆرت و کۆسپم تێدا دروست دەکرد، ئەو هاندەرو هاوکارم بوو، شارەزابوو قۆرتی پردەکردەوە و کۆسپی لادەبرد. بەڵام ئیبتیسام بووە هۆکار بۆ ئەوەی بە تەواوی فێرە خوێندەواری ببم و قۆناغەکانی خوێندنیش ببرم، ئەو باشترین مامۆستای بۆ گرتم، مامۆستاکان لە تاقیکردنەوەی دەرەکی بەشدارییان پێکردم سەریش کەوتم، ئیستاش دەرفەتێک هاتۆتە پێش بۆ ئەوەی لەگەڵ مەلاکان تاقیکردنەوە ئەنجام بدەم، دڵنیام لەوەشدا سەردەکەوم، ناشبێ رۆڵی مەلا ی نادیدە بگرم، ئەویش زۆر شتی مەلایەتی فێرکردم، کەواتە لە سەرکەوتنەکەمدا بەشێک لە رۆڵی ئەویشی تێدایە.

ئەو تاقیکردنەوەیە دەرفەتێکی دەگمەن بوو بۆ ئەوانەی لە بواری مەلایەتییان خوێندبوو، یان ئەوانەش کە خوێندەواری باشیان هەبوو، بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەو مەبەستەش بەر لەوەی تاقیکردەوەکە ئەنجام بدرێ خولێکی پەروەردەییان بۆ کردنەوە، کە چەند وانەیەکی وەکو ئاین و زمانی عەرەبی و کوردی تێدا دەخوێندرا، دوای بینینی ئەو خولە تاقیکردنەوەیان ئەنجام دەدا، ئەوەی سەرکەوتوو بوایە دەبووە مامۆستای سەرەتایی. لە ماوەی ئەو خولەدا، کارۆ لە جیاتی دوکانەکەی بکاتەوە، بەشداری لەو خولە پەروەردییە دەکرد، بەڵام زۆر خەمی دەخوارد مەلا لەو بنکەیە نەبوو کە ئەو تێیدا بەشدار بوو، نەشی دەزانی بنکەی دیکە لەناو بەغدا هەیە مەلا لەوێ بەشدار بووە. دوای خولە پەروەردەییەکە رۆژی تاقیکردنەوەش دیاری کرا. بەیانی رۆژی تاقیکردنەوەکە بۆ ئەوەی زووتر خۆی بگەیەنێتە شوێنی تاقیکردنەوەکە، کارۆ لە گەڵ (با) لە کێبڕکێ دا بوو، هەرچەندە ئەو نەیدەزانی مەلا لە بنکەیەکی دیکە خولەکەی بینیوە، بەڵام شتێک خختەی دەداو لە مێشکی دەیخوێند کە مەلا دێتە ئەو تاقیکردنەوەیە. چەند مەترێک دوور لە هۆڵی تاقیکردنەوەکە خۆی خستە پەنا ستوونێکی کارەبا، ئەو نیازی وا بوو: هەرکە مەلا بەم ناوە دا هات لە ناکاو گوڕی دەکەمێ و باوەشی تێوەردێنم، ئەو شاگەشکەو منیش خەنی دەبم.

لە پڕ چاوی بە دەموچاوێکدا چەقی، تێیڕاما زانی نامۆ نییە: ئەو بڕۆی چڕی داسووکی و برژانگی قەڵداسی و چاوەکانی دوو ژێر پیاڵە بوون، ملەوەزو

تێکچەقیوو بە خۆوە بوو، کە دەڕۆی ڕمپەی پێی دەهات، لە تەمەنی سی و پێنج ساڵی دا بوو، پرچێکی ئەگەر بڵێم ماش و برنجی لە وانەیە زۆر ورد نەبم، نە ڕەشێکی زۆر ڕەش و نە سپیش بوو، ئەگەر بڵێم بۆر بوو لەوانەیە لەوەشیاندا بە هەڵەدا چووبم، کەواتە با بڵێین بنەوشەیی بوو.
شادەنوێژی کردە سپانە و لە بنا گوێی خۆی چەقاند، دوو سێ جار بایدا و بورغیەکانی کەللەی پێکردنەوە: هەمان بچمە، بەڵام وەکو پەیکەرێکی بوودەڵەی نیمچە زیندوو دێتە بەر چاوم، کوا بەژنە بەرزەکەی؟ چەمایتەوە. کوا تەبەشە پانەکەی؟ پووچ بوویتەوە. کوا پرچە بۆرە دەنک دەنک برنجیەکەی؟ دیارە ئەو ستەمکارانە تەنها دەنکە ماشەکانیان بە مووکێش دەر کێشاوە.
ئەو مام سەبرۆکەییانە بەرە بەرە دەهاتە پێش، (کارۆ) ش وەکو ژووژک زیاتر خۆی گرمۆڵە دەکرد، سەری دەبردە ناوە خۆی و دەری دەهێنا، لە پەنا ستوونەکە چاوچاوانێی لە گەڵدا دەکرد: ئەگەرچی گۆپاڵێکیشی بە دەستەوەیە و پێوەی دەڕوا، بەس قەت چاوم درۆی ناکا هەر هەوە.
وەک ئەوەی لە گەشتێکی گەڕانی دوورو درێژدا، لە پڕ گەیشتبێتە **شوێنی** مەبەست و دیمەنە جوانەکە سەرسامی کردبێت، نەک **هەر سەرسام شاگەشکەشی** کردبێت: ئای لەو ڕێکەوتە لە ناکاوە سەیرەی، **چەندین ڕێکەوتم تاقیکردەوە** سوودی نەبوو، قەت بڕوام نەدەکرد دوای **شەش ساڵ دابڕان و چاوەڕوانی،** ڕۆژێک لە ڕۆژان چاومان بە یەکدی دەکەوێتەوە.
بە خەندەیەکی شەرمنانەی لەرزۆک مەلا باوەشی بۆ کردەوە و یەکدییان کوشی، تەبارەی دەموچاوی یەکدییان بە ماچان دروێنە کرد، جۆگەلەی ئەشکە نەرم و گەرم و سوێرەکانیان، لە خۆشی بە یەکدی گەیشتنیان، بە سەر قەلبەزەی گەردەنیاندا دەبوونە تاڤگە و بە پێدەشتی سینگیاندا شۆڕدەبوونەوە
مەلا نەیتوانی لە سەر پێیان ڕابوەستی، ئەو لە تەنیشت ستوونەکە چوار چەمکی و (کارۆ) ش لە بەرامبەری پێکەوە دانیشتن، مەلا لەوی پرسی: زۆر گۆڕا ی؟
_ مامۆستا من یان تۆ؟ کارۆ وەڵامی دایەوە
_ تۆ بە سۆرو بەلی، منیش بە سیس و پووتی.... مەلا وا ی گوت.
کارۆ دیسان باوەشی بۆ کردەوە و ماچی کرد: توخوا وا مەڵێ، من بە دیتنی تۆ گەشایمەوە.

_ ئێستا چی دەکەی لە کوێی؟ مەلا لە کارۆی پرسی.
کارۆ بە گەشبینی و پێکەنینەوە بە مەلای گوت: لە سایەی سەری تۆوە من لەو پەڕی باشی دام، من بوویمە ئەو مانگە تەبەش پانەی لە ئاسمانی ژیانی تازەمدا دەدرەوشێمەوە، ئێستا چەندین پایەی بینای ژیانی بەختەوەریم هەیە، ژنێکی ژیر، ماڵێکی ئارامی وەک بەهەشت، پارەو سامانێکی زۆر، مێشکێکی پڕ لە بیرۆکەی تازەگەری و خاوەن بڕوانامەی خوێندن هەموو خەمەکانیان لە بیر بردیمەوە. ئیستاش هاتووم ئەم تاقیکردنەوەیە ئەنجام بدەم بە پشتیوانی خودا من و تۆ دوای ئەم تاقیکردنەوەیە بڕوانامەی مامۆستایەتی وەردەگرین و پێکەوە دەچینە یەک قوتابخانە.
مەلا بەقسەکانی کارۆ زۆر دڵخۆش بوو، ئەویش دڵی خۆی بۆ کردەوە: برام شەکراوی قسەکانت هەموو تاڵی و تفتیەکانی شیرین کردم، خودا بە سافیلکەیی خۆتی لە گەڵدا کردی، ئینشائەڵا سەد ئەوەندەشت زیاتر بداتێ بەڵام شتێک هەیە حەزدەکەم بیزانی، تۆ وا زەن نەبەی لە مێشکی خۆم دەرم کردی، بەیانی کە لە خەو هەستام تۆ ڕۆیشتبووی، هەر ئەو ڕۆیشتنەت بوو نەمدیتیەوە، بۆ بەیانی و بۆ دوو بەیانیش نەگەڕایەوە، شەپرزە بووم و شلەژام، نەمزانی ئەو نەگەڕانەوەیەت بە ئەنقەست بوو، یان دەستێکی ڕەش بەرەو نەهامەتی ڕایکێشای، چەندین نەخۆشخانە و پۆلیسخانە بە دواتدا گەڕام، چەند ڕۆژێکیش سەردانی ئەو بازارەم کرد کە کاری عەرەبانچییەکەت تێدا دەکرد، دەشمزانی لە کام شوێن ڕادەوەستای زۆر چاوم بەوێشدا گێڕا، تا ئەو شەوەش کە سیخوڕو چەلاوخۆرەکەی پاشا بە گرتنی دام هەر کۆڵم نەدەداو بەردەوام بە دوای سۆراغێکتدا دەگەڕام.
_ ئەو سیخوڕە بەدفەڕە چ ناپەسندێک بوو؟ کارۆ دەیویست خۆی دڵنیا بکاتەوە بزانی دەروێش ڕەحیمە یان نا.
زەنگی دەستپێکردنی تاقیکردنەوە و چوونە ژوورەوەی ناو هۆڵەکە لێیدا، پرسیارەکەی کارۆ بە بێ وەڵامی یەقین مایەوە، نەیان توانی سەربردەی ژیانی ئەو شەش حەوت ساڵە لە یەکدی دووریەی خۆیان بۆ یەکدی تەواو بکەن، هەر ئەوەندە پێڕاگەیشتن بڵێن: دوای تەواوبوونی ماوەی تاقیکردنەوەکەیەکدی دەبینینەوە.
کارۆ زۆر بەپەلە تاقیکردنەوەکەی ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی پێش مەلا تەواو بێت

و چاوەڕێی بکات پێکەوە بڕۆن. کە هاتە دەرەوە چەند کەسێکی زۆرتەی بینی، بە جلی ئەفەندییاتی و دەمانچەیان لەبەر قایشی پانتۆڵ لە بەر دەمی هۆڵەکە پیاسەیان دەکرد، پیکابێکی پڕ پۆلیسیش هێنرا بووە ناو حەوشەی شوێنی تاقیکردنەوەکە، ئەو پێی وابوو بۆ پاراستنی تاقیکردنەوەکە هاتوون، ویستی لە شوێنێکی ناو حەوشەکە ڕابوەستی، کەچی چەکدارەکان ئاماژەیان بۆ کرد بڕواتە دەرەوە، لە گەڵ چوونە دەرەوەی سەرەدیقانێ و قوتە قوتێکی گومانـاوی بینی: ئەوە دەروێش ڕەحیمە لێرە چی دەکات !!؟؟.....بە سەرسوڕمان و شلەژاوییەوە کارۆ لە خۆی پرسی.

ویستی بچێتە لای و بیدوێنی، ئەو خۆی لێ شاردەوە، چاوی بەمەلا و بەولادا گێڕا نەیدۆزییەوە، لە تەنیشت هەمان ستوونی پێشتری کارەبا ڕاوەستا، ڕاوەستا بەڵام دڵی کوتە کوت و ڕنگە ڕنگی بوو، لەبەر ئاسمان پاڕایەوە: ئەو هەموو چەکدارەو قوتە قوتی ئەو سیخوڕە بەدفەڕە !! یا سەتار سەترمان بکەی.

دوای چەند خولەکێک چلێک زەیتونی لە ناخی خۆیدا ڕواند: دەی هیچ نییە با ئەو سەگە هەر بحەپی، مەلا خۆی خاوەنی ئەم شۆڕشە مەزنەیە، بە خۆڕاگری و برایەتی کوردو عەرەبە نیشتمان پەروەرەکانی وەک ئەو، ئەم شۆڕشەی هەڵگیرساند بەرپا بوو.

دوو دڵییەک پاڵەپەستۆی خستە سەر مێشکی و لە کەللەیدا دەرچوو: ئەو برایەتییە زۆر زەحمەتە، هەر ئێمەین بە برایان دەزانین، ئەوان لە دەویان دەرناچی، ئەوان خۆیان بە برا گەورە دەزانن، برا گەورایەتیشیان بۆ چەوساندنەوەی ئێمەیە، نەک برایەتی ڕاستەقینە. ئێمەش ئەگەر حکومەت و سەرۆکی خۆمان هەبوایە و لە خۆمان بوایە کەس نەیدەتوانی بمانچەوسێنێتەوە، نەیان دەهێشت برسی بین پارووی نانیان لە دەوی حۆیان دەردەهێنا و دەیان خستە دەوی ئێمە، ئەو سەروەت و سامانەی سەر زەوی و ژێر زەوی بۆ خۆمان دەبوو، هەمووی دادپەروەرانە بەسەر برسی و هەژاران بە بێ جیاوازی دابەش دەکرا.

ئاخێکی خەمناک لە هەناوی دەرپەڕی: وا بزانم ئەوەش هەر خەیاڵ و خەونی حوشترەکەی ئەوانە، بەشەر هەر بەشەرە، چ عەرەب، چ کورد، چ فەرمەسۆن. ئەوە دەروێش ڕەحیم بە ناو کورد نییە، وەکو ماری ناوە ناوە سەری قیت دەکاتەوە و دەفیشێنی، کفە کفمان بە دەوریدا دەکا و دەیەوێ دەرفەتێک بڕەخسێ، ئەو ژەهرەی لە هەناوی دایە بە سەرماندا بیرژێنی.

نائومێدییەکی زۆر گەورە دڵتەنگتری کرد: هەر ئەوو هەزارانی وەک ئەو، لەوانەی لە پشتەوە ڕا پێمان بۆ دوژمنەکانمان دەکێشنەوە، دەبنە کاربەدەست و دەمانچەوسێننەوە.
ئەو خەریکی ئەو هورێنانە بوو مەلا بەوێدا ڕۆیشت، بەڵام چ ڕۆیشتنێک !؟ لە ناو پیکابێکی پڕ پۆلیس دەستی کەلەپچە کرا بوو، چەند چەکدارێکی چاکەت و پانتۆڵ لە بەریش دەورە یان گرتبوو، مەلا سەری بەرز کردەوە، هاواری کرد: بە تۆمەتی بەشداری کردنم لە پشێویەکەی شاری کەرکوک سیخوڕێکی ماڵی پاشا دیسان درۆیەکی شاخداری بۆ هەڵبەستام و بە گرتنی دام.
دوو سێ شەق و شولاقیان لە سەرو گوێلاکی دا و کڕیان کرد.. کارۆ بۆ ئەوەی بزانی بۆ کوێی دەبەن، بە پەلە تاکسییەکی بە کرێ گرت و بە دوایاندا ڕۆیشت، کەچی لە ناو شەقام و کۆڵانەکانی بەغدا بزر بوون.
دوای ماوەیەک لە یەکێ لە ڕۆژنامەکان بانگەوازێکی وەزارەتی مەعاریفی عێراقی بەرچاو کەوت، خوێندیەوە -بانگەوازێک بۆ ئەوانەی بە مەبەستی دامەزراندن وەک مامۆستا لە سەر میلاکی وەزارەتی مەعاریف داواکارییان پێشکەش کردووە، سەردانی دیوانی وەزارەت بکەن- کارۆ لە هەمان ڕۆژی دیاری کراودا سەردانی وەزارەتی کرد، لیستی ناوی دەرچووەکان و دەرنەچووەکان بەلادیوارێک هەڵواسرابوو. مەلاش یەکێک بوو لە دەرچووەکان، بەڵام لە تەنیشتی ناوەکەی چەند تێبینییەک نووسرابوو. کارۆ هەرچەندە زۆر خەمی خوارد بەڵام بێ سوود بوو. فەرمانی کارگێڕی دامەزراندنەکەی وەرگرتەوە و گەڕایەوە.
لە ڕێگای گەڕانەوەیدا نەرمە بایەکی لە خۆبایی بوون، یان خۆ بە شت زانین، ڕوخساری باوەشێن دەکرد و دەیگەشاندەوە: ئەوە منم گۆچانم کردە پێنووس !!؟.. کەس نەبوو وەڵامی بداتەوە، خۆی وەڵامی خۆی دایەوە: بەڵێ ئەوە منم، عەرەبانەکەشم دەکەمە ماشێن، هەر ئەوە دەمینێ باڵم لێ بڕسکێ و بفڕم.
چەند مەترێک بەرەو ماڵەوە ڕۆیشت ساتمەیەکی کرد پەشیمان بووەوە، خۆی بە خۆی گوت: ئەدی دوا تر؟ نەکەی کارۆ نەکەی، دواتر لە جیاتی بفڕی دەتڕی.
هۆشی کەڕاندەوە کەللە ی، هەندێک با ی لە خۆ بەردا: با لمووزم نەشکێ، هەمووی دەستکەوتی من نییە، نازانم سوپاسی کێ بکەم؟ با یەکەم خودا بێ، دووەم مەلا، سێیەم ئیبتیسام، ئینجا ناوچەوانی خۆم.
لە جیاتی یەکسەر بگەڕێتەوە ماڵەوە، هەر لەو شوێنەی لێیبوو بایدایەوە و بە

سـواری تاکسـییەک چـووە مەیدانـی ئاژەڵفرۆشـان، دوو مێنگوینـی گـەورەی کـڕی و لـە پیکابێـک بۆیـان بارکـرد: یەکێکیـان بـۆ ئەوخێـرەی بـۆ بوونـم بـە مامۆسـتا لـە خـۆم گرتبـوو، ئـەوی دیـش بۆدیتنـی مـەلای.
فەرمانـی کارگێـڕی دامەزراندنەکـەی کـردە دوو پارچـە، پارچـەی یەکـەم دەقـی بڕیارەکـەی تێـدا نووسـرابوو لـە ملـی کوشـتی یەکەمـی کـرد، لیسـتی نـاوە دامەزرێندراوەکانیشی،کە لـە خـوارەوەی فەرمانەکـە نوسـرا بـوو، لـە ملـی کوشـتی دووەمـی کـرد، یەکـەم جـار مێنگوینـی یەکەمـی بـردە ژوورەوە ئینجـا دووەم،ژنـە کاغەزەکـەی لـە ملـی ئاژەڵەکـە پچڕاند، خوێندیـەوە پێـی سـەیر بـوو تێینەگەیشـت:
ئـەم پارچـە کاغـەزە چییـە؟ مـن وامزانـی کێـش و نرخـی ئاژەڵەکـەی تێـدا نووسـرایە.
_ دە سەیری ئەم پارچەیەی ملی دووەمیش بکە.. کارۆ پێی گوت.
ژنـە پارچـەی دووەمیشـی لێکـردەوە، یەکـە بـە یەکـە بە ناوەکانـدا هـات و خوێندیەوە، هـەردوو پارچـەی بـە یەکدییـەوە نووسـاند، دیسـان خوێندیـەوە، لـە پرمـەی گریانیـدا، بـە هـۆی گریانەکـە تەنیـا یـەک وشـەی بـۆ دەرنەبڕا.
کارۆ بـووە لاولاوە و بـە قەدیـەوە نووسـا، هەناسـەی بـە هەناسـەیەوە نـا: لـە جیاتـی پێبکەنـی و پێچێـک شـایی بکـەی، دەگرییـی و لشـمە لشـمێ دەکـەی؟
_ گریـان و لشـمە لشـمی دڵخۆشییە حەیاتـم.. بـە قورگـی پـڕ بـە گریانـەوە بـە کارۆ ی گـوت.
_ ئـەو دڵخۆشـییەی ئێسـتامان هەمـووی بـەری ڕەنجـی هـەوڵ و ماندووبوونـی تۆیـە، بـە هونـەری تـۆ نەبوایـە قـەت نەدەگەیشـتمە ئـەم ڕۆژە خۆشـەی...کارۆ پێـی گـوت.
_ هەناسـەم نـە هونـەری منـی تێدایـە و نـە هـی کـەس، خـۆت ئامادە باشـیت تێدایە، زانسـت هیـچ جـۆرە تۆیەکـی نییـە بیخاتـە نـاو مێشـکت، ئـەو تەنهـا تۆیەکانـی نـاو مێشـکی خـۆت ئـاو دەدا و دەیڕوێنـی و دەیگەشـێنی و پێیدەگەیێنـی.. ئیبتیسـام ئـەو وتەیـەی بـەوی گـوت لـە کتێبـان خوێندبوویـەوە
_ قسـەکانت بـە شـەکر بن، بـەڵام ئەگـەر بایەخـدان و چـاوە جوانەکانـی تـۆو، ئەلـف سـەرئا ی مـەلا ی نەبوونایـە، دەبوایـە هەتـا دەمـرم هـەر عارەبانـەم ڕابکێشـایە...
ژنە ناوچەوانی پیاوە ی ماچ کرد:
_ ئەدی حیسابێکیش بۆ ئەم ناوچەوانەت ناکەی؟
_ بەڵێ ڕێزو سوپاسم بۆ ئەویش ناردووە.. کارۆ پێی گوت.

## ٢١

ساڵەکان وەکو پەروانە بەدەوری چرای تەمەندا زۆر بە پەلە دەسووڕان و یەکە یەکە گڕیان لە جەستەی خۆیان بەردەدا، ڕەوشی عێراقیش بەرە بەرە لە باش بەرەو خراپ دەگۆڕا. لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووز هەندێ ڕووداو ڕوویان دا و کاریگەرییان بەسەر ئەو ڕەوشەدا هەبوو، بەتایبەتی هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردستان لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١...

(٨) ی شوباتی ١٩٦٣ بوو، یەکەم ڕۆژی کودەتا شوومەکەی بەعسییان بوو، خوێنی پاک بە گەشی لە شادەمارو دەمارە وردەکانی جەستە زامدارەکەی شاری بەغدا ڕێچکەی بەستا بوو. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کوورەی دۆزەخی بەغدا لە سەر دەستی ئەوان گەرمتر دەبوو، بە پێچەوانەی دۆزەخی خودا، سووتەمەنی ئەو دۆزەخە هەمووی پیاوی چاک و مرۆڤە بە ویژدانەکان بوون، تالآن و لێدان و کوشتن- ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی لێدەرچێ- سیمای ئەو شارەو هەموو شارەکانی عیراق بوو. نەک هەر ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواتریش، ماوەی فەرمانڕەوایی ئەوان کەم کەس دڵی کەمێک ڕووناکی تێدا بوو.

کاتژمێر (١) ی دوای نیوەڕۆی دووەم ڕۆژی کودەتاکەی هەمان ساڵ بوو، مامۆستا (کارۆ) لە گەڵ مامۆستایانی قوتابخانەی گوندەکەیان، بە سواری جێبێکی لاندرۆڤەر گەڕابوونەوە ناو بەغدا. لە پردی (الاحرار) پەڕیبوونەوە و لە شەقامی (ڕە شید) ەوە بەرەو گۆڕەپانی (مەیدان) دەڕۆیشتن، ئەو گۆڕەپانەی دەکەوێتە بەرامبەر وەزارەتی بەرگری عیراقی. یەکێک لە مامۆستاکان لە نزیک ئەو گۆڕەپانە دادەبەزی. لە ناو ئەو گۆڕەپانەدا هەمان دیمەنی پێنج ساڵ لە مەوبەر بە شێوەیەکی دی دووبارە ببووەوە. سەدان کەس کۆ ببوونەوە، هەر بابایە وتاری دەخوێندەوە و کەس بە کەسەوە نەبوو، لە ناوەوەو دەرەوەی وەزارەت و فەرمانگەکانی دەورو بەری، تەرمی مردووان و لاشەی زیندووان پێکەوە ڕادەکێشران. لە بەرامبەر فوارەی خوێنی خوێنڕژاوەکان و ئەو مەرگەساتییەشدا، بژی بژی و بمری بمری و بڕووخێ بڕووخێی بێ ویژدانەکان نەدەبڕایەوە. دروشمی سەیر سەیر دەبیسترا، لە ناو ئەو هەموو حەشاماتەدا تەنها دوو کەس جلی کوردییان لەبەردا بوو، وەکو دوو دەنکە داڕووجانی ناو لەگەنێکی پڕ برنج لە دوورەوە دەناسرانەوە. بەڵێ دوو کورد، دوو سیخوڕی بێگانە هەبوون،

مامۆستا کارۆ هەردووکیانی ناسییەوە: ئەوەی خوارەوە- شەفە تڕ زەمبۆیە - تەمبەڵ و تەوەزەل، بابەلباب جاشی- عەبەی بزنی- بوو.وردتر سەیری کردن، پێلوەکانی داخست فلاش باگێکی لێدا: ئەوەی سەر شانیشی (دەروێش ڕەحیم) ە. ئەوەش سیخوڕو دەستکەلای بەردەوامی پاشا و دەسەڵاتدارە یەک لە دوای یەکەکان بووە.

مامز لە بیردانی (کارۆ)یدا جوولا، وەک زەروو بە مێشکیەوە نووسا، پرسیاری لە خۆی کرد: دەبێ ئەو پەسیرە مزرە بە تامە چی بە سەر هاتبێ؟

زەروو بە ناو مێشکیدا دەگەڕا و دەیخوراند: لەو شەوەی گفتمان بە یەکدی دا پێکەوە سەر هەڵبگرین و بڕۆین، کە کەل وپەلەکانم لەناو حەسارەکە گواستەوە، ئیبتیسام ڕۆیشت و ئەو شەوە منی بەتەنها لە ناو خانووەکەی خۆی بەجێهێشت، من لەسەر گفتی خۆم بووم لە کات و ساتی خۆیدا چووم ئەو لەوێ نەبوو، من لەو کاتی تووڕەش بووم، بەڵام نەک هەر ئەو، خەڵکی گەڕەکەکەش لە ترسی لافاوی ڕووباری دیجلە هەموو چۆلیان کرد بوو، لە بەختی مامز ئەو شەوە (٢٨) لە سەر (٢٩) ی ئاداری (١٩٥٤) بوو، ئەنجومەنی وەزیرانی عیراقی بانگەوازێکی بۆ دانیشتوانی دەورووبەرو نزیکی ڕووباری دیجلە- لای ڕەسافە -دەرکردبوو بگوازنەوە لای کەرخ، بە تایبەتی دانیشتوانی حەسارو خانووە قوڕەکان. بەڵام دواتر (سەعید قەزاز) ی وەزیری ناوخۆی عیراق گوێی نەدابووە ئەو بڕیارە، بە دانایی و زانایی و لێوەشاوەیی و ئازایەتی خۆی چارەی ئەو لافاوەی کردبوو.

زەروو نەک هەر مێشکی دەخوراند و دەیگەست، ببووە هەڕەشە و مەترسیش: نازانم ئەو قسەی مامز کردی ڕاست بوو یان نا؟ ئەگەر ڕاست بوو ئەدی چی بە سەر هات؟ منداڵەکەی لەبەرە خۆی چواند و کەس نەیزانی؟ یان هەروەکو ئەو دەیگوت کوژرا؟ ئەوە چەندین ساڵە سەرو سۆراغی نییە، ئەو مەنگۆزەی مێردی ناوە ناوە و لە بۆنە خۆش و ناخۆشەکاندا دەبینم خۆم لێدەشارێتەوە.

هەردوو دەماری سارد و گەرمی ناو مێشکی لە ململانێ و شەڕە خەنجەری نێوان گرفتە سەختەکانیدا لە بار یەک ترازا بوون، مێشکی کۆنتاکی کردبوو، لە چەند بستێک زیاتر پێشە خۆی نەدەبینی، ئەو سەرو سامان و نامووسی خۆی پێماڵ نەبوو، ئەو پێی وا بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان پڕووشکی ئەو کوورە دۆزەخییەی هەر بەردەکەوێ و کارەساتێکی نادیار سەری دەرگای لێدەگرێ. سواری بەلەمی

خەیاڵ بوو، بە هەردوو سەوڵەکەی دەستەکانی شەپۆلە تیژڕۆکانی شەق دەکرد زوو بگاتە کەناری ئارامی و بحەسێتەوە.

خۆر- بە لقە دارەکانی شەو- خۆی شۆڕکردبووەوە، لقە دارەکانیش تەکە تەکیان بوو، کارۆ تەنیا دوای نیوەڕۆیان دەرگای دوکانەکەی دەکردەوە، سەیری چوار دەوری خۆی کرد لە ناو دەریای تاریکی نقوم ببوو، هەر زوو دەرگای دوکانەکەی داخست و بەرەوماڵەوە گەڕایەوە.
سەری سەوداسەری هەردووکیان لە سەر یەک سەرین بوون، ئەو شەوە ژنە و پیاوە مانگ و ڕووبار بوون، ڕووبار ئەو شەوە تا بەیانی مانگی لە باوەشی خۆی نا و بەری نەدا، ژنە لە پیاوەی پرسی::کارۆ گیان، دەستت لە چۆکان وەرینایە، کە وات دەبینم هەناوم دەپسێ !!؟
_ چەند ڕۆژێکە بیرۆکەیەک بە مێشکمدا دەخولێتەوە و خەریکە بیخوا، دەمەوێ دەری ببڕم و ڕای تۆ وەربگرم.... کارۆ بە ژنەکەی گوت.
_ ڕای من هی تۆیە چی بە مێشکتدادێ بیکە...ژنە بە پێداگرییەوە بە مێردەکەی گوت.
کارۆ ژنەکەی لاواندەوە: دەڵێن دایکە حەوا لە پەراسووی باوکە ئادەم لە دایکبووە، کەچی بە پێچەوانەی هەموو داستان و ئەفسانە و چیرۆکە سەیرو سەمەرەکان، من لە پەرا سووی تۆ بوویمە ئەم پیاوەی بەرامبەرت.. ژنەش زیاتر کارۆی هەڵنا: هەموو گردۆلکەکانی چاکەی من لە سەر یەکدی دابنێی، ناگەنە بالای بەرزی چیای چاکەیەکی تۆ.. پیاوە سەری بابەتەکەی بۆ ژنەکەی دەرخست: ژنەکە پێویستمان بە هێزێک هەیە بمانپارێزی.. ژنە بەسەر سوڕمانەوە بە پیاوەکەی گوت: هێزمان بۆ چییە؟
_ چۆن هێزمان بۆ چییە؟ دیارە لەبیرت کرد، ئەگەر هێزی من نەبوایە، تۆ جانتای پارەو زێڕەکەت دەست دەکەوتەوە؟
_ نەخێر دەستمان نەدەکەوتەوە.
گفتوگۆیەکە تا دەهات لە نێوانیاندا گەرمتر دەبوو، کارۆ پێی وابوو نەدەبوو سنگ و کوتکی، یان کتوپڕ کرۆکی بابەتەکە باس بکات، بە ژنەکەی گوت: کەواتە من و تۆش پێویستمان بە هێزێک هەیە لە من و تۆ بە هێزتر بێت و بمانپارێزی.. ژنە چەندی دەیکرد و بیری دەکردەوە سەری لەو هێنان و بردنەی

کارۆی دەرنەدەچوو، کەچی لە لاواندنەوەی کارۆی مێردی بەردەوام بوو: هێزی تۆ لای من لە هەموو هێزێک گرنگترو گەورەترو بەهێزترە.
هێزی من بە تەنیا بەشمان ناکات، ئەو هێزەی هەیە لە شەڕە مست و شاپ و چەقۆش گەورەترە و من و تۆ دەرەقەتی نایەین، ژنەکە، ئەگەر زوو سەرو ماڵی خۆمان لەو شارە ڕزگار نەکەین، ئەوانە شەلن کوێرن کەس نابوێرن.. پیاوە بە ژنەی گوت.
_ بچینە کوێ؟ ژنە لە پیاوەی پرسی.
پیاوە بەتەواوی چووە ناو بابەتەکەو بۆ ژنەکەی باس کرد: بچینە شارێک لە شارەکانی کوردستان، لەوێ لەو ناوچە ئازادکراوانە نزیک دەبینەوە کە پێشمەرگەدەیانپارێزن، ئێستا گفتوگۆ لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان و ئەو کودەتاچیانەدا هەیە، دەتوانین بە ئاسانی بگەینە ئەوێ.
ژنە ویستی زەینی پیاوەکەی بە ئاقارێکی دیکە دا ببا: هەناسەم، ژانێک لە بنی مەمکەکانمەوە تاکو سەر موسلدانم دێت و دەچێت و هەراسانی کردووم خەریکە هەناوم بپسێنێ.
لە هەمان کاتدا دەستی بە زگی خۆی داهێنا و ویستی سۆزی پیاوەکەی ڕابکێشێ و ئەو بیرۆکەیەی لەبیر بباتەوە: سەیری (بەبەی زەینەب) بکە، نابینی ئەویش سەیرت دەکا، ئەوە (خەندە) ی تۆیە، خوا کوڕەکەی نەدا، با کچەکەشمان نەڕوا.
_ ئافرەت تۆ بەو نەزیلانە بیرۆکەکەم لە بیر مەبەوە.. کارۆ بە ئیبتیسام ی گوت.
ژنە بە هەموو شێوازێک هەوڵی دەدا مێردەکەی پەشیمان بکاتەوە: لە بیرت نابەمەوە، بەڵام هەڵتەک هەڵتەکی ئەو گەشتە دوورو درێژە زیان بە (خەندە) ی دەگەیەنێ.
فرمێسکەکانی بە سەر هەردوولا ڕوومەتیدا غلۆر بوونەوە و خۆی دواند: تەمەنێکی دوورو درێژم لەم شارە دڵگیرە بە سەر برد، لێی دا ببڕێم بە زگ دەدەم. دواتر دوا جەنگی بەکارهێنا کە دەماری کارۆی گرت و تیایدا دۆڕا: پیاوەکە، دەڵێن ئەو پێشمەرگانە هەر عەرەبێکیان دەستکەوێت دەیکوژن، بۆمیان گێڕایەوە ؛ هێرشیان کردبووە سەر سەربازگەیەکی سوپا، ئەوەی کوشتبوویان و ئەوەی بە دیل بردبوویان تاکیان لێ نەهێشتبوون، یەکێک لەوانیش خزمێکی من بوو.

وەک ئەوەی خوێی بە برینە پڕ کێمەکەی (کارۆ)داکردبێ زووراندیەوە: ژنەکە، پاپۆڕی ڕقەکانت لە بەندەری تکایەکانمدا ببەستەوە، با زیاتر نەڕوا و لە قووڵایی دەریای خەمەکانمدا نقوم نەبێ.. تۆ چۆن بەو چیرۆکە هەڵبەستراوانەی ڕەگەزپەرستان بڕوا دەکەی، ئەدی ئەوە نییە عەرەبە نیشتمان پەروەرەکان لە ژێر فەرمانڕەوایی دەسەلاتدارانی ئێرە هەڵدێن و ڕوو لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان دەکەن، لەوێش بەڕێزەوە وەردەگیرێن و بە شانازییەوە دەبنە پێشمەرگە، ئەو شەڕە شەڕی نێوان کوردو عەرەب نییە، خەباتە دژی زولمی زالمان، تێکۆشانە دژی چەوساندنەوەی نەتەوەو گەلێکی ماف خوراو. خزمەکەی تۆش ئەگەر بەرگری لە مانەوەی ئەو ڕەگەزپەرستانە نەکردبوایە، ئەگەر بە بێ تەقەکردن خۆی بدابوایە دەست، هەولێکمان بۆ دەداو ئازادمان دەکرد.

_ تۆ لێرە و ئەوان لەوێ چۆن دەیانگەیێ !؟ ئیبتیسام بە سەرسوڕمانەوە لە مێردەکەی پرسی.

_ ئەوان هەر لەوێ نین، لە هەموو شوێنێکن، ئەوان فریزن هەرچەندە بیانبڕنەوە چڕتر دەبن.

ئیبتیسام فینگ فینگ گریا: جەرگم ئاگاداری خۆت بە، ماڵوێرانم نەکەی.

ژنە بیری کردەوە: ماڵۆچکەیەکم بە نینۆکان پێکەوە ناوە، با بە پێلەقان نەیڕووخێنم. چووە بن پاڵی و سەری بۆ بەرز کردەوە: خوا بکا لەوێ سەتر بین.

_ تەنها لەوێ سەتر دەبین.. کارۆ بە ئیبتیسام ی گوت.

ئیبتیسام ناچار ڕازی بوو، تەنها مەرجێکی هەبوو، بە کارۆی گوت: ڕازیم بەلام مەرجێکم هەیە.

شاری هەولێرم پێ خۆشە، پێشتر دیومە و متووی ببووم. لەوێ خانوێک بەکرێ دەگرین، تۆش هەوڵ بدە لەناو شارت دابنێن، ئەگەر لەناو شاریان دانەنای، هەوڵ بدە لە گوندێکی نزیکی شارت دابنێن، هەموو ڕۆژێ هات و چۆی بکە.

مشتومڕەکەیان بە دوو ماچ کۆتایی هات. مامۆستا کارۆ لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ڕێکارەکانی گواستنەوەی تەواو کرد، لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی بەغداوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی هەولێر گوازرایەوە، لە بەر تەواونەکردنی سێ ساڵی خزمەتی مامۆستایەتی، لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی هەولێر لە

گوندێکی دوورەدەستیان دانا، بۆیە ئەو دەرفەتە نەما بۆ ئەوەی مەرجەکەی ئیبتیسام ی ژنی جێبەجێ بکا، چونکە گوندەکە دوور بوو، هات و چۆی ڕۆژانە نەدەکرا.بەڵام لەبەر ئەوەی لەشارێک بۆ شارێکی دی گوازرابووەوە، مافی ئەوەی هەبوو دوای چەند ڕۆژێک ئینجا لە قوتابخانە نوێیەکەی دەستبەکاربی، لەسەر پێشنیاری ژنەکەی، ئەو چەند ڕۆژە لە ئوتێلێکی ناو هەولێر مانەوە..
ئەو ڕۆژەی گەیشتبوونە هەولێر، بگرەو بەردەی کاروباری گواستنەوەی مامۆستا کارۆ ماندووی کردبوون، تاکو بەیانی لە ئوتێل نەچوونە دەرەوە. بەمەبەستی پەیدا کردنی خواردن بەیانی چوونە دەرەوە، بە دوای پاکترین و بەرچاوترین چێشتخانەو باشترین خواردندا گەڕان، ئیبتیسام بە گرژینەوە بە کارۆ ی گوت:
پیاوەکە چەندین ساڵە ئەو شارەم نەدیوە زۆر گۆڕاوە.
لەلای حەمامی عەلیاغای بە تەنیشت قەڵاتی هەولێر، کەمێک سووڕانەوەو بەرەو خوارەوە شۆڕبوونەوە، بە بەردەمی پاچەی هەولێر و چێشتخانەی بەیان (الفجر) دا تێپەڕین هیچیان بە دڵ نەبوو، لە دەرگای چایخانەی سەید سەلیم نووسرابوو- خواردنی بەیانیمان هەیە- لەبەردەرگا کارۆ لە شاگردەکەی پرسی:
خواردنی بەیانی چیتان هەیە؟
شاگردەکە یەکە یەکەی خواردنەکانی ژمارد: ماست، پەنیری خۆمانە، ژاژی ناو پیستەی، هێلکەی کورای، هێلکەو ڕوون، قەیماغ، سەرتوو، نانی گەرمی فرنی..
فەرموو فەرموو دانیشن ماری خۆتانە. لەگەڵ فەرموو فەرموو کردنەکە لایەکی چایەخانەیان بۆ چۆل کردن.. ئەوەندە لە بەغدا باسی ماست و ماستاوی هەولێریان کردبوو، ئیبتیسام یەکەم خواردن داوای ماستی کرد: بەقوربان من ماستم دەوێ، تۆش هەرچی داوای دەکەی هاوبەشتم.
زگی خۆیان لەوێ تێرکرد، ئیبتیسام پێشنیاری کرد بەناو شەقام و گەڕەک و کۆڵانەکانی شاردا پیاسەیەک بکەن، خەندەیەکی بۆ کارۆ کردو پێی گوت:
گیانە، تۆ یەکەم جارە ئەم شارە دەبینی و شارەزای نی، کەچی من- گەڕەکە نوێیەکانی لێدەرکەی- هەموو گەڕەکەکانی دی کۆڵان بە کۆڵان شارەزایانم.
بە شەقامی کۆماری (جمهوری) دەستیان پێکرد، ئیبتیسام بە کارۆی گوت:
کەئێمە لێرە بووین ئەم شەقامە دروست نەکرابوو، تەنها کۆڵانێکی تەسک بوو، ئەملاو ئەولای خانووی جوولەکان بوو، ماڵ و سامان و خانووەکانیشیان هەرزان فرۆش کردبوو بەرەو ئیسرائیل کۆچیان دەکرد، بەرەو ئەو دەوڵەتەی بۆیان

دامەزراندبـوون، ئـەو جوولەکانـە هـەر لێـرە نەبـوون، لەزۆربـەی شـارەکانی عیـراق دا هەبـوون، بەتایبەتـی لـە بەغـدا زۆربـوون، خەلکـی ڕۆشـنبیرو سیاسـییان هەبـوو، بەتایبەتـی لـە بـواری بازرگانیـدا سـەرکەوتوو بـوون، مولـک و ماڵـی زۆریـان هەبـوو، بـەڵام ئەوانەیـان پـێ هیـچ نەبـوو، زۆر کەیـف خـۆش بـوون چونکـە دەگەڕانـەوە ئـەو خاکـەی کـە بـە هـی خۆیانیـان دەزانی.شـێوازی خەباتـی ئـەوان لەگـەڵ هـی ئێـوە جیـاوازە، ئێـوە ڕادەپـەڕن شـۆڕش لـە دوای شـۆڕش دەکـەن، زلهێـزەکان لەبەرژەوەنـدی خۆیـان بەکارتـان دەهێنـن، کەچـی ئـەوان بەبـێ ئـەوەی یـەک گوللـەش بتەقێنـن، ئـەوان زلهێـزەکان بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیـان بـەکار دەهێنـن.
ئیبتیسـام سـەیری ئەمـلاو ئـەولای کـرد بـەکارۆی گـوت: ئـەم شـەقامە لـە دوای ڕوخانـی ڕژێمـی پاشـایەتی وسـەردەمی شۆڕشـی (١٤)ی تەمـوز دروسـتکراوە، هـەر بۆیـەش نـاوی لێنـدراوە (شـەقامی کۆمـاری).
هـەر بـەو شـەقامەدا بـەرەو ڕۆژئـاوا ڕۆیشـتن، لەبەرامبـەر گۆڕەپانـی (کۆتـری ئاشـتی) هەڵوەسـتەیەکیان کـرد، ئیبتیسـام سـەرنجی کارۆ ی بـۆ ئەوبـەری ڕاکیشـا: سـەیرکە چەنـد جوانـە، ئـەوە کۆتـری ئاشـتییە (حمامەالسـلام)ە، هێمـای ئاشـتی و پێکـەوە ژیـان، ئـەوەش لـە سـایەی سـەرکردەی خاکـی (عبدالکریـم قاسـم) دروسـتکراوە.
ئیبتیسـام نوقرچەیەکـی لـە کارۆی دا: سـەیرکە ئـەو خەڵکـە چۆن سـەیرمان دەکەن، خۆزگـە عەبایـەک و سەرپۆشـێکم بهێنابوایە.
بـە پەلـە بـەرەو گەرمـاوی (مـۆدە) و مزگەوتـی (شـێخی چۆلـی) ڕۆیشـتن، بـە نـاو گەڕەکـی عەرەبانـدا گـەڕان، لەوێشـەوە بـۆ نـاو بـازاڕی گـەورە، بەنـاو سـەفارچی و فافـۆن فـرۆش و وردەواڵەفرۆشـەکاندا گەیشـتنە کۆلانـی کورتـان درووان، ژنـە هەڵوەسـتەیەکی کـرد: گیانـە ئێرەشـت نەدیتییـە؟
کارۆ چـاوی بەمـلاو بـەولادا گێـڕا، لـە کورتانـان زیاتـری نەدیـت، بـە گرژینـەوە بـە ژنـەی گـوت: نەخێـر نەمدیـوە، بـەڵام باوکـم باسـی ئێـرەی دەکـرد.
مانـدوو بـوون بـەرەو ئوتێـل گەڕانـەوە، ئـەو شـەوەش لەوێ مانـەوە، بەڵام ئیبتیسـام حـەزی دەکـرد بەیانـی سـەردانی ماڵـی باوکـی کارۆ بکـەن لـە گونـدی: پیاوەکـە، تـۆ ئـاگات لـە ماڵـی باوکـت هەیـە، کامیـان مـاوە کامیـان خوانەخواسـتە نەمـاوە، کامیـان زینـدووە کامیـان- چـاوی شـەیتانی کۆرەبـی- مـردووە. ئیبتیسـام هـەم کارۆی دەترسـاندو هـەم هانـی دەدا: تـۆ هـەر دەوت لێکدەکـردەوە باسـی خاڵـت

دەکرد و دەتگوت: خاڵم ئەوهاو ئیوها بوو، ئازا بوو گوێی شێری دەردەهێنا، نینۆکیان دەردەهێنا منەتی پێنەبوو.. لەو ڕۆژە ڕەشەی کودەتاچییەکان ڕاوی ئەو مارکسی و شیوعیانە دەکەن، نابی بزانی چی بەسەرهاتووە.

_ ماوەیەکە ئاگام لێیان نییە، پێشتر خاڵم ناوە ناوە دەهاتە بەغداو سەری لێدەدام، دەنگ و باسی ئەوانیشی بۆ دەهینام، کەچی ئەویش ماوەیەکە نەمبینیوە، لەویش زیاتر کەس نەبووە لێی بپرسم، خۆشت ئاگات لێیە ماوەیەکە ڕووداوی سەیر سەیر بەرۆکم دەگرن و نەپرژایمە سەر هەواڵ پرسینی ئەوان.

کارۆ ئاگاداری ئەوە بوو، هەروەها دەیزانی پاسەدارەکانی، یان قەمەرەکانی گوندی چ کاتێک- لە گوندەوە بەرەو شار- بەڕێدەکەون و، چ کاتێکیش لە شارەوە بەرەو گوند دەگەڕێنەوە.

بەیانی زوو کارۆ لە خەو هەستا، ناوچەوانی ژنەکەی ماچکرد: ئافرەت پێشنیارەکەت بەجێیە، سوپاس کەپەرۆشی خاڵم و ماڵی باوکمی، من ئێستا دەڕۆم بەدوای ئەو گەراجەدا دەگەڕێم کە ئوتومبێلی گوندەکەی ئێمەی لێ ڕادەوەستی، بۆ ئەوەی بزانم کەی دەگەڕێتەوە گوندەکەمان.

_ منیش لەگەڵت دێم تۆ شارەزا نی........ ئیبتیسام گوتی.

_ پێویست بەتۆ ناکا، خۆ شاری واق واقێ نییە دەیدۆزمەوە.

کارۆ بە پرسیاران گەیشتە گەراجی تەنەکەی، پیاوێکی ڕەنگ گەنمی سیسەڵەی مەیلەو درێژ، کورتەک و شەرواڵێکی بۆرکەڵەی بێ پشدێنی لەبەردابوو، جەمەدانییەکی بۆرکەڵەشی لەسەری خۆی ئاڵاندبوو، کارۆ سڵاوی لێکرد: برا زەحمەت نەبی ناوت چییە؟

_ لۆ دەمکرێ، ناوی منت لۆ چییە؟ پیاوەکە هەر بە فشە وای گوت.

کارۆ بەو وەڵامە تووڕە بوو، هەر بە تووڕەییش پێی گوت: خۆ تۆ کەرو بارگین نی بتکرم، من بە پیاوم زانی ئەو پرسیارەم لێکردی..

لەیەکدی ڕوبوون و تێکئالان، چەند پیاوێکی دی لێکیان کردنەوە و لە یەکدییان دوور خستنەوە، پیاوێکیان بە کارۆ ی گوت: برا ئەوە (شلەحمەد)ە، چۆن نایناسی پیاوێکی سوحبەتچییە، پاسەوانی ئەم گەراجەیە، لێی تووڕە مەبە، چ پرسیاریشت هەیە بە منی بڵێ با وەڵامت بدەمەوە.

کارۆ، دەربارەی ئوتومبێلی گوندەکەی خۆیان، زانیاری تەواوی لەو پیاوەی

وەرگرت، لە کاتێکدا دەیویست بۆ ئەوبەری شەقامەکە بپەڕێتەوە، ئەو پاسەی بۆیان باسکردبوو بە پڕی چووە ناو گەراجەکە، نەفەرەکانی ناو پاسەکە یەکە یەکە دادەبەزین، ئەویش یەکە یەکەیانی دابووە بەر نەشتەری چاوەکانی، بۆ ئەوەی خزمێک، ناسیاوێک لە ناویاندا بدۆزێتەوە، لە پڕ واقی وڕما، سەری سوڕما: ئەوە باوکمە، ئەوەی دواوەشی دایکمە و سەرتاپای ڕەشە، دڵی لەرزی، ناخی تەزی، بە نهێنی پاڕایەوە: خودایە هیچی خراپ ڕووی نەدابی.
بەرەو گەراجەکە بایدایەوە، هەرسێکیان یەکدییان دیت، شاگەشکە بوون.. دایکی لە خۆشییان زمانی گیرابوو، نوتقی لێ بڕابوو، باوەشی تێوەرینابوو بەس فرمێسکی دەباراند.. لەگەڵ باوکیشی یەکدییان ماچ کرد، لەبەر دەمی گەراجەکە هەرسێکیان پێکەوە لەسەر چینچکان دانیشتن، هەواڵی یەکدییان پرسی، پرسیارەکان بە لێشاو بوون، وەڵامەکانیش درێژ بوون، بۆیە کارۆ پێی گوتن: لێرە و بەو جۆرە دانیشتنە هەموو قسەیەک ناکرێ، قسەمان لەگەڵ یەکدی زۆرە پێویستە بچینە شوێنێکی بێ دەنگە دەنگ دابنیشین و ئەو چەندین ساڵە دابڕانەی خۆمان بۆ یەکدی بگێڕینەوە، لەوێ هەموو بەسەرهاتی خۆمتان بۆ باس دەکەم، ئێوەش چیتان هەیە بۆم باس بکەن.
کارۆ بێ ئەوەی هیچ زانیاریەکی نێوان خۆی و ئیبتیسام بدرکێنی، بە دەست لە ملانێ و ماچکردنی یەکدی، دایک و باوکی بەرەو ئوتێلەکە بردن.لە کاتی بەسەر کەوتن بۆ ناو ئوتێلەکە باوکی لێی پرسی: کوڕم دەچینە کێندەرێ؟
_ دەچینە ناو ئەم ئوتێلە، من لێرە دەخەوم، دەمەوێ هەم ژوورەکەی من ببینن و هەم بۆ خۆمان بە ئارامی قسەکانی خۆمان بکەین.
گەیشتنە بەر دەرگای ئەو ژوورەی کارۆ لێی دەخەوت، کارۆ لە دەرگای دا، لە ژوورەوە ڕا دەنگی ئافرەتێک هات: کێیە؟
_ (کارۆ) م بیکەوە.
ئیبتیسام دەرگاکەی کردەوە، شلەژا، ترپە ترپی دڵی بەرز بووەوە، خوێن لە دەمارەکانی فڕکەفڕکیان تێکەوت، ئەوکی گیرا، نەیزانی و نەیتوانی لە بەرامبەر ژن و پیاوێکی بەتەمەنی نەناسراو هیچ بڵێ. سەیری پیاوە بە تەمەنەکەی کرد، ناخی خۆی دواند: پیاوێکی کورکن، سمێڵ و ڕدێنێکی بۆری سپی تێکەڵ و پێکەڵ، کراسێکی بە بەن چنراوی سۆلانی لە پێ،کورتەک و شەرواڵەکەی هەر یەکەیان و لە ڕەنگێک، پشدێنێکی بۆرکەی بێ زەوق، لەلاوازییەوە بووەتە

سیرمەو هەناوی بە پشتیەوە نوساوە، بەڵام بەجەرگی و مەردی و چاو نەترسی لە چاوەکانیدا دەبریسکێنەوە و کەسایەتییەکی بە هێزی پێدەبەخشن.
چاوی لەسەر پیاوەکە لابردو سەیری ژنە پیرەکەی کرد، ئەویشی هەر بە مەزەندە بەرجەستە کرد: تەنیا ڕوخساری لێدەرچێت، ئەگەرنا سەرتاپای جلەکانی ڕەش، هەتا بسک و کەزی و پرچی بەتەواوی لە ژێر پەردەیەکی ڕەش شاردۆتەوە، شروشەپرێوی پێوە دیارە، بەڵام بەو شێرە ژنانە دەچێت کە هیچیان لە پیاوان کەمتر نییە.
بارانی چل عەسرە چۆن دەبارێ و هەندێ جار سەر بە کڵاوەیەو دارو بەرد پێکەوە دەبا، بارانی ئەندێشەی دایک و باوکی (کارۆ) ش ئەوانی کردبووە لێمشت و فرێی دابوونە ناو دەریای بیرکردنەوە، هەردووکیان بیریان دەکردەوە:
ئەو ژنە سۆرمسە تەبەش پانە قەدو باڵا ڕێکە دەبێ کێ بێ؟
کارۆ زانی حەپەساوییەک لە هەردوولادا هەیە، هەوڵیدا بە هۆش خۆیان بهێنێتەوە، سەرەتا ڕووی لە دایک و باوکی کرد و دەستی بۆ ئیبتیسام درێژکرد: ئەوەی لەبەر دەمتان وەستاوە ژنمە، هاوسەرمە، هاوبەشی ژیانمە، ناوی (ئیبتیسام) ە.. لە هەمان کاتدا ڕووی خۆی بۆ لای ئیبتیسام وەرگێڕا و بە دەستی ئاماژەی بۆ دایک و باوکی کرد: ژنەکە، ئەوانەی لەبەر دەمت وەستاون، دایک و باوکمن.
دایکی کە ئەوەی بیست بووە خولخلۆکە، بە دەوری (ئیبتیسام) دا سووڕایەوەو هەموو لایەکی ماچکرد، باوەشی بۆ کردەوە، لە جیاتی لە خۆشییان پێبکەنی، ژنەی ڕادەکوشی و دەگریا.
لەو چرکە ساتەدا ئیبتیسام دایکی هاتەوە بیر، کە چۆن ئەوی لە باوەش دەگرت و دەیکوشی و بۆ مامۆستا (عەلی) دەگریا.. ئەویش سۆزو خۆشەویستی بۆ دایکی هانیدا و گریا، گریاو بە تەواوی خۆی بە باوەش و سینگوڕکی دایکی (کارۆ) ەوە نوساند و پڕ بە گەرووی هاواری کرد: دایکە.
کارۆ داینیشاندن، خۆی خستە نێوان هەردوکیان، هێوری کردنەوە، بەڵام دایکی فرمێسک لە چاوی گیر نەدەبوو گوڕ گوڕ دەهاتە خوارەوە، کارۆ سەری دایکی ماچکرد و پێی گوت: دایە ئەوە چی بووە؟ لە جیاتی لە خۆشییان پێبکەنی فرمێسک دەبارێنی؟
_ کوڕم نازانی ئەمن و بابت لۆ هاتینە شاری؟

_ نەوەللا لە کوێ بزانم.. کارۆ بە دایکی گوت.
_ دوێنێ ئێواریێ خەبەریان داینێ، گۆتیان لە بەغدایێ هەرایە، دەعبا ئینقلابیان کردییە خەرکی دەخۆن، ئەوەی کوردە، ئەوەی ناوی کوردی لێیە، ئەوەی جلکی کوردی لەبەرە دەیگرن و دەیدەنە بەر چەپۆک و قەمپاران و کەوری دەکەن. کە ئەو خەبەرەمان بیست ئەمن و بابت شێت و هار بووین، بە دەشتێ دەکەتین و خەرک دەیانهێنانەوە، بەرەو شاری ڕێمان دەگرتە بەر، دیسان دەیانگێڕاینەوە، ئەو شەوە هەر کوو بوو بەسترایەوە، بەس چشتاقمان خەو نەچووە چاوەکانمان، هەر پێروی چاوەکانم دەکەتنە سەر یەکدی، دەعبام لۆ دەهاتن و دەیان ترساندم.ئەوە لە دوێنێوە هەر نوێژان دەکەم و لوورە لوورمە و دوعایان دەکەم، مەمنونی خوای خۆمم بە هانامەوە هات، ئەتوی لۆ هێنامەوە و بە پێی خۆت هاتیەوە بەر دەستم.
دایکی دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە: خودایە هەزار جار مەمنونتم.
دایکی سەری کارۆی هێنایە باوەشی خۆی و ماچی کرد: کوڕی خۆم، لەوەتی ئەتو بێ سەرو شوێن ڕۆیشتی و بزر بووی، چما ئەمن لوورە لوورم برایە، هەر دەنووزێمەوە و دەکڕووزێمەوە و وەکی دۆنی سەر ئاگری دەقرچێمەوە، هەر دەیانگۆ لە بەغدایێ یە، دەمپرسی بەغدا لە کێیە؟ دەیانگۆ زۆر دوورە.. دەناورامەوە، دەنووزامەوە: خودایە کوڕی من، جەرگی من لۆ کەتە ئەو شارە دوورەی، لۆ کەتە بەحریێ؟.. جارەکی، یان سارەکی گۆتیان لافاو لە بەغدایێ هەستایە، دیسان شێت و هار بووم، باش بوو ئەو وەختە خارت چووبوە بەغدایێ و سەردانی کردبووی و چاوی پێت کەتبوو، کە هاتەوە دری داینەوە و هێور بووینەوە.
کارۆ، کە باسی خاڵی کرا، دڵی لەرزی: دایە گیان، خاڵم ماوەیەکە دیار نییە، بۆچی لە گەڵ ئێوە نییە؟
دایکی لێوی خۆی کرۆژت، زمانی خۆی گەست: چەندین سارە کوڕەکەم لێمان دابڕایە، تازە بەتازە چاومان بە یێکدی کەتیتەوە کوو دەبێ خەمی بدەمێ.. ڕووداوی براکەی خۆی، واتە خاڵی کارۆی کوڕی، دیزە بە دەرخۆنە کرد: کوڕم، خارت لە بۆ هەندە ئیشی خۆی لەو ڕۆژانە سەفەری کردییە، ئاگای لەو هاتنەی مە نەبووە، ئەگەر نا ئەویش هەر بە غار دەهات.
_ دایە، ئەدی ئەو هەموو جلە ڕەشانەی لەبەرت، ئەو هەموو بەردەوام گریانەت

چییە؟ کارۆ بە دایکی گوت.
_ هەمووی لە خەفەتی بێ سەرو شوونی تووە.. دایکی کارۆ وای گوت.
کارۆ زۆر بە وردی ڕوخساری دایکی خوێندەوە، دڵنیا بوو کارەساتێک لە ناو چاوەکانی دایکی دا حەشار دراوە، هەستایەوە شانی باوکی ماچکرد: باوکە، تۆ هەمیشە هەق و ڕەق بووی، لە ژیانی خۆتدا هیچ شتێکت لێمان نەشاردۆتەوە، هەر قسەیەک ئەگەر بۆ خۆشت خراپ بوویێ، بە بێ پەردە لە دڵی خۆت بەندت نەکردووە و بە ئاشکرا دەرت بڕیوە، تۆو خودا خاڵم چی بە سەرهاتووە؟
باوکی لایەکی پشتدێنەکەی کردەوە و بە لچکێکی پشتدێنەکەی فرمێسکەکانی خۆی سڕیەوە و بە ناچاری گوتی: کوڕم، خارت زیاتر لە مانگێکە بێ سەرو شوونە.
_ بێ سەرو شوێنە واتە چی؟ کارۆ لە باوکی پرسی.
_ کوڕم، خارت لە کن ئەو حوکمەتە پیسە و ئەوانی پێشتریش، ناوی بە خراپ هاتییە، چەندین جار گرتیان لە حەپسێیان ڕاکرد، ئازاریان دا، نینۆکیان دەرهینا، چما چ جێی قالبی مایە هەمووی شوو شوو کرایە، داخ کرایە، هەر وازی نەینا هەتا سەری خۆی بەو ئەنجامەی گەیاند، خۆشی فەوتاندو ئەمەشی وا لێکرد دەست لە چۆکان وەرینین و هەر خەمی لێبخۆین، پیاوی فەقیر چی پێدەکرێ، هەر ئەوەندەی پێدەکرێ، بە خەمانیش هیچ ناکرێ. کەسەک نییە سۆراغەکیشمان بداتێ، خوا بکا ئەو جارەش بە دەر بکەویتەوە، بەس زەحمەتە لە دەست ئەو گورگانە قوتار بی، برێم چی بە تەمای خوای، هەر ئەوەندەمان لە دەست دێ.
باوکی داوای هەندێ ئاوی کرد، ئاویان بۆ هێنا و تێنوێتی خۆی شکاند، سەیری (ئیبتیسام) ی بووکی کرد: کیژم، ئەنگۆ لێکدی مارە کرانە؟ ئەگەر نەکرانە باتووشی گوناحان نەبن، هەتا زووە مەلایەک و دوو شایەدان بینین و بە شەرعی خواو پێغەمبەران لە یێکدیتان مارە بکەین.
کارۆ و ئیبتیسام هەردووکیان پێکەوە وەڵامیان دایەوە: بەڵێ، ئەوە چەندین ساڵە بە شەرعی خواو پێغەمبەران ژن و مێردی یەکدین.
_ باشە ئەوە ئەمن و داکت هیچمان- لە بارەی ئەو ژن و مێردایەتییە — نەزانی، قەیدی ناکا تازە کار لە کار ترازایە و ئیشەکە بووە، ئەدی داک و بابی، یان کەس و کاری ئەو ژنەت، بەو کەین و بەینەی دەزانن؟ باوکی لە کارۆی پرسی.

کارۆ و ئیبتیسام سەیری یەکدییان کرد، دیسان وەک هەموو جاران ئیبتیسام دەستپێشخەر بوو، خۆی خستە باوەشی خەسووی و وەڵامی خەزووری دایەوە: ئێوە تەنها خەزوورو خەسووی من نین، دایک و باوکیشمن، دایک و باوکم گۆڕیان پڕ نوور بێت و خودا بە ڕەحمی خۆی ڕەحمیان پێبکا، باوکم دوو ژنی هەبوو، دایکی من ژنە گەورەی بوو، من برایەک و خوشکێکم هەبوو، هەردووکیان لە من گەورەتر بوون. دوای مردنی باوکم، براکەم بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان لە ناو زونگاوەکاندا خەریکی کاسبی ڕاوە ماسی بوو، ڕۆژێک کۆرە وەیبابێک پێوەیداو براکەمی کوشت. خوشکەکەشم خەنی خەنی بەدڵی خۆی مێردی کرد، ئەویش لە یەکەم زگی لەسەر منداڵی چووزڕ دایکەکەشم، خودا تەمەنی درێژ بکا، ئەو لە ژیاندا ماوە و دوو کچیشی هەیە، کچەکان هەردووکیان بە ویستی خۆیان و ئازادانە، بەر بەختی خۆیان هەڵبژاردووە، نە ئەوان پەیوەندییان بە منەوە هەیە، نە منیش خۆم دەخەمە ناو کارو بارەکانی ئەوان.

_ کوڕم، دیارە ژنەکەت کوردی خۆمانە نییە؟ باوکی کارۆ لە کارۆ ی پرسی.

_ ئەو لە بەغدا لە دایک بووە، خەڵکی ئەو شارەش بە عەرەبی قسە دەکەن، بۆیە کوردییەکەی باش نییە.. کارۆ بە باوکی گوت.

_ ئافەرین کوڕەکەم، ئەوە درم ئاوی خواردەوە، دیارە بەتەواوی سەرو کلکی ئیشەکەی خۆتان لێکدی گرێ دایە، بەس وەرە پێم بڵێ ئەو هەموو سارەی لەمە مانان دابڕای، کوو لە برسان نەمردی؟ ئەتو فێراری عەسکەری بووی کوو حوکمەت نەیگرتی؟ کوو لەو غەریبایەتییەی نەیان کوشتی؟ کوو ئەو ژنە نازدارەت دیتەوە و بە چ درۆیەک هەرت خەرەتاند؟ بە مارو مورکت؟ بە زەوی و زارت؟ بە جۆخین و ڕەوسەی گەنمت؟ بە مێگەلە مەڕو بزنت؟ بەڕاستی پێم بڵێ بە چ لە خشتەت برد و سەوداسەرت کرد؟

کارۆ دەستی بۆ ناوچەوانی خۆی برد و بە باوکی گوت: سەبارەت بە ژنەکەم و هەموو ئەوانەی باست کردن، تەنها بەو ناوچەوانەم گەیشتمە ئەم ڕۆژەی کە ئێستا لە ئاغاکەی گوندەکەی خۆمان ئاغاترم.

_ ئێ باشە کوڕم دڵم تەقی، بزانم کوو بوویە ئەو ئاغایە؟ باوکی بە کارۆی کوڕی گوت.

کارۆ هەر لەو ڕۆژەی کە گوندەکەی خۆیانی بەجێهێشت، تاکو ئەو ڕۆژەی لە

بەغداوە گەیشتنە هەولێر- کورد گوتەنی- هەر لە هووردی هەتا درشتی، یان هەر لە سیری هەتا پیازی بۆ دایک و باوکی باسکرد، تەنها ئەوەی تایبەت بوو بە مامز بواردی. لە کۆتاییشدا دیسان دەستی بۆ ناوچەوانی خۆی بردو گوتی: تەنها ئەم ناوچەوانەم منی گەیاندە ئەم ڕۆژە و کەچە عەرەبانەیەکیش بووە هۆکار.
دایکی کە ئەو سەربردەیەی ژیانی کوڕەکەی بیست، هەستایەوە ناوچەوانی ماچ کرد: بە قوربانی ئەو ناوچەوانە بە خێرەت بم، بە قوربانی عارەبانەکەت بم، بە قوربانی ئەو ژنە جوانەت بم، لە سەر سەری خۆمی دادەنێم.
باوەشی بۆ ئیبتیسام کردەوە: کچێ هەی جەرگەکەم ئەتوو یێکەکی لە کیژەکانم، بگرە زیاتریش، وەرە هەمێزم با بۆنت بکەم، با بتخۆم.
هەموویان یەکدییان لە باوەشێ گرت، یەکدییان ماچ کرد، سوپاسی خوایان کرد کە بە یەکدی شادی کردنەوە.
لە بڵندگۆی مزگەوتی خانەقا بانگدەرێک گەرووی خۆی خۆشدەکرد، چەند جارێک بڵندگۆیەکە خشە خش و قرە قرو تەقە تەقی لێوە هات، بانگدەری مزگەوتەکە بە بەرزی بانگی نیوەڕۆی دا.. هەر چواریان نقەیان بڕا، هەستیان لە بانگەکە ڕاگرت، تەنها لێویان بە بێ دەنگی دەجولا، هیچ کامیان نەیدەزانی ئەوی دی لە دڵی خۆیدا چی دەڵێ. دوای تەواوبوونی بانگەکە باوکی کارۆ بە دەنگێکی بەرز گوتی: خودایە لۆ خاتری ئەو بانگ و سەراواتە بە ڕوحمی خۆت ڕوحم بە هەموو بوسرمانەکی ڕاست بکەی. خودایە ئەمەش عەبدی تووینە و بێ دەستەراتین، ئەگەر گوناحمان هەیە لێمان خۆش بە. خودایە ئەو سەوسوارانەی بەناو گوندو شارەکانمان کەتینە و ڕاوڕووتی دەکەن، فەرهوودی دەکەن، لە سەر مارو حاری خۆمان دەریەدەرمان دەکەن، بە هێزو توانای خۆت لەناویان ببە.
هەموو پێکەوە گوتیان: ئامییییییین.
لە ناو ژووری نوستنەکە دا ئاودەست و گەرماو هەبوو، ئیبتیسام ڕێنوێنی خەزوورو خەسووی کرد و ڕێزی لێنان: دایە، بابە ئەوە ئاودەست و گەرماوە، بڕۆن خۆتان بشۆن، دەستنوێژێ هەڵگرن. هەر خۆشی دەرگای ئاودەست و گەرماوەکەی بۆ کردنەوە و لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ڕێنمایی کردن. لە هەمان کاتدا کارۆ بەرەو ژووری لێپرسراوی کاروباری ئوتێلەکە ڕۆیشت، داوای لێکرد لە

باشترین چێشتخانە باشترین خواردنیان بۆ ڕابسپێری.
دایکی کارۆ چرکە بە چرکە چاوی لەسەر ئیبتیسام بوو، هەر بە مەزەندە دەیپێوا، قەدوباڵای چەند درێژە، چەند پانە. دەیکێشا، چەند گۆشتی پێوەیە، گۆشتەکەی نەرمکە، چەندی بەزە، چەندی ئێسکە. لێی ورد دەبووەوە، چاوی کاڵە یان ڕەش، لووتی پانە یان قەرانگی، دەوی گەورەیە یان فستقی، لێوی لچنە یان قەیتانی، پاشپانی خڕو پڕە یان تاژیانی. پشتی پانە، دونگی هەیە، سینگی پڕە، گەردەن زەردە، ملی درێژە...
لە کاتێکدا دەیپێوا و دەیکێشا و هیچ کەم و کورتییەکی لێ نەدیتەوە، سەرنجی دایە زگی: ئای خودایە بە قوربانت بم، خۆ بووکەکەم ئاوسە.هەرچەندە دڵنیا بوو، بەڵام ویستی زیاتر خۆی دڵنیا بکات، سەری بردە بن گوێی ئیبتیسام:
کیژم ئەتوو بارت گرانە لە جێی خۆت دانیشە، زۆر جوولە جوولێ مەکە.
_ بۆ دایە گیان؟ ئیبتیسام تێی گەیشت، بەڵام ویستی ڕوونکردنەوەی زیاتر ببیستی.
_ کیژم خۆت دیتییە هەرپەندمای، ئەوە چییە مندار نییە لە زگتدا؟
_ بەڵێ دایە، دووگیانم لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆمم.
_ ئای گێی شەیتانی کەڕبی، چاوی حەسوودان کۆرە بی، ئەوەی کەیفی پێ نایێ بتەقی.
_ دایە گیان من بارم زۆر گرانە، کارۆ ش دەیەوێ بمباتە گوندی.... ئیبتیسام بە خەسووی گوت.
_ گوندی خۆمان؟ خەسووی وای گوت.
_ نەخێر گوندێکی زۆر دوورە لەناو چیای..... ئیبتیسام گوتی.
_ لۆ دەتباتە ئەو گوندە دوورەی؟ خەسوو فەرمووی.
_ ئەدی مامۆستا نییە، بۆ ئەو گوندە دوورەی گوازرایتەوە.
_ ئەی بە قوربانی ئەو مامۆستایەی بم، بە قوربانی ژنەکەشی بم.. خەسوو گوتی.
_ خوا نەکا دایە، وامەڵێ.
_ کیژم نابی بتبا، دەبی ئەتوو لەبەر چاوی خۆم بی.. خەسوو گوتی.
کە شەو داهات- بۆ گفتوگۆ دەربارەی بابەتی چوونی یان نەچوونی ئیبتیسام بۆ گوندەکە- هەر چواریان پێکەوە دانیشتن. گفتوگۆ زۆری کێشا، مشتومڕی

بە دوادا هات. هێور بوونەوە و لە ئەنجامدا گەیشتنە ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی، ئەو ماوەیەی تاکو ئیبتیسام ڕزگار دەبێت و منداڵی دەبێت خانوێک لە شەقڵاوە بە کرێ بگرن و دایکی کارۆ لە لای بمێنێتەوە، بەو پێیەی هەولێر دوورترە و شەقڵاوە لە قوتابخانەی گوندەکە نزیکترە، کارۆ دەتوانی ڕۆژانی پێنجشەم و هەینی سەردانیان بکات، باوکی کارۆ ش بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆیان، ئەو هەواڵە کتوپڕیە، ئەو مزگێنیە خۆشە بە خوشک و براکانی کارۆ بگەیەنی.

بۆ بەیانی ئەو قسانە و، ئەو تەگبیرانە و، ئەو بڕیارانەی دابوویان هەموویان جێبەجێکرد، باوکی کارۆ گەڕایەوە گوندەکەی خۆیان، ئەوانیش هەرسێکیان چوونە شەقڵاوە. شەقڵاوە نە شەقڵاوەی جاران، ئەو ڕۆژە حەرەس قەومییەکان و سوپاو دائیرەی ئەمن کون بە کون و ماڵ بە ماڵ وەک گورگی هار بە دوای شیوعیەکاندا دەگەڕان و ئەوەی ئەو بۆنەی لێ بهاتایە دەیان گرت و شوێنبزریان دەکرد، بێگومان سیخوڕو بەکرێگیراوەکانی ناوەخۆ چاوساغییان بۆ دەکرد.

کارۆ لە ناو ئەو لافاوەی ڕاوەدونان و گرتنەدا، پێیەک لە پێش و یەک لە پاش نەیدەزانی چۆن هەڵسوکەوت بکا، دایکی و (ئیبتیسام)یش هەمان دیمەنیان بینی، لەلایەک ماندوو بوون و لەلایەکیش برسی، کارۆ بە هەردووکیانی گوت: دەبا بچین لە چێشتخانەیەک زگی خۆمان تێر بکەین، دواتریش خوا کەریمە.

کەچی دایکی کارۆ بە کوڕەکەی گوت: کوڕم، هەزار جارخوا کەریمە، بەس لەو غارە غارەی تاڕی و کێروشکان کوو نانمان بە زگی دەکەوی.

ئیبتیسام یش هەر لەسەرەتاوە پێی خۆش بوو لە هەولێر بمێننەوە، لایەنگیری خەسووی کرد: با بگەڕێینەوە جێی خۆمان، هەمان ئوتێل، هەرچۆنێک بێ هەولێر شارەکی گەورەیە لەوێ لە پێش چاوان بزر دەبین.

کارۆ پێشنیارەکەی دایکی و ئیبتیسام ی پێ پەسند بوو، بەڵام زۆربرسی بوو، لە جیاتی یەکسەر بگەڕێنەوە لایاندایە چێشتخانەیەکی ئەو ناوە، دوای چەند خولەکێک کۆمەڵێک حەرەس قەومی هەڵیان کوتایە ناو چێشتخانەکە، داوای ناسنامەیان لە هەموو خەڵکەکە کرد، بە تایبەتیش ئەوانەی گومانیان لێدەکردن، کە سەیری ناسنامەی (ئیبتیسام) یان کرد گومانیان لێکرد.

هەرچەندە ئیبتیسام و کارۆ گرێبەستی هاوسەرگیرییان هەبوو، بەڵام لە گەڵ خۆیان هەڵیان نەگرتبوو، ئەوان بە مەزەندەی خۆیان وایان دانابوو لە

شەقلاوە خانوێک دابین دەکەن و دەگەڕێنەوە هەولێر، بۆیە کەلوپەلەکانیان لە ئوتێل بەجێهێشتبوو.حەرس قەومییەکانیش بە مەزەندەی خۆیان، گومانیان لەوە هەبوو کە ئیبتیسام هاوسەری یەکێک لە لێپرسراوە شیوعیەکانەو ئەوانە دەیانەوێ ڕزگاری بکەن. هەرسێکیان قۆڵبەست کردن و بەرەو دائیرەی ئەمنی شەقلاوە ڕاپێچیان کردن، لەوێشەوە ڕەوانەی دائیرەی سەرەکی هەولێریان کردن، کە گەیشتنە ئەوێ لێپرسراوی فەرمانگەکە سەری بەرز کردەوەو چاوی بە (ئیبتیسام) کەوت بە توندی لێی خوڕی: خەلکی کوێی؟

_ بەغدا.. ئیبتیسام وەڵامی دایەوە.

_ کام گەڕەک؟....بەڕێوەبەرەکە پرسی.

ئیبتیسام ئەدرێسی خۆی بە تەواوی درکاند، بەڕێوەبەر وەکو گورگی برسی سەیری سەرو بنی ئیبتیسام ی کرد: بۆ بەندکراوی؟

_ ئێمەیان بەند کردووە، وا دەزانن من هاوسەری یەکێک لە شیوعیەکانم ئەوانە ڕزگارم دەکەن.

_ ئەوانە کێن؟.. بەڕێوەبەر پرسی.

_ پیاوەکە مامۆستایەو هاوسەرمە، ژنەکەش خەسوومە.. ئیبتیسام پێی گوت.

بەڕێوەبەر بە خەندەیەکی حیزانە پێی گوت: کوا بەڵگەت؟

_ بەڵگەم لەناو جانتامە لە ئوتێل....ئیبتیسام بە مەردانە وەڵامی دایەوە.

بەڕێوەبەر دوو پیاوی ئەمنی بەگەڵ (کارۆ) و دایکی دا بۆ ئەوەی بەڵگەمامەکە بێنن، (ئیبتیسام) یشی لای خۆی هێشتەوە، لەو ماوەیەی هەتا ئەوان گەڕانەوە بە هەموو هێزیەوە هەوڵی دەدا دەستەمۆی بکا، بەلام ئیبتیسام لەو ئافرەتە ساویلکانە نەبوو ئەو بتوانی لەخشتەی ببا. دوای ئەوەی بەڵگەی هاوسەرگیرییەکەیان هێنا، بەڕێوەبەر تەنها ئەوەی بۆ مایەوە، کارتێکی پێناسەکردنی خۆی لەسەر مێزەکەی ڕاکێشا و بۆ (ئیبتیسام) ی ڕاگرت: ئەوە ژمارەی تەلەفۆنی تایبەتیم هەر گرفتێکت هەبوو پەیوەندیم پێوە بکە.

هەرکە لە فەرمانگەکە دەرچوون، وردە وردە- بەرەو ڕۆژهەلات تاکو گەیشتنە لای منارەی چۆلی- بە پیادەیی ڕۆیشتن. بەهار بوو، لەوێش هەندێ قانە گیای سەوز هەبوو، لە سەر پارچەیەک لەو گیایانەی نزیک لە وێستگەی شەمەندەفەر دانیشتن، لەو ناوەش تازە تاک تاکە خانوو دروست دەکرا، لە خانووەکانی فەرمانبەرانی وێستگەکە زیاتری لێ نەبوو، گۆڕی پیاو چاکێکیش لە نزیکیانەوە

بوو، خەلكانێک دەهاتن بەردەکانی سەر زگیان ماچ دەکردو، پارچەیەک لەو پەرۆ سەوزەیان لێدەکردەوە کە لە پشت سەری گۆڕەکە بەدارێکەوە کرابوو، ناوە ناوە ئافرەتێک لە تەنیشت گۆڕەکە پاڵدەکەوت و نازانم خۆی غلۆر دەکردەوە، یان ئەو غلۆری دەکردەوە، ئافرەتەکە بە دەنگێکی نرم دەیگوت: بابە گوڕ گوڕ بە گوڕ هاتم، بۆ کوڕ هاتم. هی واش هەبوو دەیگوت: بابە گوڕگوڕ، هاتم بەگوڕ، هاتم بۆکوڕ.

هەرسێکیان، هەریەکەو بە لایەکدا بیری دەکردەوە، بیری پەرتەوازەبووی خۆیان کۆ دەکردەوە. ئەو ڕۆژە چوارشەممە بوو، کچ و کوڕ، ژن و پیاو، یەک یەک و دوو دوو، کۆمەڵ کۆمەڵ و، ماڵی واش هەبوو بە خاوخێزانەوە بەرەو دارستانەکەی مەحەتە دەچوون، ئافرەتەکان بە جۆرێک خۆیان ڕازاندبووەوە واتدەزانی بۆ شایی حەوت ڕۆژو حەوت شەوە دەچن. ئیبتیسام بیری پەرتەوازەبووی بەرەو دواوە گەڕایەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: خۆزگەم بەو کاتی، بە چەندین ساڵ لەمەوبەر، منیش هەموو چوار شەموان خۆم دەڕازاندەوە و لەگەڵ دراوسێکانم دەهاتینە ئێرە، خۆشترین خواردنمان دەهێناو لێرە لە بن سێبەری ئەو دارە بەرزانە دەمانخوارد، چەندین خێزان پێکەوە کۆدەبووینەوە و شاییمان دادەبەستا، خەلکی ئەم شارەی هەموو وەکو خوشک و برا سەیری یەکدییان دەکرد، دڵپیسی نەبوو.

دایکی کارۆ زنجیرەی بیرکردنەوەی ئیبتیسام ی پچڕاند: کیژم هەمووی لە ناوچەوانی تووی دەزانم ئەو پیاوە قوتاری کردین.

_ نەخێر دایەگیان، هەمووی ناوچەوانی کارۆیە بۆ منیش بە خێرە..ئیبتیسام گوتی.

هەر ئەو ڕۆژە خانووێکیان لە گەڕەکی (تەیراوە) بە کرێ گرت، بۆ بەیانیش کارۆ بە مەبەستی دەست بەکاربوون، بەرەو قوتابخانەی گوندەکە ڕۆیشت. ئەو ڕۆژە سێشەممە بوو، کارۆ چوارشەممە و پێنجشەممەش لەوێ مایەوە. لەبەر ئەوەی لە شارێکی دیکەوە بۆ ئەو گوندە گوازرابووەوە، بۆ ئەوەی کاروباری خۆی بە باشی ڕێک بخات، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە چەند ڕۆژێک مۆلەتی پێدا. ویستی ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممە بگەڕێتەوە، بەلام ئوتومبێلی دەست نەکەوت، ناچار بەیانی ڕۆژی هەینی گەڕایەوە هەولێر.

لە دەرگای ماڵی خۆیانی دا کەس نەبوو لێی بکاتەوە، ئافرەتێکی دراوسێیان

لە دەرگای ماڵی خۆیانەوە نیوەی سەری هێنایە دەرەوە: فەرموو کاکە چت لەو مارەی دەوێ؟
_ من پیاوی ئەم ماڵەم، چووبوومە سەفەر و ئێستا گەڕایمەوە، ئەگەر بزانی دایکم و هاوسەرەکەم بۆ لە ماڵەوە نین؟
_ برام دیارە ئاگات لە هیچ نییە، دوونێ شەوێ- عەیب نەبی- ژنەکەت ژانی هاتبوێ، هەر هاوار هاواری بوو، خوا خێری جیرانان بنووسی زوو گەیشتنێ و بە فڕاندن فڕاندیانە خەستەخانەی جەمهوری بڕۆ زوو بیگەیێ.
کارۆ هەر هەنگاوێکی کردە چوار، تاکسییەکی بە کرێ گرت و بە پەلە گەیشتە نەخۆشخانە، لەوێش بە پرسیاران گەیشتە قاوشی ئافرەتە منداڵبووەکان.. چ گەیشتنێک؟ کە بە ساغ و سەلامەتی چاوی بە ئیبتیسام و مەلۆتکەکەی کەوت خەنی بوو، دایکی بە پیریەوە چوو: کوڕم خەمێ مەخۆ، خودا کیژی دایە و کوڕیشی دایە، کەس ناتوانی دەست لە کاری خوای وەردا، ئەو جارە کیژی دا جارەکی دی کوڕی دەدا. کارۆ لەبەر خەمی ژنەکەی ئاگای لە کوڕو کچ نەمابوو، بە دایکی گوت: دایە گرنگ ئەوەیە ژنەکەم سەلامەتە، کچ یان کوڕ جیاوازی نییە.
کارۆ ناوچەوانی ژنەکەی ماچ کرد، ژنەکە پێی گوت: خوا بە دڵی تۆی کرد (خەندە) یەکی پێدای.
بۆ ئێوارە لە نەخۆشخانە دەرچوون و ڕۆیشتنەوە ماڵی خۆیان. شەو داهات ئیبتیسام ئۆقرەی نەبوو، دەهات و دەچوو، دەگەڕایەوە ناو جێ و بالینگانی خۆی و کارۆ ی مێردی، ژنە دەگریا، دەیکردە هەنسکدان و فینگە فینگ. کارۆ لێی پرسی: ئافرەت ژانت هەیە؟
هەر بە هەنسک و لشمە لشم: نەخێر، هیچم نییە.
_ ئەدی ئەو گریانە چییە؟
ژنە نازی بەسەردا باراند: چەند شەوە لەلام نەبووی هەر گریامەو هاوارم کردییە کارۆ فریام بکەوە، نابێ بڕۆی بەبێ تۆ ناژیم.. کارۆ دڵی دایەوە: ئای لەمنت نەکەوی، ئەدی ئەوە دایکم لە لات نییە؟
ژنە وەک منداڵ جەنەی گرت: دایکت بە من چی، تۆ مێردمی یان ئەو؟ من مێردم دەوێ، من بەس تۆم دەوێ. ئیبتیسام زیاتر گڕناگەی داگرت: دەبێ لێرە نەڕۆی هەر لەلام بی.

مامۆستا کارۆ لێکدانەوەی بۆ ئەو فەرمانەی ژنەکەی کرد، بە مەزەندەی خۆی شەن و کەوی کرد: دڵنیام ئەوە قسەی کۆتایی ژنەکەم نییە، ئەوە لە خۆشەویستییە، بۆیە دەستی بە سەریدا هێنا و دڵنیای کردەوە: ئەو چەند ڕۆژەی مۆڵەتم هەیە لەلاتم، دەبێ خوشک و براکانم ببینم، ئێمە دەچین سەردانیان دەکەین، یان ئوتومبێلێک بە دوایاندا دەنێرم ئەوان بهێنی.

بۆ بەیانی بۆ لای ئەو گەراجە ڕۆیشت کە ئوتومبێلی گوندەکەی خۆیانی لێ ڕادەوەستا، چاوەڕێی کرد تاکو دەگات، کە ئوتومبێلەکە گەیشت هەمان ئوتومبێلی بە دوایاندا ناردەوە،هەر ئەو ڕۆژەش باوک و براو خوشکەکانی بە خۆیان و کاوڕێکی دونگ دەستاڕی و مەنجەڵێکی گەورەی پڕ لە ماست هاتن. بووە دەست لەملانێ و یەکدی ماچ کردن و گریانی خۆشی. ئەو ڕۆژە لە ماڵی کارۆ و ئیبتیسام بووە ئاهەنگی خۆشی، لە لایەک بە دایک و باوک و خوشک و براکانی شاد ببووەوە و لەلایەکی دیش کچێکی چاو گەشی لە دایک ببوو. مامۆستا کارۆ هەر ئەو ڕۆژە بەرەو مەیدانی ئاژەڵان ڕۆیشت، گوڵکێکی گەورە و قەسابێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا، گوڵکەکەو کاوڕەکەیان سەربڕی، گۆشتی گوڵکەکەی کردە خێرو، گۆشتی کاوڕەکەشیان لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا خواردیان.

مامۆستا کارۆ ئەو شەوەی مۆڵەتەکەی بۆ بەیانی تەواو دەبوو، نیازی وابوو بگەڕێتەوە ئەو گوندەی قوتابخانەکەی لێبوو، زۆر بە هێمنی و بە نەرمی ئیبتیسام ی دەلاواندەوە و هێوری دەکردەوە، بەڵێنی دڵخۆشکەری پێدەدا: دایکی (خەندە)ی، خۆشەویستم بەیانی بەجێت دەهێڵم بەڵام دڵم هەر لەلاتە، خەمی مەخۆ زوو دەگەڕێمەوە..

لەو ماوەیەی کارۆ ڕۆیشتبوو، سێ جار (ئیبتیسام) یان بانگ کردبووە دائیرەی ئەمن، فۆرمی تایبەتیان پێ پڕکردبووەوە، بەڵێننامەیان لێوەرگرتبوو، دەیان پرسیاریان لێکردبوو، ئازاری دەروونیان دابوو، هەر خواخوای بوو کارۆ بگەڕێتەوە و شار بەجێ بهێڵی، بیری دەکردەوە: کارۆ ڕاستی دەکرد، ئەو گورگانە ناهێڵن کەس خۆشی لە خۆی ببینی، هەر بێتەوە لەگەڵیدا دەچمە گوندی.

تەنیا یەک جێبی لاندرۆڤەر لەو گوندەدا هەبوو، بەیانیان دەچووە شاری و ئێواران دەگەڕایەوە گوندی، لەبەر ئەوەی جێبەکان مۆدێلیان کۆن بوو، ڕێگاکانی ناو شاخ و داخەکانیش قیرتاو نەبوون و تاسە و کۆسپ و کەندڕیان

زۆر بـوو، زۆر جـار پەکیـان دەکـەوت و هەتـا چـاک دەکرانـەوە شـەویان بەسـەردا دەهـات، ئـەو جـارەی چوونـی مامۆسـتا کارۆ و ژنەکـەی بـۆ گوندەکـە، لـە بەختـی ئەوانـدا جێبـە لاندرۆڤـەرە کۆنەکـە هـەر وا بـوو. ئـەو شـەوە لـە سـەر شـانی ئیبتیسـام زۆر گـران بـوو، رێگاکـە لـە بـەر چـاوی وەکـو توولـە مارێکـی درێـژ پەپکـەی خواردبـوو، وەکـو مێـزەری مـەلای پێـچ لـە دوای پێـچ لـوول درابـوو، بـە هـۆی پێچـە پێـچ و بـەرزی و نزمـی رێگاکـە سـەری وەکـو فرفـرۆک دەسـووڕا.
سوپای (بـا)و بـاران و شـەوی تاریـک مێشـکیان لـە کەللەیـدا نەهێشـتبوو، هـەورە تریشـقەش لـە سـەنگەری ئاسـمان بـەردەوام تـۆپ بارانـی دەکردن،ئەویـش هـەر بـە خـۆی قەڵـەزراو بـوو زەندەقـی دەرژا. نـاوە تـاوە بارانێکـی زۆر بـە گـوڕ مـەودای بینینـی یەکجـار کـەم دەکردنـەوە، تاکـو بـەرەو سـەرەوەتر دەڕۆیشـتن ئـاوی بارانەکـە چڕتـرو خەسـت تـر دەبـووەوە، هەنـدێ جاریـش گژلـی قـل گـەورە بـە سـەریاندا دەهاتـە خـوارەوە، بەسـتە زمانـەی لـە گـەڵ هـەر قلـە تەزرەیەکدا سـەری خـۆی لادەدا و وای دەزانـی ئێسـتا نـا هەنووکـە جامـی جیبەکـە کـون دەکا. لـە ترسـان دەسـتی بـە دڵیـەوە گرتبـوو، گێژەنێکـی بیرکردنـەوە وەکـو سـەلکە تەشـی دەیسـوڕاند: دەڵێـن ژنێکـی گـەوج دەتوانـێ پیاوێکـی عاقـڵ بەڕێـوە بەرێـت، کەچـی ژنیکـی عاقـڵ دەبـێ زۆر بـە توانـا بـێ بـۆ ئـەوەی پیاوێکـی لامـل بەڕێـوە ببـا.
هەنـدێ پرووشـکە بـاران لـە کـون و کەلەبـەری جێبـە شـرەکە هاتبوونـە ژوورەوە و تەنکێـش و لەتـەری ژنەکەیـان تەڕکردبـوو، چەرخەڵەیەکـی دایـە خـۆی وەرسـووڕا و منگەیەکـی کـرد: لەوەتـی ئـەم پیـاوەم ناسـیوە، بـێ سـین و جیـم وەکـو دیـل بـەردەوام بەدوایـدا ڕۆیشـتووم، ئەمـڕۆش مـن بـە دەسـتی دیلـەوە دیلـم.
پێـش ئـەوەی بگەنـە نـاو گوندەکـە، لـە سـەر لوتکـە چیایەکـی دەورو بـەری دەسـترێژێکی بووکانەیـان بـە سـەردا هاوێشـتن، ئەوانـەی نـاو ئۆتۆمبێلەکـە دیـار بـوو لێـڕا هاتبـوون لایـان ئاسایی بـوو، کەچـی ئیبتیسـام جێـی پـێ جـێ نەبـوو. کابرایەکـی ڕانـک و چۆغـەر لـە بـەری کلێتـە لـە سـەر، تفەنگێکـی برنـۆی درێـژی لـە نێـوان هـەردوو لنگی خۆیـدا نابـوو، لـە نـاو جێبەکـە لـە بەرامبـەر هەردووکیانـدا دانیشـتبوو هەسـتی بـە ترسـانی ئیبتیسـام کـرد، لـە دڵـی خۆیـدا وای لێکدایـەوە: ئـەو بەسـتەزمانە دەڵێـی مـەڕە لەرزەکـی گرتییـە و ددانەکانـی ناگەنـەوە یەکـدی، هەقیتـی خەڵکـی شارییە نـاو چیـای نەدیتییـە: مامۆسـتا مەترسـێ هیـچ نییـە، ئەوە چەنـد سـەربازێکی قەڵـەزراوی ڕژێمـن لـە سـەر ئـەو لوتکـە شـاخە هێللاتوچکەیەکیان

ماوه، ناوه ناوه لە ترسی خۆیان دەسترێژێکی بووکانە بە حەواوە دەنێن.
_ نەخێر، ناترسم.. ئیبتیسام بە کورتی وەڵامی دایەوە.
هەمان کابرا بۆ ئەوەی زیاتر دڵی ئیبتیسام هێور بکاتەوە، هەندێک فشە فشی کردو خۆی زۆر هەڵکێشا: ئەوە مفاوەزات لە گۆڕێیە ئەگەر نا، هەر بەو بڕنۆیەی دەستم تاویان دەدەمێ، تەغارێک گوویان پێدەکەم و لێرە وەدەریان دەنێم.
ئیبتیسام هەم دەترساو هەم ژیرانەش هەڵسوکەوتی دەکرد: دەزانم کاکە، چونکە ئێوە بەرگری لە خاک و میللەتی خۆتان دەکەن ئازانە، ئەوانەش چونکە بە زۆری زۆرداران و بە ناچاری هاتوونەتە ئێرە و بڕوایان بەو شەڕە خۆترێنە نییە ترسنۆکن.
شەوانی گوندەکان هەمیشە سامناک بوونە، گوندنشینەکان هەمیشە سامناکی شەوە ئەنگوستە چاوەکانیان بە بزێوی و ئازایەتی وەکو تەم دەرەواندەوە. زۆر شەوی وا هەبووە لە شەوین و شیوە خوارو شەو بەکێوەکاندا گورگ لە مێگەلی دەدان، درندەو دەعبایان تووش دەبوو، دزو جەردە ڕێیان لێدەگرتن و گوللە بە گوللە دەکەوت و خوێن دەڕژا وماڵیان بە تاڵان دەبردرا باکیان نەبوو. مامۆستا (کارۆ)ش بە هەمان پەروەردەی گوند گۆشکرا بوو، لە ژیانیدا هەڵبەزو دابەزو دەستوەکەری و بەرەنگاربوونەوەی نەهامەتییەکانی دوژمنە سەرسەختەکانی زۆر دیبوو، چەپۆکی کێخوای ترس کاری لێنەدەکرد، بەڵام ترسە شاردراوەکەی ناو چاوە خەماوییەکانی ژنەکەی پەرێشان و خەفەتخانی کرد بوو.
ماوەی چەند ڕۆژێک ئیبتیسام وەکو ئافرەتێکی بەندەی چوار دیوار بیری دەکردەوە، دەستە وەستان وەستا بوو، نە دەیدەتوانی دیوارەکان بڕووخێنی و نە پێشی دەکرا بە سەریاندا باز بدا، ئەو پێی وا بوو ئەو دیوی دیوارەکانیش تەڵبەند کراون.باڵاخانە و تەلارە بەردینیە بریقە دارەکانی بەغدا لە کوێ و، خانووە قوڕینە کون کونییە پڕ مشک و مارو چەند جار وێران بووەکەی گوندە بە ناپاڵم ڕووخاوەکانی ئەو دەڤەرە لە کوێ. ئیبتیسام ناهەقی نەدەکرد ئەگەر پەرێشان و شلەژاوو تۆقی بێت، ڕاستە ئەو (کارۆ)ی زۆر خۆش دەویست، ئەو عاشقی ئازایەتی و چاو نەترسییەکەی ببوو، ئەو دەیویست لە بەغدا سەرو ماڵی بپارێزی، لە ناو جێ و بالینگانی ئارمووشی بە جووتە بخەون، نەک لەو شوێنەی قەت نەی دیبوو، لێی نامۆ بوو، لێی تۆقیبوو، ئەو هەندێ

جار بیرۆکەیەک دەهاتە ناو سەری و ختوکەی دەدا و دەیگوت: عشق لەو کەسە گرنگترە کە عاشقی بووی، گرنگ نییە کەسەکە لە دەست بدەی، گرنگ ئەوەیە عشق لە دەست نەدەی. لە ناو ئەو چوار دیوارەدا هەر بیری دەکردەوە: من عاشقی ئەو پیاوەم بوویمە و هەتا دەمرم هەر عاشقی ئەوم، بەلام مەرج نییە ببمە کووچ کووچەی پاشەلی بۆ هەر کوێ بڕوا ڕام بکێشی. هەندەی بیر بکاتەوە ژانە سەری گرت، سەری خۆی بە دیواریدا دا، بە توورەیی لە خۆی خوڕی: ئای ئیبتیسام بە دەستی خۆت، بە کەللەی پووچی خۆت بە دوای عشقێکی بێ هوودە کەوتی، لە جیاتی فەرشی ئارمووشم بۆ ڕابخا، باخچەی ماڵەکەم پڕ گوڵ بکا، گەشتی شارو ولاتانم پێ بکا، بۆ زیارەتی زیارەتگاکانم ببا، کردمییە گووخلێنە و گردێک خەمی پیسی خستە سەر پشتم.
سەری سووڕا، ژانە سەرو ژانە پشت و ژانە زگ و سینگە کوژێ هێرشیان کردە سەر جەستەی، کردییە هاوارو ڕۆ ڕۆ. کاتەکە نیوەڕۆ بوو دەوامی قوتابخانە تەواو ببوو، مامۆستا کارۆ بە سەر دادو فیغانی ژنەکەی دا هاتەوە، دیقەتی دایە چاوە هەڵپشافتووەکانی، نیگای چاوەکانی وەکو تیر سینگیان بڕی و لە هەردوو گوێچکەکانی دڵیەوە گیر بوون، شانی دایە بەر شانی و بە لەپە گەورەکانی چاوی سڕیەوە، فەرامۆشییەک دڵ و کەللە و هەناوی (ئیبتیسام) ی فێنک کردەوە، بەرە بەرە هێور بووەوە، وەکو منداڵی بەر مەمکان فیغانەکەی کردە لشمە لشم و جەنە، ئەویشی کردە نزگرە. کارۆ هەوڵی دا ئارامی بکاتەوە: ژنەکە، دەزانم ماندووی، هەر ئەمڕۆ کێرکەرێکت بۆ دەدۆزمەوە ئاومان بۆ بهێنێ و نانمان بۆ بکا، جل وبەرگەکانیشمان بۆ بشوا.
ژنە بە نزگرەوە بە مێردەکەی گوت: بە قوربان، وەکو بەندییەک لە ناو ئەم چوار دیوارە قوڕەدا دەخنکێم.
کارۆ نیازی خراپ نەبوو، بەلام دەیویست نە خۆی و نە ژنەکەی ئومێدیان بە بەغدا نەمێنێ، بە ژنەکەی گوت: بیرۆکەیەک لە مێشکمدا دەجولێ، ئەگەر ڕازی بی دەیخەمە کار.
_ چییە دەگەڕێینەوە بەغدا؟ ژنە بە پەرۆشییەوە بە مێردەکەی گوت.
_ بەغدای چی؟ دەتەوێ گورگان خواردی بین؟ کارۆ پەرۆشییەکەی لێ کردە هەرەس.

_ باشه ئەو گورگانە ناگەنە ئێرە؟ ژنە بە نابە دڵی وا ی گوت.
_ ئەو گورگانەی ئەوێ لێرە وەکو ڕێوی گەڕ کلکیان بە سەر پاشەڵیاندا شۆڕکردۆتەوە... مامۆستا کارۆ وا ی گوت.
ئیبتیسام تێگەیشت ئەوەی ئەو دەیەوێ بۆی مەیسەر نابێ، زانی دادو فیغان دادی نادا، لە خۆدان و ڕۆ ڕۆ سوودی نییە، هۆڕە هۆڕ گریان کاری لێ ناکا، جەنەو نزگرەش هەر هیچ. هەموو چەکەکانی بەکار هێنا، بە بڕوای خۆی چەکێکی کاریگەرتر مابوو، (خەندە)ی هەڵگرت هێنایە بەردەمی مێردەکەی، جلەکانی کچەکەی داکەند: سەیرکە، ئەم هەموو زیپکەو لیرە ئەستووربووانەت دیوە؟ ئەم هەموو پۆقلە پڕ کێمانەت دیوە؟ ئەوە بەری ڕەنجی چەندین ساڵە دەیفەوتێنی؟ بە زیندوێتی دەیمرێنی؟ سندان لە من و لە هەموو سەروەت و سامانەکەمان، تەنها ئەم کچەمان مەیفەوتێنە مەیمرێنە.
قسەکانی ئیبتیسام، دیمەنی جەستەی (خەندە)ی کچی، کاریگەرییان بە سەر کارۆ دا هەبوو، بەڵام ئەو زۆر بەو پەندانە سەرسام بوو کە باب و باپیرانی فێریان کرد بوو، ئەو پێی وا بوو- سوار بوونی کەر عەیبێکە و هاتنە خوارەوەی دوو عەیب-ئەو پێی وا بوو ئەگەر بگەڕێتەوە، ئەگەر پەشیمان بێتەوە، ئەوە دوای ئەوە دەیکەنە پەندو عیبرەت و لە بۆ یەکدی دەیگێڕنەوە.
(کارۆ) قۆناغەکانی قۆزاخە و پیوپای تێپەڕاندبوو، تەواو باڵی گرتبوو، کەچی ئەو ڕۆژە بە تەواوی گەڕابووەوە ناو قاوغی جارانی. توند، ڕەقەکار، بە چاوەکەم ڕوحەکەم، بە هاش و هوش و هەڕەشە و گوڕەشە، بە هیچ شێوازو شێوەزارێک نەرم نەدە بوو: ژنەکە، قسەکانت شەکرن، تۆم زۆر خۆش دەوێ، خەندەش جەرگمە، بەڵام من ناگەڕێمەوە.
_ من ناگەڕێمەوە واتە چی؟ دەتەوێ من بە تەنیا بگەڕێمەوە؟ ژنە بە قوڕگی پڕ بە گریانەوە بە مێردەکەی گوت.
_ زۆر ئاساییە، ئەگەر خۆت و کچەکەمان بگەڕێنەوە بەغدا، لەوێ کەس ناتان ناسی و خۆشتان باسی هیچ مەکەن، منیش ناوە ناوە بە نهێنی سەردانتان دەکەم.. کارۆ ئەو چارەسەرییەی پێ لە بارو گونجاو بوو.
ژنە بیری کردەوە: ئەگەر بچمەوە بەغدایێ، لە کیفە کیفی ماران، گزە گزی مێشان، جرت و فرتی گووخلێنە و هەزارپێ و خەمەگرووان ڕزگار دەبین، ئەگەر شەڕیش دەستپێبکاتەوە گرمە گرمی تۆپان و گڤە گڤی فڕۆکانیش لە لایەکی دی.

هەر خۆی پرسیاری لە خۆی کرد: کارۆ خۆشەویست ترە یان بەغدا؟ هەر خۆشی وەڵامی خۆی دایەوە: بێگومان ئەو، لە رۆژی هاوسەرگیریەکەماندا، بەڵێنم پێدا ئەوم لە هەموو سەرو ماڵ و سامانەکەم خۆشتر بوێ.
ژنە بەراوردێکی لە نێوان خۆی و مێردەکەی کرد: من و ئەو لە سۆزی خۆشەویستی ژن و مێردایەتیدا هاوبەشین، هەردووکیشمان لە بەرامبەر بەری داری خۆشەویستیەکەماندا وەکو یەکدی لێپرسراوین، بەڵام هەمان هەست و سۆزی خۆشەویستیمان بۆ ئەم خاکە نییە، ئێرە نیشتمانی ئەوو باوک و باپیرانیەتی، داگیرکراوە هەقی خۆیەتی بەرگری لێبکا.
ئیبتیسام سۆزو خۆشەویستی بەسەر مێردەکەیدا باراند: گیانەکەم لنگم لە سەر لنگتە بۆ کوێ برۆی لە گەڵتم، بە تەمای بە جێت بهێلم هەوێیەکم بۆ پەیدا بکەی، ئای قورِی بە سەری وەللا دەیخنکێنم. دەستیان لە ملی یەکدی کردو بەڵێنی خۆشەویستیان نوێ کردەوە. ژنە لە باوەشی مێردەکەیدا پرسیاری لێکرد: پیاوەکە باسی بیرۆکەیەکت کرد، ئەو چی بوو؟
پیاوە بە ژنەی گوت: ژنەکە گۆتە گۆتێک لە ناو خەڵک و هەندێ لە لێپرسراوان بڵاو بووەتەوە، گوایە دانووستانی نێوان حکومەت و سەرکردایەتی شۆرش لەم زووانە بە هەرەس کۆتایی پێدێت، ئەگەر ئەوە راست بێ، بێگومان شەرِ لە نێوانیاندا دەست پێدەکاتەوە، کە شەرِیش دەستی پێکردەوە ئێمە ناچار دەبین بەرەو سەرەوە تر هەڵبکشێین و خۆمان یەکلا بکەینەوە، ئایا لە گەڵ شۆرش دەبین یان دەگەرِێینەوە ناو حکومەت، حکومەتیش هەر ئەو حکومەتەیە کە لە بەغدا بینیمان، کەواتە من پێشنیارێکم هەیە ئەگەر تۆ پێی رازی بی، پێشنیارەکەم دەربارەی ئەو ماڵ و موڵکانەی بەغدایە، ئایا چییان لێبکەین؟
من دەڵێم هەتا ئەو چەند رۆژەی دانوستان ماوە بگەرِێینەوە بەغدا، موڵکەکانی ئەوێ بفرۆشین، بە برێک پارەی ئەو موڵکانەجێبێکی لاندرۆڤەر بکرین، ئەو پارەی دەمینێتەوە جارێ هەڵیبگرین، ئەگەردانوستانەکە بە ئەنجامێکی باش گەیشت، لە هەولێر موڵکی پێ دەکرینەوە، ئەگەر شەرِیش دەستی پێکردەوە بێگومان حکومەت مووچەکەی من دەبرِی، کە موچەکەشم برِا بەو جێبە لاندرۆڤەرەی دەیکرین کرێی پێدەکەم و خۆمان دەژیێنین، ئەگەر زانیشمان لە ژێر مەترسیدا ین و فرۆکە جەنگییەکان و تۆپە دوورهاوێژەکانی حکومەت بەردەوام تۆپ بارانمان دەکەن، لە سنوور دەتان پەرِێنمەوە و لەوێ دەتان

حەوێننەوە، منیش لەو نێوانەدا هات و چۆ دەکەم.
ئیبتیسام زیاد لە پێویست نەرمی نواند: حەیاتم، هەمووی ماڵی خۆتە چی لێدەکەی بیکە بەڵام فرۆشتنی ئەو هەموو مولکە بە ڕۆژێک و دووان ناکرێ، ئەو پارێزەرەی تۆی لە عەسکەری ڕزگارکرد وەکالەتی لە بۆ دەکەم، با ئەو بیانفرۆشی، تەنها ڕۆژی بەناو کردنی منی دەوێ، ئەو کاتی دەچینە بەغدایێ بەناوی کڕیارەکەی دەکەم و پارەکەش وەردەگرین، پارەکەش هەمووی لە دەستی تۆ دەکەم، فڕێی دەدەی، دەیسووتێنی، مولکی پێدەکڕی، ماڵی خۆتە چی لێدەکەی بیکە. دەربارەی جێبەکەش بە بێ فرۆشتنی مولکەکانی بەغدایێ دەتوانین بیکڕین، من هەندێک زێڕم ماوە ئەوان دەفرۆشم، بڕێکیش پارەی هیشکەمان هەیە، هەمووی کۆ بکەینەوە جێبە لاندرۆڤەرەکەی پێدەکڕێ.
ئەوەی بە قسە گوتیان بۆ بەیانی کردیانە کردار، ئیبتیسام و کارۆ بەرەو هەولێر ڕۆیشتن لەوێ تەلەفۆنێکیان بۆ پارێزەرەکە کرد بۆ بەیانی بگاتە هەولێر، هەربەیانیش وەکالەتەکەی بۆ کرد، جێبێکی لاندرۆڤەریان کڕی و لە هەولێرەوە بەرەو گوندەکە گەڕانەوە، لە ڕێگا لایان دایە سەیرانگای بێخاڵ، لەوێ لە چێشتخانەیەکی بچکۆلە خۆیان مرکرد، مامۆستا کارۆ زۆر دڵخۆش بوو هەر دەیخوارد و بۆ ژنەکەی دەدوا: ژنەکە پێبکەنە، ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژی تەمەنمانە.
ئیبتیسام خەندەیەکی بۆ کرد: لێدە عەلۆ برنجە !!
_ ئەوەی لە کوێ فێر بووی؟ پیاوە لە ژنەی پرسی.
_ لە تۆ، دیارە کەوتیە خۆشی پلکە (خەجێ) ت لە بیر کرد !؟ ژنە بە پیاوەی گۆ.
کارۆ بیری بۆ کەللەی گەڕایەوە: قەت ئەو زنجیرە بەرزو نزمە یادگارە وشکانەم لە بیر ناکەم، هەر پلکە خەجێ و مام خدر بوون نقورچەیەکیان لە بیردانم دا و گەیاندمیانە ئێرە. بۆ ئەوەی بڕوا بکەی بە چاوی خۆت چەندین سادەو ساکاری وەک ئەوان لێرە و لەو گوندەش دەبینی.

ئەگەرچی حکومەت نیازی خراپ بوو، حەرەس قەومی و دائیرەی ئەمن خەلکیان دەگرت و ئازاریان دەدان، بەڵام دانوستانی نێوان سەرکردایەتی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردو، حکومەتی عێراق کۆتایی پێنەهاتبوو. هەردووکیان-

ئیبتیسام و کارۆ- بیریان لەوە دەکردەوە سەفەرێکی بەغدا بکەن و بزانن پرسی فرۆشتنی مولکەکانیان بە کوێ گەیشتووە. بۆ بەیانی مامۆستا کارۆ مۆڵەتی لە بەڕێوەبەری قوتابخانە وەرگرت و خۆی و ئیبتیسام بەرەو بەغدا بەڕێکەوتن. لەوێ سەردانی پارێزەرەکەیان کرد، پارێزەر مولکەکانی فرۆشتبوو، پێشەکییەکیشی وەرگرتبوو، لەسەر ئەوەی مابوو ئیبتیسام بچی بەناوی کڕیارەکەی بکات.. هەموو پارەکەیان وەرگرت، بەسواری تاکسییەک بەرەو گەراجی (نەهزە) ڕۆیشتن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە هەولێر. کاتژمێر شەشی بەیانی بوو، کەڕەسیسەی خەلک لە ناوەندی شەقام ڕێگەی ڕۆیشتنی بڕیبوو، لەسەر تەرمێک وەستابوون کەس نەیدەناسی،، مامۆستا کارۆ دابەزی سەیری کرد ناسییەوە، بە سەرسامیەوە بە خۆی گوت: ئەوە دەرویش (ڕەحیم)ە.
لە خەلکەکەی پرسی: ئەو پیاوە کێ کوشتویەتی؟
یەکێک وەڵامی دایەوە: ئەم شەو لێرە، لەلایەن چەند کەسێکی نادیار دەستڕێژی گوللەی لێکراوە، کەسیش نازانی بۆچی و لەبەر چی کوژراوە.

## ٢٢

ئیبتیسام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە گەڵ داب و نەریتی خەڵکی دەڤەرەکە دەسازا، بە بینینی سروشتی جوانی کوردستان ئابلوقەی ترسی دەشکا، بەو ڕایەخە بەفرییانەی ناو کەلێنە شاخەکانی نسارگە دوورە دەستەکان سەرسام دەبوو کە هێشتا بەرامبەر ئەو کەم هێزییەی تیشکی خۆر خۆڕاگر بوون و بە دەگمەن نەبوایە گەرماییەکەی نەیان دەگەیشتێ. بە کانییە چاومارییەکان دەحەپەسا، کە تازە زابوونەوە و ئاوی کەللەتەزێنیان لە بەر دەڕۆیشت. بە بەژنی تەبارەی دەغل و دان و قۆپەنەی گیا دەگەشایەوە، کە هیوای خۆشگوزەرانیان دەخستە دڵی. بە بۆن و بەرامی گوڵەزەردە و حاجیلە و خەزێمە شاگەشکە دەبوو، کە دەشت و دەرو قەدپاڵەکانیان پڕ دەکرد و دیمەنی ڕەنگاوڕەنگیان بە سروشتی دەڤەرەکە دەبەخشی و دەیان ڕازاندەوە. کە دەیبینی نێرو مێ و گەورە و بچووکی گوندەکە خەریکی کڕین و دوورینی جل و بەرگ و دەسرۆک و پێڵاوی جوان بوون، بۆ ئەوەی دوای چەند ڕۆژێکی دی لە بەریان بکەن و لە بەر دەمی مەشقەرەی ئاگری نەورۆز پێچێک شایی ڕەشبەڵەک بگێڕن، ئەویش نەدەعەجما و بۆ هەمان مەبەست لە گەڵ هاوسەرەکەی دەچووە شاری. ئیبتیسام هیچ ڕەگێکی ڕەگەزپەرستی لە ناخیدا نەڕوا بوو، هەموو ڕەنگەکان لە ناو دڵیدا تێکەڵ ببوون و یەک ڕەنگیان دروست کردبوو، ئەو هەر خۆی ڕەنگاڵە بوو هەر کوێی بویستایە لێی دەنیشتەوە، ئەو پەپوولە بوو هەموو گوڵەکان لە کەللەی ئەودا یەک بۆنیان هەبوو. بەڵام هەر باوکێک کە تۆوێک لە هێلکەدانی هەر ئافرەتێکدا دادەنێ، بەشێک لە خەسلەتە بۆماوەییەکانی تێدا دەڕوێنی،کەچاوی بەو هەموو کورە گەنجە وڵاتپارێزو خاکپارێزو میللەتپارێزە دەکەوت، خوێن لە دەمارە لاوازو بێ هێزو سستەکەی گەش گەش دەگەڕا. ئەو گوخلێنانەی بێزی نەدەهات سەیریان بکا، ئەو بۆقانەی بە قیرە قیریان هەراسانیان کرد بوو، ئەو خەمەگرووانەی لێیان دەترسا، ئەو مێرووە پیسانەی بە پێستی کچەکەی هەڵگەڕا بوون، ئەو کونە دیوارە ڕەشانەی پێی وا بوو مارو دووپشکیان لێ دێنە دەرەوە، ئەو تەپ و تۆزانەی لە گەڵ هەڵکردنی هەر بایەکی بە هێزدا چاوە گەشەکانیان سوور هەڵدەگەڕاند، ئەو چوار دیوارە قوڕە پەستەی لێی ببوونە بەندیخانەی ئەبوغرێب، چونکە (کارۆ) ی خۆشدەویست لە گەڵ هەموویاندا ڕاهات. بە سەر هەر پردێکی

دارینـدا دەپەڕیـەوە قاچەکانی زۆر دا نەدەگرت نـەوەک بڕووخـێ، لـە بەرامبـەر هـەر کوڕە قۆزێکی پێشـمەرگە بوەسـتایە، زۆر سـەیری نەدەکرد نـەوەک بـە چـاو بچـێ، چـاوی بـە هـەر منداڵێکی بـاوک شـەهید بکەوتایـە، چـی لەنـاو جانتاکـەی دەسـتی بوایـە لـە دەستی دەنـا، هـەر فڕۆکەیەکی دوژمـن بهاتایـە لەگـەڵ ئـەوان بـە بـێ تـرس دەچـووە نـاو کونـە شـاخێک و خـۆی دەشـاردەوە، کـێ بـە هـەر هۆکارێـک برینـدار بوایـە برینپێچی بـۆ دەکرد، کـێ بـە هـەر هۆکارێـک بـاری لاکـەچ بوایـە بـۆی ڕاسـت دەکـردەوە، ئـەو پێـی وا بـوو مـرۆڤ بـە ئازارەکانیـەوە گـەورە دەبـێ، هەمـوو جـارێ بـە بۆنـە و بـێ بۆنـە (کارۆ) ی دەکـردە نموونـە، لـە عەرەبانەیەکـی کەچـەوە بـۆ خـاوەن ئۆتۆمۆبێـل، لـە لانـەوازی و کونـی مزگەوتانـەوە بـۆ خـاوەن خانـوو، لـە کـەم کاری و مانـدوو بـوون بۆخـاوەن دوکان و حەسـانەوە، لـە نەخوێندەوارێکـی کۆڵـەوار بـۆ مامۆسـتایەکی بلیمـەت. ئـەو لـە هـەر بۆنەیەکیشـدا هەرکـە دەرفەتـی بـۆ دەڕەخسـا، ئـەوەی نەدەشـاردەوە و بـە خـۆی و بـە خەڵکیشـی دەگـوت: سـەرەتا شـەرواڵەکەی (کارۆ)م خـۆش ویسـت، دواتـر ئازایەتییەکـەی، ئینجـا چـاوو بـرۆی.

ئیبتیسـام ناوبانگێکـی باشـی، لـە لایـەن خەڵکـی دەڤەرەکـە، بـۆ خـۆی پەیـدا کـرد بـوو، وەک برینپێچێکـی شـارەزا و مامۆسـتایەکی خۆبەخـش بـۆ کچەکانیـان هەمیشـە لـە خزمەتیانـدا بـوو، بۆیـە بـە ناوپشـتە و بەرەبابـی خۆیانیـان دەزانـی، نـەک بـە پەناهەنـدە و لایدەیەکـی خەڵکـی خـوارەوە.

سـەرەتای مانگـی حوزێرانـی سـاڵی (١٩٦٣) بـوو، دانوسـتان و ڕێکەوتـن لـە نێـوان سـەرکردایەتی شۆڕشـی کـورد و کودەتاچییـەکان، سـەری بـە هیـچ ئاکامێـک نەگەیشـتبوو، حـەرەس قەومـی و خۆفرۆشـە ئابـڕوو تکاوەکانـی ناوخـۆ، بـەر بیوونـە گیانـی خەڵکـی بـێ تاوانـی نـاو شـارەکانی کوردسـتان.. هەنـدێ لـە هـۆزو تیـرە عەرەبەکانـی هاوسـنووری باشـووری کوردسـتان، گوندەکانـی ئـەو سـنوورەیان وێـران و تـاڵان کردبـوو، ئـەو سـاڵە بـە سـاڵی (فەرهـوود) بـە ناوبانـگ بـوو، فڕۆکـە جەنگیـەکان ڕۆژ نەبـوو پیاسـەی بـێ تـرس بـە ئاسـمانی ئـەو گوندەدا نەکـەن کـە (کارۆ) و (ئیبتیسـام) ی لێبـوو، ڕۆژی وا هەبـوو هـارو هـاج هەرچـی ڕق و قیـن و ژەهریـان هەبـوو، هەموویـان دەبارانـدە سـەرو گوێلاکـی شـوان و گاوان و جوتیـارە بێدەسـەڵاتەکان، دارە بەرزەکانـی گوێـز و بـەڕووەکان بـە ناپاڵـم دەسـوتێنران، تۆپـە دوورهاوێـژەکان کوێرانـە مزگـەوت و قوتابخانەیـان دەکـردە ئامانـج، دوژمـن بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی شۆڕشـی کـورد هەرچـی لـە توانـای دا بـوو بـەکاری دەهێنـا، نـەک

هەر تۆپ و فرۆکەو چەک و تەقەمەنی، هەتا ویژدان و چاوەکانیشی دەکڕی، بۆ ئەوەی حەشارگەی شۆڕشگێڕانی نیشان بدەن.
نیشتمان پەروەران، بە تایبەتی ئەوانەی ناو شارەکان، بەرگەی دۆزەخی فاشییەکانیان نەدەگرت، کۆمەڵ کۆمەڵ و تاک تاک ڕێگەی هات و نەهاتیان دەگرت و پەیوەندییان بە شۆڕشەوە دەکرد، شۆڕش زگی زۆر گەورە بوو، لە کوردستانی گەورەش گەورەتر بوو، حەشارگەو پارێزەری هەموو ڕەگەز و باوەڕی جیا جیا و ئایین و ئایینزاکان بوو.ئەو کاتە لە تەمەندا هێشتا ساوا بوو بە تەواوی بە سەر پێی خۆی نەکەوتبوو، تەنها دوو ساڵانە بوو، بەڵام دوو بازووی بە هێز و تۆکمەی سیاسی و سەربازی لە پشتیەوە بوون، هەر یەکە و لایەکیان گرتبوو، ورەی ڕۆیشتنیان بەرز کردبووەوە، لە قسە کردن و گفتوگۆدا و لە گاڵە گاڵ و دایەو بابەی تێپەڕاندبوو، بەڵام ئەو توانایەی نەبوو هەرکێ سڵاوی لێبکا وەک خۆی وەڵامی بداتەوە، ئەوانەی پەیوەندیان دەکرد زۆر بوون، بەڵام بۆریشیان تێدا هەبوو، بۆر چڵکنیشە وەک کۆرە ماری ژەهراوی لە گەڵ هەموو خاکێکدا دەسازێ، زەحمەتە بە یەک دوو سەرنج ببیندرێ، نەیدەتوانی هەرکێ پەیوەندی پێوە بکا و بیەوێ ببێتە پێشمەرگە چەکێکی بداتێ، ئەوانەی پەیوەندیان دەکرد دەبوایە بە چەکەوە بێن، یان دوای پەیوەندی کردن چەکێک بۆ خۆیان پەیدا بکەن.
بە مەبەستی بەرگری کردن لە خۆی و ژن و منداڵ و خاکەکەی، بۆ ئەوەی تفەنگێک و چەند تاقمە فیشەکێک پەیدا بکا، مامۆستا (کارۆ) سواری ئۆتۆمۆبێلەکەی بوو. ترسی لە بازگەکانی میری نەبوو، لە باخەڵیدا ناسنامەی مامۆستایەتی هەبوو، بۆ بازگەکانی پێشمەرگەش پسوولەی تێپەڕینی بۆ کرا بوو. بە شەقامی نێودەوڵەتی (هاملتۆن) دا ڕۆیشت، لە سەر پردی (ڕەشدوور)ە وە بەرەو (قەسرێ)، لەوێشەوە - بەمەبەسنی ڕۆیشتنی بۆ (سەنگەسەر)- بە گوندەکانی (گۆجاڕ) و (بەرگرتکە) و (ئێنزێ) و (لێوژێ) بۆ ناو دۆڵی شەهیدان شۆڕ بووەوە. ئەو بیستبووی هەندێ لە جاشەکانی ئەو ناوە، وەک سازان و هاوکارییەک لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگە و لە هەمان کاتیشدا بۆ قازانجی خۆیان، بازرگانی چەک و تەقەمەنییان دەکرد.
هەندەی نەما بوو دۆڵەکە بە تەواوی ببڕێ و بگاتە (سەنگەسەر)، پەیکەرێکی ئێسک و پێستی لەڕو لاوازی بینی، ئێسکەکانی وەک ستوونی ڕەشماڵ قیت و زەق بە جۆرێک دیار بوون هەندەی نەما بوو پێستە زەرد هەڵگەڕاوەکەی بدڕێنن.

وەک کیسەڵێکی ئاو لێبڕای شەکەت و تێنوو بەرەو ناو دۆڵەکە هەر دەڕۆی و ئاوڕی دەدایەوە، بە نیاز بووجێبێک، پیکابێک، تراکتۆرێک، هەر تیژڕۆییێکی لەو جۆرانە بەو دۆڵەدا سەربکەوێ، لە گەڵ خۆی سواری بکا و لە بارەگای هێزێک، بەتالیۆنێک، لقێک، پەلێک، دەستەیەک پێشمەرگە نزیکی بکاتەوە. (کارۆ) کە گەیشتە بەرامبەری، ئەو بەژنە چیلکەدارییە و دەموچاوە قۆپاوییەی لە لا نامۆ نەبوو. ستۆپێکی خێرای کرد و ڕا یگرت، هەردووکیان سەیری یەکدییان کرد، جامی لای خۆی بە تەواوی هێنایە خوارەوە و بە تەواویش سەیری کرد: هەوە هەونییەی پێناوێ دەق هەوە، لە عاسمانانم دەویست لە عاردانم دەستکەوت.
هاتە خوارەوە و لێی چووە پێش، کە ئەو چووە بەردەمی ئەویش ناسییەوە، تێکئالآن و بوونە یەک، کارۆ ئەوی بەرز کردەوە و خستیە سەرشانی خۆی: هاوارتە لە من کراوەتە فرووج، ئای لەو بەدبەختییەی ئەو هەموو زانستەی لە سینگیدا بوو بە کەلکی نەهات.
لە پێشەوەی جێبەکە لە تەنیشتە خۆی داینا، کارۆ خۆی گەیاندە شوێنی مەبەست و ئەوەی بۆی چوو بوو جێبەجێی کرد، بە پەلە پێچی کردەوە و ڕێ و ڕێ بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە. قسەیەک لەم و دوو لەوی پرسیارو سۆراخکردن بوونە ڕستە و قل قل لە یەکدی دەبوونەوە و لە دەویان دەهاتنە دەر، هەریەکەیان تێنووی بەسەرهاتەکانی ئەوی دیکەیان بوو. هەتا گەیشتنە چایخانۆکەیەکی ناو (قەسرێ)، مامۆستا (کارۆ) سەرلەبەر بەسەرهاتەکانی خۆی، هەتا ئەو ڕۆژەی قەدەر کردییە مامۆستا و گەیاندییە ئەو دەڤەرە، هەر لە هوردی هەتا درشتی بۆ گێڕا یەوە.
بە دوکەڵ و بۆنی فەشا فیشی بەردەرگای چایخانۆچکەکە موولوولەکانی ناو گەدەیان گریانیان هات.
لە پەنا دیوارێکی نزیک ڕایگرت و دابەزین، کە دانیشتن کارۆ یەکێک لە شاگردەکانی بانگ کرد: کاکە سەرو چوار شیشی موشەکەل و دوو جام ماستاوی مەڕە کۆزەشمان بۆ بینە.
هەر لە سەر خواردنەکە بوون کارۆ دەستی لە سەر شانی مەلا ی دانا: قەت ئەو هەموو گۆشت و پلاو برنج و چەلاوە چەورە و ماستاوە کورکنانەی تۆ لە بیر ناکەم، کە لەملا و لەولاوە و بەتایبەتیش لە لایەن خانمە (فەتحییە) وە بۆ تۆ دەهاتن و منیش لێیان بێ بەش نەدە بووم.

ئەوەندەیان خوارد مڕ بوون، ویستی دوو چای عەنتابیش بانگ بکا، کەچی قسەکەی مەلای هاتەوە بیر: کاتی زێڕینی مەلا ی، ئەو کاتەی لە بەغدا بووین، ئەو مەلای مزگەوت بوو، بە گەنم نەبوایە بە جۆی نەدەدا. منیش ئەگەر داوەتەکانی ئەو نەبوونایە، نان و تەماتە و نان و ماستاوم دەخوارد و عەرەبانەم ڕادەکیشا. بەڵێ ئەو کاتی ئەو دەیگوت: ڕاستەوخۆ لە دوای گۆشت خواردن (چا) خواردنەوە باش نییە، گۆشت ئاسنی تێدایەو بۆ لەش پێویستە، کەچی (چا) ئاسن کوژە. پەشیمان بووەوە چایەکەی بانگ نەکرد.
خواردنی زۆرو ماستاوی کورکن کفت و خەواڵوویی کرد بوون و بەلادا دەچوون، دوای نوێژی عیشا گەیشتنەوەماڵەوە، ژنە کە چاوی بە میوان کەوت شلەژا، دەرفەتێکی دۆزییەوە، چووە بن گوێی پیاوەکەی: بە تەمای ڕوو زەردم بکەی میوانی ناوەختت بۆ هێناوم؟
_ ئافرەت ئەوە میوان نییە برامە برام..... پیاوە بە ژنەی گوت.
ژنە سەیری مێردەی کرد: ئای بە قوربانی خۆت و برات بم، ئەدی ئەوە بۆچی وەکو چیلکەداری قامیش ڕەق بوویتەوە !؟
_ بەدبەختی و خەفەتی دنیا.. پیاوە وەڵامی ژنەکەی دایەوە.
شەپۆلی دەریایەکی بێ سەرو بنی بیرکردنەوە مامۆستا (کارۆ)ی ڕا دەپێچا و بەرەو دواوەی دەبردەوە: حەیفە ئەو مەلایە نازدارە کوچک ڕەش بێ، هەندی چەنگێکی لێمایتەوە، لامک ڕەق و تەقی لاخوار، باڵکەوتی و ماڵکەوتی بوویتە مەحچەچە، بە لاکە لاک دەڕوا ولاقی لە دوای نایێ، کە وای دەبینم دڵم قرچ و هۆڕ لە بۆی دەسووتێ.
ئاوڕی لێدایەوە، مەلا پرخە پرخی بوو، ئەو پرخە پرخە و کەلەشی ماندووی مەلا سەرنجی کارۆ ی ڕاکێشا: دەڵێی هۆشبڕی درایتێ خەو بەنجی کردووە. ئەو کەلەشە گەورەیە و ئەو هەموو بەزەی ناوقەد و تەنگە ی چیان بە سەر هات!!؟
گلەیی لە زەمانە کرد: ئای دنیا چۆن بڵندان نەوی دەکەی و نەوییان بڵند دەکەی.
پەشیمانیش بووەوە: چ پەیوەندی بە دنیاوە هەیە؟ دنیا هەقی چییە؟ هەر کارێک خۆمان بە نەزانی دەیکەین، هەرچەند زاناش بین هەر وامان لێدێت.
دەستێکی بە ناوچەوانی خۆیدا هێنا: ئەوەش ڕۆڵی هەیە، چاکە و خراپەی پێدەکرێ.

ئـەو شـەوە ئاسـایی ڕۆیشـت، بـۆ بەیانـی ئـەوەی بـە کەلـک چێشـتی بەیانـی دەهـات و خـودا بەوانـی دا بـوو، ئیبتیسـام لـە سـەر مەجمەیـەک ریـزی کـردن، لـە دوای بەیانـی باشـکردن لـە بەردەمـی دانـان. مـەلا بـێ ئـەوەی سـەری بـەرز بکاتـەوە بەیانـی باشـەکەی بـە گەرمـی وەرگرتـەوە، ژنـەش لێـی لـە بۆسـە دا بـوو بـە دەرفەتـی زانـی، هەڵوەسـتەیەکی کـردو هـەر لـە سـەری هەتـا بنـی مـەلای دایـە بـەر تیشـکی چاوەکانـی، هـەر بـە چاوەکانیشـی ئامـاژەی بـۆ پیاوەکـەی کـرد بـە دوایـدا بچێتـە دەرەوە: پیاوەکـە، ئـەو کابرایـە هیچـی بـە تـۆ ناچـی، بـڕوا ناکـەم بـرای تـۆ بـێ.
کارۆ کەمێکـی دی ژنەکـەی دوور خسـتەوە: ژنەکـە، ڕاسـت دەکـەی ئـەو بـرای پشـتێم نییـە، بـەڵام وەک بـرا خۆشـم دەوێ..... کارۆ هێشـتا دوودڵ بـوو لـەوەی مـەلا بـە ژنەکـەی بناسـێنی.
ئیبتیسـام چۆلەکەیـەک لـە بناگوێـی دەیجریوانـد و شـتێکی نهێنـی پێدەگـوت، ئەویـش بـە کارۆی گـوت: خـودا بـرات لـێ نەسـتێنی، چـۆن خـودای بـە هـەق دەناسـم ئاوهـا دەمزانـی ئـەو مردەڵەیـە بـرای تـۆ نییـە، ئـەوە دەڵێـی هـەر لێیـان دایـە و پـارووە نانێکیشـیان پـێ نەدایـە، لاق و لەتـەری هەمـووی گۆشـتپارە و شـوو شـوو بـووە.
کارۆ هەندێـک ژنـەی لاوانـدەوە، دواتـر بیـری کـردەوە: دوودڵـی بـۆ چییـە؟ پێـی دەناسـێنم خـۆ مـەلا دوژمنـی بابەکوشـتەی ئـەو نییـە.
بەسـەرهاتەکەی ڕۆژی پێشـتری هەمـووی بـۆ گێڕایـەوە: دوێنـێ بـۆ ئـەوەی تفەنـگ و ڕەخـت و چەنـد پاکەتـە فیشـەکێک پەیـدا بکـەم، بـەرەو سەنگەسـەر دەڕۆیشـتم، بینیـم ئـەو پیـاوە لـەو بـەری ڕێگاکـە وەسـتا بـوو، سـەیرم کـرد لـە ترسـان دەلـەرزی، لـە برسـان شـنگی لـە بـەر بـڕا بـوو، لـە تینوێتییـان ببـووە سـێوەرۆکی وشـک، سـۆزم بـۆی جـوولا، دڵـم بـۆی سـووتا سـتۆپێکم گـرت و ڕامگـرت، کـە ڕاوەسـتام و بـە باشـی سـەیرم کـرد ناسـیمەوە،هەرکە ناسـیمەوە باوەشـم بـۆ کـردەوە و خسـتمە نـاو جێبەکـەم و هێنامـەوە، کـە هێنامـەوە و ئـەو دارە وشـکەت بینـی سـەرت سـوڕما و واقـت وڕمـا، کـە گوتـم برامـە زیاتـر حەپەسـای، پرسـیارێک لـە ناخـت دروسـت بـوو، لـە خـۆت پرسـی: ئـەوە لـە کـوێ و ئـەو لـە کـوێ؟ هەقتـە ئـەو پرسـیارەت لـە خـۆت کـرد، چونکـە ئەمڕۆ، لـەو کاتـەی کـە وای دەبینـی هیـچ کامێکمـان بـەوی دی ناچـی، نـە شـێوەمان، نـە هەڵسـوکەوتمان، نـە ئـەوەی لـە ناخمانـدا دەجولـێ. خۆزگـە (١٠) سـاڵ لەمەوبـەر ئـەو پیـاوەت بدیتبوایـە، دەتزانـی چ زیخۆیەکـە، دەتبینـی چ زەلامێکـە، ئـەوەی دەهاتـە ئـەو مزگەوتـە، ئـەوەی دەرو دراوسـێ بـوو، ئـەوەی ئـەو

مەلایەی دەناسی باس هەر باسی ئەو بوو، بەڵێ ئەوە مەلای مزگەوتەکەی بەغدایە، کە من لەلای فەقێ بووم (ئەلف سەر ئا) م دەخوێند.
ئیبتیسام سەرەسوڕەی گرت، تەنها خۆی دواند: گڕگڕ، گڕگڕ ئاقیبەت تووشی ئەو نزیکە بەڵایەی بووینەوە، خوا بە خێری بگێڕێ. دواتر پرسی: ئەوەندە مەدح وسەنای ئەو مەلایەت دەکرد، چی وای لێکرد وای لێبێ؟
_ زولمی زاڵمان.. کارۆ وای گوت.
_ ئەو زاڵمانە بۆ زوڵمیان لێکرد؟ ژنە بە مەبەست ئەو پرسیارەی لە کارۆ کرد.
_ چونکە بێگانە پەرست نەبوو.. کارۆ زانیاری زیاتری لەلا بوو بەڵام هەر ئەوەندەی بە ژنەکەی گوت.
_ چۆن دەزانی بێگانەپەرست نەبوو؟ ژنەکە پرسی.
_ ئەوە نەبوو هەر ئەوانە ئازاریان دەدا کە سیاسەتی بێگانەیان پەیڕەو دەکرد.. کارۆ وای گوت.
_ ئەدی ئەو سیاسەتی کام لای پەیڕەو دەکرد؟ ئیبتیسام بە کارۆی گوت.
مامۆستا کارۆ لە ئاستی تێگەیشتنی ژنەکەی سەری سوڕما، زانی زانیاری زۆری لەو جۆرە بابەتانە هەیە، ئەگەر دیزە بە دەرخۆنەی نەکا خراپتر لە پاشتر، بێدەنگ بوو تەنها خۆی دواند: ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە، با زۆر تیلکی تیوەرنەدەم پڕیشکی بۆ خۆشم دەپەڕێتەوە.
تەنها خەندەیەکی خۆکردی بۆ ژنەکەی کرد: دەڵێن: ئەگەر بەختت هەبێ تەختت دەبێ.
ژنەش بە جۆرێکی دی پەندەکەی بیستبوو: بەڵێ بیستوومە دەڵێن: ئەگەر بە بەختی پاشای سەر تەختی.
مەلا ماوەیەک لە ماڵی مامۆستا کارۆ مایەوە، ئێسقانە ڕەق وتەقەکانی گۆشتیان گرتەوە، ئاخێزێک بە هەر چوار پەلیدا گەڕا، گۆشتپارەکانی پاوپلی، شین و مۆری قاچ قولی و هەموو جەستەی، ڕەنگی ئاسایی خۆیان هێنایەوە، خوێنی شینکەی دەمارەکانی وەکو جاران سوور هەڵگەڕایەوە.
خەلکی گوندەکە و ئەوانەی مامۆستا (کارۆ)یان دەناسی کۆمەڵ کۆمەڵ سەردانی (مەلا)یان دەکرد و لە هەواڵیان دەپرسی، گفتوگۆی نێوانیان درێژەی دەکێشا، چەندین پرسیار لە مەلای دەکرا. مەلا سەرلەبەری بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕانەوە، چیرۆکی مەرگەساتی هاوسەرو کۆرپەکەی، ئەوەی پەیوەندی بە

مزگەوت و (کارۆ)وە هەبوو، مەسەلەی چەکوچ و داسەکە، هۆکاری بەندکردنی و شێوازی ئازاردانی، هەڵوێستی ئەو دادوەرە مرۆڤدۆستەی ڕەوتی دادگاییەکەی بۆ بەرژەوەندی ئەو گۆڕی و بووە هۆی چیدی ئازارنەدانی، ئەو سیخوڕەی ماڵی پاشای کە هەمیشە وەکو کلک بەدوایەوە بوو.
کارۆ کە ئەو ڕستەیەی دوایی بیست، دەوی بردە تەنیشت سەری مەلا و مزگێنی دایێ: مامۆستا ئەو سیخوڕە کۆتایی پێهات.
مەلا بە دەنگی بەرز گوتی: ئەوە نا پەنجای دیکە. سیخوڕ کۆتاییان پێنایەت.
گفتوگۆی نێوانیان بەردەوام بوو، خەڵکەکە سەرنجی جیا جیایان هەبوو، پرسیاری هەمە جۆرو هەمە لایەنەش نەدەبڕایەوە، یەکێک لە میوانەکان دەیگوت: چەکوچ و داس یەکێک دەتوانی خاوەنداریەتی بکا، کە ناولەپی قەڵەش قەڵەش و بەرۆکی بە قرشە و شەرواڵەکەی قرچێ و نووسەنەکی پێوەنوسابێ.. ئەوی تەنیشتی سەرزەنشتی مەلای دەکرد: تۆ بە چەکوچ و داس لە خشتە براوی، واتزانی ئامرازی هێزن، نەتزانی ئەوانە هێمای ڕەنج و تێکۆشانن، ئامرازی دەستی ڕەنجبەر و جوتیارن.. خاوەنی برنۆ درێژەکەی بەرامبەری خۆی هەڵکێشا: خۆزگە (١٠) ساڵ لەمەوبەر دەمناسی بزانە چۆن سەری ئەو زالمانەم پان دەکردەوە..
کلێتە لەسەرەکەش قسەی خۆی کرد: تۆ لە هەڵبژاردنی ئەو ڕێگەیە دوو دڵییەک لە ناختدا هەبوو، بەڵام یان تێدەچی یان دەردەچی پێیدا ڕۆیشتی..
ئەوەی خەنجەرە گەورەکەی لەبەر پشدێنێ بوو دەی خوڕی: بەس پێم بڵێ ئەو زالمەی بەگرتنی دای لە کوێیە هەتا ئەوها و ئیوهای لێبکەم.ئەوەی تەنکە ڕدێنێکی هەبوو ئامۆژگاری دەکرد:ئەوان پێیان گوتی- ئێمە لە مەیدانی جەنگدا ناجەنگین، بەڵکو لە مێشکی مرۆڤەکاندا دەجەنگین- بۆ تێنەگەیشتی؟ تۆ کێشە قورسەکانت بە گوریسێک لە تەنگەی خۆت شەتەک داوە و بە نقەنوق ڕایدەکێشی، دەعبایەکی دڕی بەدبەختیت سواری سەر شانی خۆت کردووە، ڕێگەی هاتی لێ داخستووی و دەرگای نەهامەتی لێ کردوویتەوە. تۆ گوڵی تەمەنت لە نێوان چڕنووکە تیژەکانی دڵڕەقی و ئازارە دەروونییەکانتدا هەڵوەراند. ئەوەی ڕۆی بووە بە سەرهات، ناتوانین هیچ شەمەندەفەرێک پاشە و پاش بگێڕینەوە، گرنگ لەمەو دوایە. چاک بزانە ئەوەی بکەوێ کەس بۆی ناگریێ، پێی پێدەکەنن.
ئەوەندە ئازارو ئەشکەنجەی (مەلا)یان دابوو، ئەوەندە شکۆمەندییان شکاندبوو، ئەوەندە هیواکانیان سەربڕیبوو، ڕقی لە خۆی و لە مرۆڤەکانیش دەبووەوە. بە

جۆرێک لە ژیانیشی بێزار بوو، ئەو پێی وابوو دایکە (حەوا) مارەیی لە باوکە (ئادەم) نەهاتبوو، کتوپڕ چاوی بە مێینەیەک کەوتبوو پەڕی دابوێ و زگی پڕ کردبوو، بۆیە نەوەکانیشیان بەو جۆرە شەڕانگێزن. هەر لە سەرەتاوەش هەردوو کوڕەکەی لە سەر جوانی و ناشیرینی کچە شۆخێکی خوشکی خۆیان یەکدییان کوشت.

بۆیە مەلا بایەخی بە پرسیارەکان نەدا، تاکە وەڵامی بۆ ئەوان ئەوە بوو: تروسکاییەکی گەرم لە هەر شوێنێک بێت، سەرمابردییەکان ڕووی تێدەکەن. ڕووناکییەک لە هەر جێیەک تیشک بداتەوە، شەوکوێرەکان بە ئاراستەیەوە دەڕۆن. ماوەی چەند ساڵێک، لە هاوکاری و هاوتەبایی، لە بەرزی و نزمی نێوان مەلا و مامۆستا کارۆ دوای شەش حەوت ساڵێک، ڕۆژێ لە ڕۆژان کتوپڕ هەورە ڕەشە ترسناکەکان ڕەوینەوە و نەیان گرماند، کوندە پەپووە شوومەکان دەنگیان لە گەروویاندا خنکا و نەیانقڕاند، تیشکی زێڕینی خۆر ئاسمانی زەرد هەڵگەڕاند. ئاسمانی زەرد و زەوی سەوز کە هەورە چڵکنەکانی نێوانیان ڕەوینەوە،دیسان باوەشیان بۆ یەکدی کردەوە. ڕۆژەکان هەموویان بوونە نەورۆز و جەژنی نەورۆزی ئەو ساڵەش بەغدا ی هەژاند.

(کارۆ)و (مەلا) هەریەکەیان بە مەبەستێک سەردانی (بەغدا) یان کرد،گرنگترین خەونی مەلای گەڕانەوە بوو بۆ بەغدا، گەڕانەوە بۆ هەمان مزگەوت، گەڕانەوە بۆ لای (فەتحییە)، ئەو پێی وا بوو قەلەڕەشە سپی بووەتەوە، گەڕایەوە و بە مەلایەتی مزگەوتەکەی جارانی ڕازی بوو، هەندێک گوتیان تاکتیکە و هەنێکیش پێیان وا بوو ستراتیژە، هەر کامیان بوو لە ئێمە دیار نەبوو. ساڵ دەهات و دەڕۆیشت پێنج فەرزە لە منارەی مزگەوتەکەی بە هەموو دەنگییەوە بانگی دەدا، دەنگی کز بوو نەدەبیسترا. نوێژکەرانی پشتە خۆی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نموونەکانی وەک دەروێش ڕەحیم دەیانکردنە دەروێشی خۆیان و دەیانبردنە لای پاشا ،پاشاش وەکو جاران نەما بوو، ئەویش چەکوچ و داسێکی ساختەی لە سەر شانی خۆیدا دانا بوو، هەر بەو چەکوچ و داسە سەری مەلاو هاوڕێیانی مەلا ی دەشکاند و ملی دەپەڕاندن.

# ٢٣

نێرەکەرێکی ئەو سەری دنیایێ زەڕی، بوومەلەرزەیەکی دروستکرد، چیاکانی هەژاند، شاخەکانی ڕووخاند، قوتکە و کەپک و گردەکانی بە یەکدیدا دا، هەرەسی بە ئەسپەکان هێنا، قاسپەی لە گەرووی کەوەکان بڕی، هەزارانی بەستەزمان بوونە ئاردی ناو دڕکان. لەو ڕۆژە تەنگەدا، لە شەشی ئاداری هەزارو نۆسەدو حەفتاو [illegible] دا، لەو ڕۆژە مەرگەساتییەدا، لەو ڕۆژەی میللەتێک بە تەواوی بە چەقۆی کول سەردەبڕا، میللەتێک بە تەواوی ئاوارەی وڵاتان دەبوو، ئەو ڕۆژەی فەرماندە ئازاکانی، فەرماندە مەزن و دڵسۆزەکانی ئەو شکستەیان، ئەو کارەساتەیان، ئەو هەرەسەیان، ئەو پیلانە شوومەیان پێ هەرس نەدەکرا و خۆیان دەکوشت، جەنگاوەرە قارەمانەکان سەریان لێ شێوابوو، ئافرەتەکان ڕەشپۆش بوون و شین و واوەیلایان دابەستا بوو. بەڵێ لەو ڕۆژەدا ئیبتیسام لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو، ماوەیەک لەمەوبەر گەرای (پشتۆ)یەکی دیکەی دانابوو. ژنە سەرەڕای باری گرانی، ترسیشی زۆر بوو، لەلایەک کارۆ بۆ سۆراغکردنی ئەو مەینەتییە و بۆ دڵنیا بوون لە ڕاستی ئەو شکستە، بەرەو سەرەوەتر هەڵکشا بوو، لەلایەکی دیش خەلکی گوندەکە ئەوانەی ماشێن، یان هەر ئامرازێکی گواستنەوەیان هەبوو، ماڵی خۆیان باردەکرد و خۆیان ئامادە دەکرد بەرەو سنوورەکانی ئێران بڕۆن. ئەوانەش کە هیچ لەو ئامرازانەیان نەبوو منداڵی ساواو دەستە جلێکیان بە کۆڵ خۆیان دادابوو، بەرەو سەرەوەتر پەلە پەلیان بوو، لە نێوان هەر کاتژمێرێک و کاتژمێرێکی دیکەدا خەلک دەڕۆیشتن و زۆریشیان بەو گوندەدا تێدەپەڕین، هەندێکیان ورەیان بەرز و هی هەندێکیشیان داتەپیبوو.

خەلکی گوندی، ئیبتیسام و مامۆستا کارۆ یان زۆر خۆشدەویست، بەبێ ئەوان ڕێیان دەرنەدەکرد، بە تایبەتی ئەوانەی ماشێنیان هەبوو، داوایان لە ئیبتیسام دەکرد لە گەڵیان سواری ئوتومبێل بێت و بڕۆن و گوندەکە بەجێ بهێڵن. کەچی ئیبتیسام خەم کردبوویە گلۆڵە، قەلەڕەشەی ترس خستبوویە ژێر باڵی خۆی، لەوە دەترسا نەوەک لە ڕێگا کارۆ لە پەلە پەلییان ئوتومبێلەکەی وەرگەڕابی، یان تووشی گرفتێکی لابەلا بووبی، ئەو بە خەلکەکەی دەگوت: من چۆن دەڕۆم و خۆم ڕزگار دەکەم تاکو چارەنووسی کارۆ نەزانم.

سەریاری ئەوەی کارۆی مێردی نەگەڕابووەوە، ئیبتیسام بیری لەوەش دەکردەوە و

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: چۆن دەبێ بەبێ کارۆ برۆم، ئەو هەموو پارەیەی مولکەکان لە ماڵەوە شاردراینەوە، دەترسم لەگەڵ خۆمیان ببەم، کێ دەیانپارێزێ، متمانە بە کێ بکەم.
لەو ئان و ساتەدا، لە کاتێکدا ئیبتیسام بەرەژانی دەهاتێ، ناڵە ناڵ و خۆ کوشینی بوو، پێچی دەکردەوە، خەندەی کچی بۆی دەگریا، ژنانی گوندی ئەوانەی لەو بابەتانە شارەزابوون دەوریان دابوو، هەر یەکەیان ڕاوسەرنجی خۆی دەردەبڕی، لە کاتێکدا خەلک هەمووی تێکدەقژقژان، کەس نەدەبووە برای کەس، بە پانتایی شەقامەکان و زیاتریش هەر بابایە پەلی منداڵەکانی گرتبوو، بەرەو هات و نەهات، بەرەو چارەنووسێکی نادیار، بەرەو شوێنێک کە سەرچاوەی مەرگەساتییەکە بوو، بەرەو وڵاتێک دەرۆیشتن کە لە شکست و هەرەسهێنانەکە لایەنی سەرەکی بوو.
بەڵێ لەو ئان و ساتەدا خەلکی گوندی، ژن و پیاویان، پیرو گەنجیان، هەتا منداڵەکانیان کە قوتابی مامۆستا کارۆ بوون پێیان لەبەر پێ نەدەنا برۆن، چاوەڕێی ڕزگاربوونی ئیبتیسام و گەڕانەوەی مامۆستا کارۆ یان دەکرد، زۆری پێچوو نە ئیبتیسام ڕزگار دەبوو نە مامۆستا کارۆش دەگەڕایەوە. خەلکی گوندی دەستیان لە چۆکان وەرینابوو، پلکە (زارێ) لە سەرە ژنەکانی دەپرسی: ئەرێ چی بوو ڕزگارتان نەکرد؟
خوشکە (هەرمێ) وەڵامی دەدایەوە: قەت شتی وام نەدیتییە ئەوە یەک.
(خەجێ) خۆی ئازا دەکرد، دەیگوت: هەر ژنەک لەو گوندەی ژانی منداڵبوونی هاتبیتێ، بە دوو سێ قوەتان ڕزگارمان کردییە.
(مام عەلی) لە دوورەوە خەفەتی بۆ دەخوارد، پەلە پەلیشی بوو بۆ رۆیشتن، هاواری دەکرد: کچێ ژنینە نیوەتان مامانیتان کردییە، زوو ئەو بەستەزمانەی ڕزگار بکەن.
(کاکەولا) دەینەڕاند: ئای لەو ڕۆژە ڕەشەی، وەرە دختۆرەک، سستەرەک، خەستەخانەیەک نەبی، هەمووی پایدۆستیان لێکرد و ڕۆیشتن، ئەی هاوار هەیش.
(شێخە)چاوی تیژ بوو، سەیری لای سەرەوەی کرد: هەها کوڕینە، جێبەکی گەورەحەشاماتەکە دادڕ دادڕ دەکا و بە پێچەوانەی خەلکەکە بەرەو ئێرەوە دێ.
(مام عەلی) پاڕایەوە: خودایە مامۆستا کارۆ بی.
(کاکەولا) لە گەنجەکانی خوڕی: گەنجینە ئەنگۆ چاوتان تیژە، جوان تەماشاکەن بزانن هەوە.

هەموو تێکڕا هاواریان کرد: بەڵێ هەوە، بەڵێ هەوە.
کارۆ بەسەر مەرگەساتییەکەدا هاتەوە، بە پەلە چ پارەو پووڵ و شتی گرانبەها و دەستێک جل و هەندێ خواردنی بارکردە ناو ئوتومبێلەکە، چەند ژنێک یارمەتی (کارۆ)یان داو (ئیبتیسام)یان بارکردە ناو پشتەوەی ئوتومبێلەکە، دوو ژنە مامانی باشیش لەملا و لەولای سواربوون، هەر بە پەلەش کارۆ سولفی لێداو جێبەکەی بە گڕدا و ڕۆیشت. ڕۆیشتنی چی؟ بە نیو کاتژمێر کیلۆمەترێکیان نەدەبڕی، شەقامی ماملتۆن پڕ سوارو پیادە بوو، باسی ڕۆژی حەشرو پردی سیرات دەکەن لەو چەشنە بوو، خەلکی برسی تێنوو، بێ سەر، بێ ڕێنیشاندەر، بێ فەرماندە، بێ سەرکردە، بە بێ هیوا بە گریان، بەڕۆ ڕۆ، بەلاکەلاک دەڕۆیشتن، پێیەک لە پێش دوو لە پاش نەیان دەزانی بۆ کوێ بڕۆن، ڕاستیان دەبیست، درۆیان دەبیست، باوەڕومتمانە لەو دەڤەرە باری کردبوو. چەک فڕێدەدرا، چەک دەشکێندرا، چەک لە یەکدی ڕادەکێشرا، چەک لولەی لەخۆ دەکرا، چەک باوی نەدەما، بڕنۆیەک بە یەک جغارە دەفرۆشرا، کلاشینکۆف و سەمینۆف ببوونە پەڕۆی بەگوو.
لەناو هەر چەند خولەکێکدا (کارۆ) بانگی (ئیبتیسام) ی دەکرد: ژنەکە مەترسە، هەندەمان نەمایە بگەینە چۆمان، لەوێ بنکەیەکی تەندروستی هەیە. ئیبتیسام تەنها منگەیەکی دەکرد و هیچی دی نا.
گەیشتنە چۆمان، نەبنکەی تەندروستی و نەچش، ناچار بە لۆفەکانی ئازادی بەرەو حاجی ئۆمەران سەرکەوتن.. لەپڕ یەکێک لە ژنە مامانەکان کردییە چریک و هۆڕ: کورە مامۆستا کارۆ ڕاگرە قوڕت بەسەر بوو، ماڵت کاول بوو.
مامۆستا کارۆ ئوتومبێلەکەی ڕاگرت: ها چی بووە؟
_ ژنەکەت، خێزانە نازدارەکەت، دایکی منداڵەکەت زەرد هەڵگەڕایە.. ژنە مامانێکیان وای گوت.
ئافرەتە مامانەکەی دووەم دەستی لەسەر دەمارەکانی ملی ئیبتیسام دانا، گوێی لە لێدانی دڵی گرت، نە هەستی بە هیچ کرد و، نە گوێی لە لێدانی دڵی بوو: مامۆستا بەقوربانت بم تەواو بووە.
مامۆستا کارۆ شێت و هار بوو، ئوتومبێلەکەی بە پەشۆکاوی دایە ڕۆخی شەقامەکە، هەر لە شوێنەکەی خۆی ئاودیو بووە پشتەوەی ئوتومبێلەکە، باوەشی لە ژنەکەی وەرینا، دەستی لەسەر دڵی دانا، سەری خستە سەر سینگی و گوێی بە دڵیەوەنا، ترپەیەکی نەبیست کردییە دادوفیغان، لەگەڵ کچەکەی دەستیان لە ملی یەکدی کرد

و پێکەوە گریان، دادی نەدان (ئیبتیسام)، دایکی (خەندە) کۆچی ئەبەدی کرد.
کارۆ بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا بەو توندییە، بەو دڵسۆزییە، بەو بارانی فرمێسکانە دەگریا، ئەو ڕۆژە ئاسمانیش دەگریا، فرمێسکەکانی ئاسمان ڕووباریان پێهەڵدەستا، کارۆ بۆ ژنەکەی و ئاسمانیش بۆ میللەتێکی ستەمدیتەی بەدبەختی خێر لەخۆ نەدیتی دەگریا، کارۆ ڕۆڕۆی دەکرد، ئاسمانیش لە هاڕژنی دەدا. ژنانی گوندی شینیان دابەستا بوو، پیاوەکانیش فرمێسکیان دەباراند.
نەک هەر ئیبتیسام، زۆر کەسی دیش ژیانیان کۆتایی پێهات، یان کۆتاییان بە ژیانی خۆیان هێنا، شۆڕشێک تەمەنی بە قەد کچێکی ڕەسیو بوو، تەواو گەیی بوو، لەسەر پێی خۆی ڕاوەستابوو، جێگەی ئومێدی نەتەوەیەک بوو، بە یەک فیکە ڕووخا.
بەڵێ بە فیکەی عیزرائیلێک دوو ڕوح پێکەوە دەرکێشران، ڕوحی ئیبتیسام و ڕوحی شۆڕشێکی گەورە، هیوای گەلێک کوژرا.
خەلکی گوندی، بەتایبەتی پیاوەکان دەورەیان لە کارۆ ی دا، پێشنیاریان دەکرد لە گۆڕستانی ئەو گوندە ئیبتیسام بشاردرێتەوە، ئەوان پێیان وابوو هێشتنەوەی تەرم بۆ ماوەیەکی زۆر گوناحە، کەچی کارۆ بەوانی دەگۆ: برایان، خوشکان ئێوە هەمووتان کەس و کاری منن، گوندەکەشتان گوندی منە، هەموو بستێکی خاکی ئەم وڵاتەش خاکی منە. بەڵام ئیبتیسام وەسیەتی کردبوو دەبێ لە شاری نەجەف بشاردرێتەوە، جێبەجێکردنی وەسیەتنامەکەی ئەرکە لەسەر شانی من، بەڵام لەو ڕۆژە ڕەشەی ئەو وەسیەتنامەیە جێبەجێ ناکرێ. خزمینە ئێوە بڕۆن، من یەک هەنگاو ئێرە بەجێ ناهێڵم، با سوپای عێراق بەسەر پشتی من تێپەڕێ و من و (خەندە)ی کچیشم لەتەنیشت ئەودا بکوژرێین، مانەوەو نەمانمان وەکو یەکە، کە ئەو ڕۆیشت ئێمە بۆچی باشین.
پیاوەکان، ژنەکان هەموویان لە هاڕژنی گریانیان دا، خەمی خۆیان و کارۆ و شۆڕشێک زۆر قورس بوون، نەبەشان و مل، نە بە پشت، نەبەمێشک هەڵنەدەگیران، لە ژێریدا چەمابوونەوە، چاریشیان نەبوو دەبوایە خۆیان ڕزگار بکەن، پیاوە هەرە ئاقڵەکەیان خۆی پێنەگیرا: مامۆستا ئەتوو چ دەڵێی، کوو بەجێت دەهێلین عەسکەر بەسەر پشتت دا بڕوا.
ژنێکیان گوتی: مامۆستا هیمەتت هەبی، بە مقەدەری خوای ڕازی بە، شوکری خوای بکە با گوناحبار نەبی.
ئاقڵمەندێکی دیکەیان لە کارۆ نزیک بووەوە، پێشنیارێکی لەبارو گونجاوی کرد:

ماموستا خۆ دنیا هەر ئەورۆ نییە، سبەش هەیەو دووسبەش هەیە، باجارێ لێرە بیشارینەوە، دوای ماوەیەکی دی ئەگەر دنیا خۆش بووەوە و گەڕاینەوە، ئەوە ئەو وەختی دەیبەینە ئەو شارەی ئەتوو دەڵێی، ئەگەر هیچ تروسکاییەکیش لۆ خۆشی نەبوو، ئەمە شارەزای مەنتیقەی خۆمانین چەند زەلامەک بە دزی دێین، لە گۆڕەکە دەری دەینین بە قاچاخ دەیگەینینە ناو ئێران، ئەتووش ئەو کاتی لەڕێی ئێرانەوە بینێرە ئەو جێیەی پێت خۆشە.
کارۆ لە ژێر ئەو هەموو فشارو داواکاری و پێشنیارانەدا کەمێک نەرمی نواند: کەواتە با هەر ئێستا لەگەڵ خۆماندا بیبەینە ئێران و لەوێ بە شێوەیەکی کاتی بیشارینەوە، تا ئەو ڕۆژەی خودا دەرگایەکمان لێدەکاتەوە.
گەنجێک زۆر تووڕە بوو، هەم خەمی ئیبتیسام ی و، هەم خەمی چەکەکەی دەستی بوو نەیدەزانی چی لێبکات، هاواری کرد: خودا کوا دەرگا لە ئێمە دەکاتەوە، هەوڵ دەدەین دەرگایەک بکەینەوە بەسەرمان دادەخەن، ئەویش بەدەنگمانەوە نایێ.
کاکەوڵا دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە: خودایە ئەوان دەمانچەوسێننەوە، لە ناومان دەبەن، دەمانکوژن، کەسمان نییە ئەتوو بە هانامان وەرە.
خەلکەکە هەموویان پێکەوە کارۆیان ترساند: ماموستا قسەکەت بە شەکربێ، بەڵام هەر ئێستا لە مەرزەکە ئاودیو دەبین ناهێڵن بۆ هیچ شوێنێک بڕۆین، هەر لەوێ بەش بەشمان دەکەن، دەمانکەنە ئاردی ناو دڕکان، هەر هەندێکمان بە لایەکدا دەبەن، دەمانخەنە ناو سیمان و دەرگامان بەسەردا دادەخەن، کەسمان نابینە برای کەس.
کارۆ بیرۆکەیەکی زۆر پەسندی بە مێشکیداهات: برایان، هێشتا سوپای عێراق نەهاتۆتە ئەم ناوچەیە، لێبوردنی گشتیش هەیە، منیش ناسنامەی نیقابەی ماموستایانم هەیە، هەرچەندە کۆن بووە بەڵام ئەوانەی لە بازگەکان خەلکی دەپشکنن بە زۆری نەخوێندەوارن، بۆیە تاکو لێبوردنەکە تەواو نەبووە تەرمەکە دەگەیەنمە شاری نەجەف و دەگەڕێمەوە، بۆ هەر کوێتان ببەن دەتان دۆزمەوە.
دوای ئەوەی بەرواری ناسنامەکەی- لەلای یەکێک لە شارەزایانی ئەو بوارە - گۆڕی، ئەوەی لەمێشکی دابوو، ئەوەی لەلای خەلکەکە گوتی کردییە کردار، (ئیبتیسام) ی لە شاری (نەجەف) بە خاک سپاردو بەر لەوەی لێبوردنەکە تەواو بی گەڕایەوە.

## ٢٤

مانگی نەورۆزی ئەو ساڵە شوومە بوو، ئێرانیەکان نەورۆزیان دەکرد، بەلام کوردانی ئێراق بێ چاوو بێ گوێ و بێ سەر بە ناویاندا دەڕۆیشتن.
لەو ئۆردوگایەی کارۆ و (خەندە)ی کچی لێبوون، کوڕێکی قۆزی تەمەن بیست ساڵی قەلەم و کاغەزێکی بە دەستەوە گرتبوو، ئەو خواردن و کەلوپەلانەی لەلایەن خێرخوازێکەوە ناردرابوون، بەسەرئاوارەکانی دابەش دەکردن، گەیشتە لای مامۆستا (کارۆ): ناوت چییە؟
_ کارۆ.
_ مامە گیان (کارۆ) وا تە چی؟ کوڕە لە مامۆستا کارۆ ی پرسی.
_ چ کارت پێی هەیە؟ کارۆ لێی پرسی.
_ باوکم هەمان ناوی لە قەبەر کراوە، دەمەوێ بزانم..... کوڕە بە مامۆستا کارۆ ی گوت.
مامۆستا کارۆ ئەو ناوەی زۆر پێ سەیر بوو !!بەلام لەوەش سەیرتر ئەوە بوو کە لە ناوی کوڕەی پرسی: ناوی خۆت چییە؟
_ (زەندی).. کوڕە ناوی خۆی بە مامۆستا کارۆ گوت.
هەرچەندە تەمێکی گوماناوی بەری چاوی مامۆستا کارۆ ی گرت، بەلام لەو کتوپڕەدا نەیدەویست لە ناو ئەو تەمە گوماناویەدا سەرەداوێک بدۆزێتەوەتەنها خۆی دواند: ڕێکەوتێکی سەیرە، ناوی خۆی (زەندی)و باوکیشی (کارۆ)یە.
_ دایکت ماوە؟ لە کوڕەی پرسی.
_ بەڵێ ماوە.. کوڕە وەلامی دایەوە.
_ دایکت ناوی چییە؟ لە کوڕەی پرسی.
_ دایکم ناوی (غەزال)ە، ناوی دایکمت بۆ چییە، ناسنامەی باری شارستانیم بۆ دەردەهێنی؟ کوڕە زۆر پەرۆشی ئەو ناسنامەیە بوو بۆیە وای گوت. بەلام مامۆستا کارۆ لێی پرسی: بۆ بەم تەمەنەتەوە ئەو ناسنامەیەت نییە !؟
کوڕە وەلامی دایەوە و خەمبارییەکیشی پێوە دیار بوو: نەخێر نیەتم.
مامۆستا کارۆ بڕوای پێکرد، تەمی خەمیش بەری چاوی گرت، لە خۆشی

پرسی: وەک بەندکراوێک لە ناو ئۆردوگایەکی داخراودا چیم پێدەکرێ بۆی بکەم؟. نەک هەر ئەو پرسیارە، زۆر بیریشی لێکردەوە: خۆزگە پێم دەکرا شتێکی بۆ بکەم. بەڵام هێشتا ڕستەیەک نیشانەی پرسیار لە مێشکیدا ما بوو: تۆ ئێرانی یان ئێرا قی؟

کوڕە ڕووی لێوەرگێڕا: ئەو هەویرە ئاوی زۆری دەوێ.

_ هەتا هەویرەکە بە باشی نەشێلی چۆن بیکەمە نان؟ مامۆستا کارۆ پێی گوت.

ئەویش بە مامۆستا کارۆی گوت: ئەگەر هیچت پێنەکرێ بۆ ئەو کۆنە (کا) یە بەبەر (با) بدەم و هیچیشمان دەست نەکەوێ !؟

_ ئەگەر (کا) یەکە جوان شەنەبا نەکەی چۆن (دان)ە کەی لێ جیا دەبێتەوە.. کارۆ بە کوڕە گەنجەکەی گوت.

_ چی دی تا قەتی مەتەلۆک و پەندانم نییە، خۆت ئاوارە و دەربەدەری، چیت بۆ من پێدەکرێ؟ کوڕە ئەوەی گوت و ڕۆیشت.

کارۆ مەرەقی کرد، ئەوڕۆژە زۆر ماندوو بوو، لەلایەک لە ناشتنی ئیبتیسام لە نەجەف گەڕابووەوە، لەلایەکی دیش دەبوایە (خەندە) ی کچی بە تەنیا بەجێ بهێلی و هێشتا پشتی بە کەس قایم نەبوو، لە دڵی خۆی دا وابیری کردەوە: با ئەمڕۆ وازی لێ بهێنم، دیارە کارەکەی لێرەیە بەیانی دوو بەیانیش هەر دەگەڕێتەوە ئێرە. بیری خۆی چڕتر کردەوە: باوکی ناوی (کارۆ) یە، ئەو هەموو شارانەی ئێران بگەڕێی کارۆیەکی دی تێدا نییە. دایکی ناوی (غەزال)ە، غەزال واتە مامز، کوڕەش ناوی (زەندی)یە.

زانیارییەکی دیکەش لە مێشکیدا کاریگەری هەر مابوو: مامز ئەو بەیانییەی لە نانەواخانەکە منی بینی پێی گوتم: ئەوەی ناو زگم لەتۆیە، ئەگەر زگەکەم کوڕ بوو ناوی لێدەنێم (زەندی).

هیچ کۆسپێک لەکەللەیدا نەما، بڕیاریدا: بۆ هەر کوێ بڕوا بە دوایدا دەڕۆم تاکو ماڵەکەی دەدۆزمەوە.

کوڕەش لە گەڕانی بە ناو ئۆردوگاکاندا دیار بوو مەبەستێکی هەبوو، بۆیە لە هەموو ماڵە ئێراقیەکانی دەپرسی، هەر زانیارییەکی گونجاوی دەست بکەوتایە دەیگەیاندە دایکی. ئەو ڕۆژەش کە گەڕایەوە ماڵەوە، وردەکاری هەموو ئەو ناوانەی نووسیبووی گەیاندییەوە دایکی. دایکی کە ناوی کارۆ ی

بیست خورپەیەک کەوتە ناو دڵی، لێی پرسی: ئەو (کارۆ)یەی تۆ باسی دەکەی بە مەزەندە تەمەنی چەند دەبوو؟
_ لە چلی زیاتر بوو.. کوڕەکە وای مەزەندە کرد.
_ سەلت بوو یان ژن و منداڵی هەبوو؟ دایکی لە کوڕەکەی پرسی.
_ ژنی نەبوو، بەڵام کچێکی لە گەڵدابوو.. کوڕەکە گوتی.
دایکی زۆر پرسیاری دیکەی لێکرد، دەربارەی ڕەنگی دەموچاوی، بەژن و باڵای، قەڵەوی و لاوازی، شێوازی قسە کردنی، هەتا جلوبەرگیشی: چی لەبەر بوو؟
کوڕە گەنجەکە وەڵامی دایکی دایەوە:ئەفەندی بوو، سەترە و پانتۆلی لەبەردا بوو.
دایکی کوڕەکە وەک بڵێی هەلەیەک لە وەڵامی کوڕەکەیدا هەبێت، ساتمەیەکی کرد: خۆ سەهوو نی؟
_ نەخێر، بەو دوو چاوانە بینیم.. بە دایکی گوت.
دایکی پێی گوت: کوڕم، بەیانی پارەت دەدەمێ بڕۆ بازاڕ، مامزێک بکڕە بۆی ببە، پێی بڵێ: لەبەر ئەوەی تۆ ئاوارەی ئێراقی، دایکم ئەوەی بە دیاری بۆ ناردووی، هەروەها پێی بڵێ: حەزدەکەم سەری ببڕی و من و تۆ پێکەوە گۆشتەکەی بخۆین، ئەگەر سەری بڕی یان سەری نەبڕی وەرەوە ئاگادارم بکەوە.
کوڕەکە لە تەگبیرەکەی دایکی سەری سوڕما، بەڵام بەبێ سین و جیم جێبەجێی کرد، مامزێکی مێیەی بۆ کارۆ برد: مامە دایکم ئەم مامزەی بۆ تۆ ناردووە،دەبێ سەری ببڕی پێکەوە گۆشتەکەی بخۆین.
مامۆستا کارۆ مامزەکەی لێوەرگرت، ماچی کرد: کوڕم، ئەم مامزە هی سەربڕین نییە، ئەوەی دایکت ناردوویەتی گۆشتی ناخورێ.
مامۆستا کارۆ دڵنیا بوو، ئەو کوڕە کوڕی خۆیەتی و دایکیشی ناوی (مامز) ە، بۆ ئەوەی لێرە نەیناسنەوە ناوی خۆی گۆڕیوە، لەکوڕە گەنجەکەی پرسی: لە کوێ دادەنیشن، بە چی دەژین؟
_ لە ناو ئەو شارەی (کوڕەکە دەستی بۆ شارەکە درێژکرد) نیشتەجێ بووینە، ڕۆژانە من و دایکم کاری سەرپێیی دەکەین و ژیانمان دەگوزەرێنین....
وەڵامی کوڕە بۆ کارۆ.

مامۆستا کارۆ بە ئاسانی وازی لێنەدەهێنا، هەر لێی دەپرسی: بۆچی کارێکی ڕەسمی حکومەتتان نییە؟
کورە بە خەمبارییەوە، وەڵامی دایەوە: دایکم دەیگوت ئێمە خەڵکی ئێراقین، کەسوکارمان هەموویان لە ئێراقێنە، خەڵکی گەڕەکەکەشمان هەر وامان پێدەڵێن، من لێرە لە دایک بوویمە کەچی هەر بە ئێراقیم دەزانن. ئەوەی ئێراقی بێ کاروباری حکومەتی پێناسپێرن.
مامۆستا کارۆ، کچەکەی خۆی و (زەندی)شی بەگەڵ خۆیداو لە گوندێکی دەوروبەری ئۆردوگاکە کارە بزنێکی پرگۆشت و گەورەی کڕی و دایە (زەندی): کوڕم، ئەو (کار)ەی بۆ خۆتان ببە و بڵێ دایکت بیکاتە خێری دەروێشە فشە کە ماوەیەک لەمەوبەر بە دۆزەخیان گەیاند.
هەردووکیان- مامز و کارۆ- نە کار مامزیان سەربڕی و نە کار بزن، لە یەکدی گەیشتن، بە یەکدی گەیشتن، سەرەتا چوار قۆڵی و دواتریش دوو بە دوو پێکەوە دانیشتن، نە مامز ئەو هەڵەشەی پێشان بوو، نە کارۆش وەک ئەو کاتی لە بەغدا بوو شەرمن مابوو، بەبێ پەردە یەکدییان دواند، سەرەتا مامز دەستیپێکرد: ئەو بەیانییەی لە نانەواخانەکە یەکدیمان بینی و بەڵێنمان بە یەکدی دا لەلای بنەدارە گەورەکە یەکدی ببینین، تۆ بەڵێنەکەت نەبردە سەر، کە تۆ نەهاتی...
کارۆ یەکسەر پێی بڕی: هەموو تاوانەکە مەخەرە سەر من، هاتم تۆ لەوێ نەبووی.
مامز بیری هاتەوە: بەڵێ وایە، ئەو شەوە خەڵکیان ترساند، حکومەت خۆی خەڵکی ئاگادار دەکردەوە ئەو شوێنانە بەجێ بهێڵن کە لە نزیک ڕووباری دیجلەن لەبەر ئەوەی لافاو هەڵدەستێ، کەسێک لە گەڕەکی ئێمە نەما، هەر خێزانە و بەلایەکدا پەرت و بڵاو بوونەوە.
_ مامۆستا کارۆ مامزی قەردار کردەوە: کەواتە تۆش ڕۆیشتی و بەڵێنەکەت نەگەیاندە سەر.
مامزیش دەربارەی ئەو بەیەکدی نەگەیشتنەیان بیانووی هەبوو: نەخێر بەو جۆرە نەبوو، ڕاستە یەکەم جار بە ناچاری لەگەڵ دەروێشە فشە ڕۆیشتم، بەڵام دواجار لەکات و ساتی ژوانەکەمان بە تەنیا گەڕامەوە، کە گەڕامەوە هەموو سەرە کۆڵانەکان بە پۆلیس گیرا بوون، هەتا بن دارە گەورەکەش

چەند پۆلیسێکی لێ ڕاوەستا بوو، ناچار بووم بگەڕێمەوە دواوە و لەلای نانەواخانەکە خۆم دایە پەنایەک و ماوەی یەک کاتژمێر چاوەڕوانم کردی، گوتم ئەوە خودایەو بە ڕێکەوت بەوێ دابێی، کەچی بە نائومێدی گەڕامەوە و دەستم لە تۆ شوشت.
_ ئێ دواتر.. کارۆ بە مامزی گوت.
مامز وای پێوە دیاربوو وەکو پێشان نەمابوو: ئەفەندی دە ئەوەی لێگەڕێ، چییە دەبینم گۆڕای، کورتەک و شەروارت فڕێ دایە سەترەو پانتۆرت بە سەر خۆتدا هەرکێشایە؟
کارۆ کە ئەو خاویلکەییەی لە مامز بینی، ئەویش بە ساردی پێی گوت: تۆش ئەوەی لێگەڕێ، وەختی ئەو بابەتەی نییە.
_ بلە یا وەختیتی دیارە کوردایەتی ماوەی بەسەرچوو، خۆتان لە پەنای ئەو جلە تەسک و تریسکەی دەشارنەوە.. مامز پێی وابوو لەبەر خۆشاردنەوە ئەو جۆرە بەرگەی پۆشیوە.
_ کوردایەتی چی، ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ.. کارۆ وای گوت.
_ هەرەس و هێنا؟ مامز پرسی.
_ هەرەس بوو، شکست بوو، هەر ناوێکی لێدەنێی لێی بنێ.. کارۆ گوتی.
لەو کاتەدا کە ئەوان هەردووکیان لەو گفتوگۆیە چڕوپڕەدابوون، لە دەرگای ماڵی مامز درا، مامز دەرگای کردەوە، ژنێک و منداڵێکی (دە دوازدە) ساڵی لە دەرگا وەستا بوون، ژنە قوڵپی گریان لە ئەوکی دا مابوو، بە چاوی سوور هەڵگەڕای سەیری مامزی کرد: خۆم و ئەم منداڵەم لە سەر سنوورەوە، سێ شەوو سێ ڕۆژە بە پێیان دەڕۆین، هیلاک و ماندووین، ئەگەر هەبی یەک دوو نان و جامیلکەیەک ئاومان بدەیێ.
مامز فەرمووی لێکردن: فەرموون وەرنە ژوورەوە دانیشن، با ماندیتان بحەسێتەوە.
کە هەردووکیان چوونە ژوورەوە و نزیک بوونەوە، منداڵەکە هەر بە غار تاوی دایە مامۆستا کارۆ، دەستی ماچ کرد و بانگی دایکی کرد: دایە دایە ئەوە مامۆستا کارۆی خۆمانە.
مامۆستا کارۆ لە باوەشی خۆی گرت، چەند جارێک ماچی کرد، دەستی بەسەریدا هێنا، لە تەنیشتە خۆی داینا، پێی گوتن: ئێوە لێرە بن نەڕۆن

هەر ئێستا من دەگەڕێمەوە.
مامز لەو جۆرە بانگ کردنەی منداڵەکە و لەو گرنگی پێدانەیان لەلایەن کارۆ، سەری سوڕما. لە ژنەکەی پرسی: مێردت نییە؟
_ نەخێر، لە دارەتی دنیایێ ئەو تاقە کوڕەم هەیە.. ژنەکە وای وەڵام دایەوە.
مامز پێی گوت: دیارە ئەو پیاوەی دەناسن؟
ژنەکە گریا: ئەوە مامۆستای منداڵەکەمە، پیاو نییە شان لە شانی مامۆستا کارۆ بدا، بە خۆی چەند پیاو بوو، ژنێکی هەبوو لە زۆر پیاوان پیاوتر بوو.
_ ئەدی چی بەسەر هات؟ مامز لە ژنەی پرسی.
ژنەکە دیسان هەر بە گریانەوە: بڕێم چی بەسەر هات، ئەوەی بەسەر ئەودا هات یاخوا بەسەر کافریش نەیێ.
_ کوژرا، سووتا، هەر نەتگۆت چی بەسەر هات؟ مامز دەیویست دڵنیا بیت.
ژنەکە زیاتر گریا: ئەو ڕۆژە ڕەشەی بە سەر میللەتی کورد داهات، ئەو هەشبەسەرەی بە دوو لا گرتەوە، لەلایەک هەرکەسەو ئاگای لە برای خۆی نەمابوو، لە لایەکی دیش مامۆستا ئیبتیسام لەسەر ڕۆژو سعاتی خۆی بوو، هەرچەندە هەوڵمان دا و بە دەوریدا گەڕاین و سووڕاین پێمان ڕزگار نەکرا، لەسەر مندارەکەی شەهید بوو.
ژنە دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ناورایەوە: خودایە لۆ خاتری خۆشەویستی خۆت بە شەهیدی بنووسی.
_ ژنەکەی ئەو پیاوەی مامۆستا بوو؟ مامز پرسی.
ژنەکە گوتی: نا، بەس خیندەوارییەکی باشی هەبوو، هەروەها خۆبەخشانە برینپێچیشی لە بۆ خەلکی گوندی دەکرد.
مامز تێگەیشت، لە دڵی خۆیدا لێکی دایەوە: ئەو ژنە درۆزنە دەیویست لەخشتەم ببا دەیگوت کارۆ برامە، دەرکەوت بە تەمای بوو مێردی پێبکا، هەر لەبەر ئەوەش لەسەری بەشیر بوو، هەروەختبوو حەیای من ببا.
هەر لەو کاتەشدا مامۆستا کارۆ گەڕایەوە، چەندین جۆرە خواردن و میوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو، هەمووی لە بەردەمی دایک و کوڕەکەی دانا:

فەرمـوون نۆشـی گیانتـان بـی، شـەرمێ مەکـەن ماڵـی خۆتانـە.
تـا ئـەو کاتـە خەنـدە و زەنـدی لـە ماڵـەوە دەرچووبـوون و بـە نـاو شـاردا دەگـەڕان. گەڕانـەوە، خەنـدە چـاوی بـە منداڵـە هاوتەمەنەکـەی خـۆی کـەوت: باوکـە گیـان، ئـەوە (پشـتیوان) ی هاوپۆلمـە، تـۆ هـەر نەتدەگـوت ئـەو کـوڕە براتـە؟. کارۆ بـە کچەکـەی خـۆی گـوت: بەڵـێ ئێسـتاش هـەر براتـە کچـم.
خەنـدە ڕۆیشـت لـە تەنیشـت پشـتیوان دانیشـت، بـۆ ئـەوەی شـەرمی بشـکێنی چەنـد پـارووە خواردنێکـی لەگەڵـدا خـوارد، کـە تێربـوون و خواردنەکەیـان بـە زیـاد کـرد، دوو دوو، پێکـەوە دانیشـتن و سـەربردەی خۆیان بـۆ یەکدی گێڕایەوە.
مامـزو کارۆ کەمێـک دوور کەوتنـەوە، ئەگەرچـی هەردووکیـان تەمەنیـان لـە چـل سـاڵی تێپەڕاندبـوو، لـە ڕووی حـەزو ئارەزووەکانیشـیان وەک جـاری جـاران نەمابـوون، بـەڵام یـادگاری شـەوانی نـاو حەسـارەکە و دابڕانـی چەندیـن ساڵەی نێوانیـان لـە یەکـدی نزیـک کردبوونـەوە، هەریەکەیـان بـە پەرۆشـی ئـەوە بـوو لـە گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەکانی خـۆی دەستپێشـخەر بـێ، دیـار بـوو مامـز بـە پەرۆشـتر بـوو، خێـرا دەسـتیپێکرد: کـە لـە نـاو حەسـارەکە لـە یەکدییـان جیاکردینـەوە و لـە لای نانەواخانەکـەش بەڵێنمـان بـە یەکـدی دا، کەچـی لافاوەکـە نەیهێشـت بـە یەکـدی بگەیـن، دوای چەنـد ڕۆژێـک مانـەوەم و بـێ هیوابوونـم لـە دیتنـی تـۆ، دەرویشـە فشـەم تەنگاو کـرد بگەڕێینـەوە گوندەکـەی خۆمـان، خـۆ گەڕانـەوەش ئەوەنـدە ئاسـان نەبـوو، هەمیشـە ناخـم دەسـووتا، هەنـاوم کوتـە کوتـی بـوو ئەگـەر پەلـەم نەکردبایـە دەپەندمـام. شـەوانە پلانـم دادەنـا، پـلان لـە دوای پـلان، هەندێکیـان شکسـتیان دەهێنـا. ناچـار بـە دوای پیلانـدا گەڕام..سـێ پیلانـم لەمێشـکی خۆمـدا داڕشـت: یەکەمیـان ئـەوە بـوو منداڵەکـەم لـە بـار ببـەم، لـە وەیانـدا بـە شـەو بڕیـارم دەدا بـە ڕۆژ پەشـیمان دەبوومـەوە، دڵـم بەروەسـتی نـەدەدا- ڕوحێـک خـودا پێـی داوم- مـن بیکوژم، بـە تایبەتیـش بـە ویسـت و ئـارەزووی خـۆم هاتبێتـە بـەر. دووەمیـش ئـەوە بـوو بەتەمابـووم خـۆم بسـووتێنم، لەوەشیاندا لەبەرخاتـری ڕوحـی منداڵەکـەم شکسـتم هێنـا. بـەڵام لـە کۆتاییـدا سـێیەم پیلانـم پەسـند کـرد، ئەویـش ئـەوە بـوو بەهـۆی ژن و مێردێکـەوە کـە زۆر متمانـەم پێیـان هەبـوو، بمگەیێننـە ئـەو گونـدەی (زەنـد) یـان پەرگەنـدەی ئـەوێ کردبـوو، زەنـدی ئـەو کـوڕە بـوو کـە لـە شـەوانی نـاو حەسـارەکە بـۆم بـاس کـردی- هـەر لـە منداڵـی تاکو گـەورەش

بووین- خۆشم دەویست. ئەو گوندەی زەندی لێبوو لەسەر سنووری ئێران بوو، زۆریش دوور بوو، بەڵام ئەو پیلانەم، یان پلانەم، بە باشترین چارەسەر دانا. ئەو پارەو زێڕو زیوە تایبەتییەی خۆم هەمبوو، هەموویانم لە ناو جانتایەکی دەستی دانا، دەستەیەک جلوبەرگم لە ناو بوخچەیەک کرد و پێچامەوە، دەستم لە هیچ شتێک نەدا کەتایبەت بێ بە دەروێشە فشەی مێردم، بەم جۆرە بۆ چرکەساتی دەستپێکردنی پلانەکە بە تەواوی خۆم ئامادە کرد.

کارۆ تیق و سیقی کردبوو، مەزەندەی خراپی دەکرد بۆیە پرسی: ئێی دواتر؟

مامز سەیری ڕوخساری کارۆ ی کرد هەڵبزڕکابوو، بەڵام لە سەر قسەکانی بەردەوام بوو: مانگێک بەسەر زگپڕیەکەم تێپەڕی بوو، شەو درەنگ بوو، بەرە بەری ماڵنوستنان بوو لە دەرگامان درا، دەروێشە فشە لە ماڵ نەبوو لە ماڵی ئاغای تۆبەتە شەوی بوو، بە ترسەوە دەرگام کردەوە ئەو ژنە بوو کە متمانەم پێی هەبوو، سەری هێنایە بن گوێم: مێردەکەت لە ماڵەوەیە؟

پێم گوت: نەخێر، فەرموو وەرە دانیشە.

ئەو گوتی: نا، دانانیشم هەر ئێستا چیت هەیە ئامادەی بکە و با بڕۆین.

خەنی بووم، پێم گوت: ئامادەم.

بە گەڵە خۆیدام، ئەو لەمن شارەزاتر بوو بەلایەکی دا بردم هیچ سەگی لێنە بوو پێمان بحەپی، بەرەو کەندەکەی بەر ماڵانی بردم، کە گەیشتمە ئەوێ سەرم سوڕما چاوم زەقبووەوە، چیم دی؟ پێم وابوو خەونە کەچی ڕاستی بوو کە (زەندی)م دی تفەنگێکی برنۆ بە شانیەوە، خەنجەرێکی دەبان لە بەر پشدێنیەوە، جلەوی ئێسترێکی کورتان کراوی گرتبوو.دەتگۆ بە بیست کەسان پاڵم پێوە دەنێن، دەتگۆ بوویمە تەیرو دەفرم. بەڵێ بۆ باوەشی (زەندی) هاوڕێ و خۆشەویستم فڕیم، ئەو باوەشی نەکردەوە، گوتی تا ئەو مێردەت نەتۆپێنم ناتخەمە باوەشم.

کارۆ پشیەکی هاتەوە بەرێ، لێی پرسی: دواتر چیتان کرد؟

مامز دیسان سەیری ڕوخساری کارۆ ی کرد، بینی گەشایەتییەکی پێوە دیارە، بەڵام ئەو وای نەدەویست، گەرەکی بوو غیرەی ببزوێنی و ڕشتی

بکا، کەمێک شێوازی گێڕانەوەکەی گۆڕی: لە پشتە خۆی سواری کردم، دوای دوو ڕۆژو دوو شەو گەیشتینە سەر سنوور، لە ڕێگا لێم پرسی: کێ خەبەری پێدای بێیە گوندی؟

ئەو هەر ئەوەندەی پێگوتم: مام (عەبدوللا) و خێزانەکەی کەسێکیان نارد.

بەڵێ ئەو ژن و مێردەی متمانەم پێیان هەبوو ئاگاداریان کردبووەوە.

مامۆستا کارۆ بەو گێڕانەوەیە، لەلایەک دڵخۆش بوو چونکە مامز لە کوشتن ڕزگار ببوو، لەلایەکی دیش دڵتەنگ بوو چونکە وای مەزەندە کرد ئەو کوڕە ماوەو مامزیش هەر خۆشی دەوێ، بۆیە بە خەمبارییەوە پرسی: کەواتە ئەو کوڕە لە ژیانتدا ماوە و خۆشت دەوێ؟

مامز پێی گوت: پەلەی مەکە ئێستا وەڵامی ئەم پرسیارە و هەموو پرسیارە بەدگومانیەکانی ناو مێشکت دەدەمەوە، پێم گوتی ئەو هەر لە سەرەتاوە ئامادە نەبوو باوەشم بۆ بکاتەوە، ئەو بڕیاری دابوو تاکو دەڕوێشە فشە لە ناو نەبا و بە شەرعی خوا مارەم نەکا دەستم لێنەدا. ئەو منی لە پێناو گەیشتن بە هەوەس و ئارەزووەکانی خۆش نەدەویست، ئەو بە پاکی منی دەویست. وەکو من و تۆی نەکرد.

_ لەو کارەی لە من و تۆ ڕاست تر بوو، بەڵام ئەگەر وا بوو چۆن بڕیار دەدا پیاوێک بکوژی؟... مامز وەڵامی کارۆی نەدایەوە.

ئێوارە داهات، مەلای مەغریب بانگی دا، کارۆ بە مامزی گوت: بۆ خواردنی ئێوارەخۆت ماندوو مەکە، دەچم لە بازاڕ خواردنتان بۆ دەهێنم.

لێنەگەڕان پشتیوان و دایکیشی بڕۆن، هەموویان پێکەوە نانی ئێوارەیان خوارد، کارۆ دوای نان خواردن هەستایەوە بڕوا، مامز پێی گوت: بۆ کوێ؟

_ دەمەوێ بڕۆم، بەس حەز دەکەم دوو قسانت بزێمێ.

مامز بە گەڵی کەوت، (خەندە)ش بە دوایاندا دەڕۆیشت، کارۆ بە مامزی گوت: پشتیوان و دایکی بۆ چەند ڕۆژێک تاکو چارەیەکیان دەکەم با ئەمانەتی تۆ بن.

خەندە کە ئەمەی بیست گڕناگەی داگرت: باوکە گیان منیش لەگەڵ پشتیوانی هاوڕێم لای پوورم دەمێنمەوە.

لەبەر ئەوەی خەندە ماوەیەکی کەم بوو دایکی وەفاتی کردبوو، کارۆ نازی زۆر هەڵدەگرت لێیگەڕا لای ئەوان بمینێتەوە: باشە، با کچەکەشم تاکو

سبەینێ ئەمانەتی تۆ بێ.
کارۆ شەوێ کەوتە بن بارەکی خەمان: پاسداران بە هەموو کون و قوژبنەکاندا بە دوای ئاوارە کوردەکاندا دەگەڕێن، لێبوردنە گشتیەکەی ئێراق کۆتایی پێ بێ دەمانکەنە ئاردی ناو دڕکان و هەر یەکەمان بە لایەکیدا دەبەن.
ئەو شەوە هەور دەیگرماند، بروسک دەیتەقاندەوە، باران بە لێزمە دەهاتە خوارەوە، ئەو خیوەتەی کارۆی لە ناو بوو بە باشی چەسپ نەکرا بوو ئاو لە ژێریەوە دەهاتە ناوی، ژوورەوەی ببووە قوڕولیتە. کارۆ جانتا پڕ پارەکەی هەڵگرت و خۆی گەیاندە لێپرسراوی ئیدارەی ئۆردوگاکە، بە هەندێ پارە ڕازی کرد لە لیستی ناوەکانی ئۆردوگاکە بیسڕێتەوە، ئەو شەوە لە ئوتێلێکی شارەکە مایەوە بەڵام خەو نەدەچووە چاوەکانی هەر بیری دەکردەوە: بۆ ئەوەی کوڕەکەم بە دەست بێنم دەبێ داوای هاوسەرگیری لە (مامز)بکەم، بە هەر نرخێک بێ پێویستە ڕازی بکەم، ئەو کوڕە قۆزە بە تەواوی بە خۆم دەچی، ئەگەر بە زووترین کات وانەکەم لە دەستم دەردەچی.
چەند کاتژمێرێک نووست، خەونی بە (ئیبتیسام)ەوە بینی، لێی بووە زڕە خەو، هەستایەوە و خەوی لێنەکەوتەوە: ئیبتیسام ماوەیەکی کەمە کۆچی دوایی کردییە، زۆر ڕکیشی لە مامز دەبووەوە لەو دنیای بەتەمای منە و چاوەڕێم دەکا، نازانم چۆن پێکەوەیان بگونجێنم، بێ لەوەش لەم دنیایەی زۆر بەکەلکم هاتییە، ئەگەر ئەو نەبوایە من چۆن دەمتوانی ئەو لاف و گەزافەی لێبدەم، یەک جانتای پڕ پارەی ئەوم لە لایە، دەتوانم باشترین و خۆشترین ژیانی پێ بەسەر ببەم.
ئەو کارۆیەی پێشان نەمابوو، ئێستا مامۆستا کارۆ بوو، دەیتوانی پلان دابڕێژێ و بڕیاریش بدا. بەیانی خۆی تاس و لووس دا، لە باشترین و خاوێنترین چێشتخانە بە تامترین خواردنی کڕی، بۆ ماڵی مامزی برد، دوای نان خواردن کارۆ داوای لە مامز کرد لە لاچەپێک کۆببنەوە، کارۆ بە مامزی گوت: بەسەرهاتەکەی خۆتان و چارەنووسی (زەندی) خۆشەویستت بۆ تەواو نەکردم.
_ بۆت باس دەکەم، بەڵام تۆ ئەوەم پێ بڵێ، چۆن لە ناو حەسارەکەی بەغدا درۆت لەگەڵ مندا دەکرد، لەگەڵ ئەو ژنەی دەهاتە لات خۆتان

کردبووه خوشک و برا، کەچی بوونە خۆشەویست و هاوسەری یەکدی؟
_ منیش بۆت باس دەکەم، بەڵام ئێستا نا، ئەو کاتەی من و تۆ ئینشائەللا بۆ خۆشەویستیەکەی جاران دەگەڕێینەوە و بە خێر دەبینە هاوسەری یەکدی...کارۆ دڵی مامزی دایەوە.
بەڵام مامز دڵی ببووە کوچکە بەرد نەدەهاتە ڕایێ: دیارە تۆ وەکو گۆڕی پیاو چاکێک سەیرم دەکەی، هەر وەختێک پێویستیت پێم هەبوو دێیە لام بۆ ئەوەی نزاکانت بگەیەنم و لە نەخۆشییە دەروونییەکانت ڕزگار بی.
_ بە هەلە تێمەگە، سەرەڕای هەموو مەینەتیەکانمان من کوڕێکم لە تۆ هەیە.... کارۆ گوتی.
_ ئەگەر کوڕەکەت بە هی خۆت بزانیبوایە، بە دوای دایکیدا دەگەڕای تاکو دەتدۆزییەوە.
مامز بەبێ ئەوەی سەیری ڕوخساری بکا بە تووڕەییەوە بە کارۆ ی گوت: پێم وابوو تۆ پاڵەوانە ئاواتخوازەکەی منی، ئەگەرچی گوناهیش بوو، بەهاترین شوێنی جەستەی خۆم خستە بەر دەستی تۆ بۆ ئەوەی لە نەهامەتییەکانم ڕزگارم بکەی، کەچی تۆ شەرمنانە و ترسنۆکانە ڕەفتارت کرد، لە ناخۆشترین چرکەساتەکانی ژیانمدا بەجێت هێشتم.
مامز پرسی: تۆ منت خۆشویست؟ تۆ ویستت هاوسەرگیری لەگەڵ مندا بکەی؟ با هەر خۆم وەڵامت بدەمەوە، نەخێر هیچ کامێک لەوانەت نەویست. ئەوەی منی خۆشویست، ئەوەی ویستی هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکا، تەنهاو تەنها (زەندی) بوو. بەڵێ زەندی بوو، ئەو کوڕەی هەر لە منداڵیەوە منی خۆشدەویست و منیش خۆشم دەویست. لەو مەینەتییەی تۆ بەسەرمت داهێنا ئایا تۆ ڕزگارت کردم یان ئەو؟ لە کاتێکدا ئەو چاک دەیزانی ئەوەی لە هەناوی مندایە هی ئەونییە.
مامز چرکە لە دوای چرکە تووڕەتر دەبوو: بڕۆ بۆ خۆت بەدوای یەکێکی دیکەدا بگەڕێ هاوسەرگیری لەگەڵدا بکە. من ئەوە بیست ساڵە بە بێوەژن کۆشی ئەو کوڕەم گەورە کردییە، تازە بە تازە خۆت بە خاوەنی دەزانی؟ بە خۆشی بڕۆ هەتا بەناخۆشی دەرم نەکردی. ئەگەر کچەکەشت پێ بەخێو ناکرێ، با ئەویش لای من بێ بۆتی بەخێو دەکەم.
کارۆ جامێ پڕ ئاوی بۆ ڕاگرت: ها ئەو ئاوە بخۆوە کەمێک سارد دەبیەوە.

_ هەناوی پرئاگری من بەو ئاوە ناکوژێتەوە، ئەو ئاگرە چەندین ساڵ بوو دامرکابووەوە، تۆ هاتی تیلکت تێوەردا، داتگیرساندەوە، بڕۆ وازم لێبێنە.. مامز بە کارۆی گوت.
_ وازت لێناهێنم.. کارۆ ئەوەی گوت و ڕۆیشت.
سواری جێبەکەی خۆی بوو بە ناو گەڕەکەکانی شار بە دوای خانووێکی بە کرێ دا گەڕا، دۆزییەوەو پارەی پێشەکی یەک مانگی بە خاوەنەکەیدا، بۆ بەیانی پشتیوان و دایکی بە ئوتومبێلەکەی هەڵیگرتن و هەردووکیانی بردە ناو خانووەکە. بۆ دابینکردن و کڕینی کەلوپەل و خواردنیش هەندێ پارەی پێدان. (خەندە) شی وەک سنگەکەی مەلای مەشوور لەلای مامز هێشتەوە، بۆ نیوەڕۆ هەندێ خواردنی کڕی و ڕۆیشتەوە ماڵی مامز، جێبە لاندرۆڤەرەکەی لەبەر دەرگا ڕاگرت و لەدەرگای دا. (زەندی) کوڕەکەی (مامز) هاتە دەرەوە، چاوی بە جێبەکە کەوت حەپەسا: ئۆی مامە ئەو جێبە زۆر جوانە.
_ کوڕم ئەگەر پێت جوانە پیرۆزت بی.. کارۆ بە کوڕەکەی گوت.
نەباش نە خراپ کوڕە هیچ وەڵامێکی نەبوو، کارۆ ماچی کردو بە بنا گوێیدا چرپاندی: کە نانمان خوارد پیاسەیەکی دوو بە دوویی بەم جێبە دەکەین و بە ماوەی چەند ڕۆژێکیش فێری ئاژوانت دەکەم.
کارۆ دەیویست بە هەر شێوازێک بێت (زەندی) کوڕی دەستەمۆ بکات و تێی بگەیەنی کە ئەو باوکیەتی، دوای نان خواردن و حەسانەوە هەردووکیان سواری جێبەکە بوون و ڕۆیشتنە دەرەوە، کارۆ لێی پرسی: دایکت بە تۆی گوتبوو باوکت ناوی (کارۆ) یە، باشە تۆ لێت نەپرسی باوکم چی بەسەر هاتووە؟
_ بەڵێ پرسیم، ئەو گوتی: باوکت لە بەندیخانەیەکی بەغدا بەند کراوە.. زەندی بە کارۆی گوت.
کارۆ لێی پرسی: ئەدی نەتپرسی بۆ بەند کراوە؟
زەندی وەڵامی دایەوە: ئەو گوتی لەوێ ئەوی کوردبوایە دەیانگرت، کە باوکتیان گرت من ڕامکرد ئەگەرنا منیشیان لە بەندیخانە دەپەستا.
_ کێ دایکتی ڕزگار کردبوو؟ کارۆ لە زەندی پرسی.
زەندی گوتی: کە گەورە بووم و فامم کرد، دایکم دیار بوو زۆر بە شان

و باڵـی کوڕێکـی دا دەگۆت، ئـەو کـوڕە وەکـو مـن نـاوی (زەنـدی) بـووە، ئـەو کـوڕە زۆر ڕێـزی دایکمـی گرتـووە، ئـەو دەیگـۆ ئەگـەر ئـەو کـوڕە نەبوایـە مـن قـەت نەدەگەیشـتمە ئێـران.
_ نەیگوت ئەو کوڕە چی بەسـەرهات؟ کارۆ لە زەندی کوڕی پرسـی.
زەنـدی کـوڕی گوتـی: بەڵـێ، دایکمـی گەیاندبـووە ئێـران، دواتـر بـە دایکمـی گوتبـوو: مـن دەگەڕێمـەوە گوندەکـەی خۆمـان هەنـدێ تێکـەو لێکەم مایـە، ئەوانە تـەواو دەکـەم و پیـرە دایکیشـم لـە گـەڵ خۆمـدا دەهێنـم و زوو دەگەڕێمـەوە.
_ ئێی گەڕایەوە؟ کارۆ بە حەسرەتەوە لێی پرسـی.
زەنـدی کـوڕی کەمێـک دڵـی کارۆی خۆشـکرد: نەخێـر نەگەڕایـەوە. مامـە ئـەو چیرۆکـە دوورو درێـژە، بـەس بـۆت کـورت دەکەمـەوە. ئـەو کوڕە کـە دەگەڕێتەوە گوندەکـەی خۆیـان، دەبینـی دایکـی لـە مـاڵ نییـە، لـەم و لـەوی دەپرسـی، دەڵێـن: دوو ڕۆژ لەمەوبـەر چەنـد چەکدارێـک هاتـن و فڕاندیـان، کـەس نەیزانـی بـۆ کوێیـان بـرد. کـوڕەش ناچـار بـە دوای سـۆراخکردنی دایکیـدا دەڕوا، دیـارە جێیەکـی پـێ شـک دێ لـە بـۆ ئەوێیـان بردبـی، بـە دزی دەچێتـە ئـەو گوندەی کـە گومانـی لێـی هەبـووە، دەچێتـە ماڵـی ژن و پیاوێکـی ناسـیاوی لێیـان دەپرسـی، ئـەوان ڕاستیەکەی پێدەڵێـن. بەڵـێ ئـەوان ماڵێکـی بـۆ دەستنیشـان دەکـەن و دەڵێـن دایکـت لێـرە دەستبەسـەرە. کـوڕە شـێت و هـار دەبـی، لـە حەژمەتـی دایکـی خـەو و خۆراکـی نامینـێ، شـەوەکی خـۆی داوێتـە سـەر دیـواری ئـەو ماڵـە و لەسـەر دیـواری ئاودیـوی نـاو حەوشـەیان دەبـی، ئـەو ماڵـە سـەیەکی زۆر دڕیـان دەبـی، سـەیە دەکاتـە وەڕیـن و حەپـە حـەپ کـوڕە ئاشـکرا دەبـی، چـوار دەوری دەگـرن و دەنگـی دەدەن. کـوڕە تفەنگـی پێبـووە فیشـەکی دێخیتـە بـەرێ و باقەنەزمـەی ڕادەکێشـی و تفەنگـی سـوار دەکا، خـۆی دەداتـە پەناگەیـەک، بەسـەریاندا هـاوار دەکا: هەرچـی بێتـە پێـش فەراقـی لێدەبـڕم، ئـەوان ناوێـرن لێـی نزیـک ببنـەوە، هـەر لـە دووری یەکـدی دەبێتـە مشـت و مڕیـان، کـوڕە دەڵـێ دایکمتـان فڕانـدووە هـەر ئێسـتا دەمەوێتـەوە، ئـەوان فێڵبـاز بوونـە پێـی دەڵێـن دایکتمـان بـۆ چییـە، بـە ئـارەزووی خـۆی هاتیتـەوە گونـدی وەکـی ژنـە پاشـایان لێـرە دانیشـتییە، گوتمـان ئـەو دایـک و کـوڕە بەسـتەزمانە حەیامەکـی زۆرە لـە سـەر شـتەکی هیـچ غەدریـان لێکرایـە و ئـەو گوندەیـان بەجێهێشـتییە بـا بچیـن بیانگەڕێنینـەوە گوندەکـەی خۆیـان لـەم

لاو لەولا لە لای خەلکی بێگانە نەکەون. کەچی جەنابت هاتی بەو شێوەیە چاکەمان دەدەیەوە. ئەوان بەو قسە پان پانانە و کورەش ساویلکە بووە پێی بڕوا کردینە، لە ئەنجامی ئەو ساویلکەییە گرتیان و لە ژوورێکی تاریکیان پەستا، بە قنیات خواردن و خواردنەوەیان دەدایێ، لێیان دەدا وەرە (مامز) ت چ لێکردییە. کورە هاواری دەکرد: نازانم، ئاگام لێی نییە سوودی نەبوو، دوای چەند ڕۆژێک بە خۆی و تفەنگە بێ مۆڵەتەکەی درانە دەستی حکومەت، حکومەتیش حکومەتی خاوەن دەسەلاتەکانە، گوێ لە هەژارو لێقەوماوان ناگری، ڕووتەیەکی وەکی ئەو کورە بەستەزمانەی چی هەبووە بیداتە بەرتیلخۆرانی حکومەت، گرتیان و فرێیان دایە ناو بەندیخانە، چەند ساڵێک لە بەندیخانە مایەوە، شۆڕشی (١٤)ی تەموزی (١٩٥٨) ی بەسەرداهاتبوو، لێبوردنی گشتی گرتبوویەوە و ڕزگاری ببوو، مۆدیلی ئاغایانیش نەمابوو زولمی لێبکەن. کە لە بەندی ڕزگاری دەبی دەچێتەوە هەمان ئەو گوندەی دایکی لەوێ دەستبەسەر کرابوو، ئەو گوندەی کە دایکم و ئەو کورە بە ئەسل لەوێ لە دایک بوونە، تەماشا دەکا هیچ کامێک لەو پیاوانەی دایکیان فڕاندبوو لەوێ نەمانە، باریان کردییەو چوونە شاران، لە ترسی ئەو هەموو زولمەی لە خەلکیان کردییە خۆیان شاردیتەوە. ئەوە لە لایەک، لە لایەکی دیش دایکی گەڕایتەوە ئەو گوندەی سەر سنوور، ناچار ماوەیەک بە ئۆتومبێل و ماوەیەکیش بە پێیان دەگەڕێتەوە لای دایکی، بە هەر شێوازێک دەبێت دایکی ڕازی دەکا بڕۆنە ئێران، هەرچی هەیتیان دەیفرۆشن و سەلت و قولت هەردووکیان دەگەنە سەر سنوور، ئەو کاتەش نێوان ئێراق و ئێران تێکچووبوو، ئەو پەیماننامەیەی لە نێوانیاندا هەبوو هەڵوەشابووەوە، دیارە بە نەشارەزاییش ڕۆیشتبوون، پۆلیسی سەر سنووری ئێراقی دەیگرن، هەر ئەو گرتنە بوو ماوەیەکی زۆر بزر دەکرێ. دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٦١) شۆڕشی کورد لە کوردستانی ئێراق دەستپێدەکاو بەرە بەرە گەورە دەبی، لە ساڵی (١٩٦٣) بەعسیەکان کودەتا بەسەر (عەبدولکەریم قاسم) دا دەکەن، ئەو حکومەتە نوێیە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان دەکەوێتە گفتوگۆ، لێبوردن بۆ بەندکراوەکانی کورد دەردەچێت، یەکێک لەو کوردانەی لێبوردنەکە دەیگرێتەوە ئەو کورە (زەندی) دەبێت.. زەندی بە کەللەیەکی

زۆر گەرم لە بەندیخانە دەردەچێت، بڕیار دەدا تۆڵەی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەدانەی بکاتەوە، سۆراخ بە سۆراخ بە دوای ئەو پیاوە دەکەوێ کە بووەتە هۆکاری ئەو دەردەسەریانەی، بە هەرجۆرێک بێ دەمانچەیەک پەیدا دەکا، لە ئەنجامی ئەو گەڕان و سۆراخکردنەیدا لە بەغدا دەیدۆزێتەوە. شەوێک (زەندی) بەرەو بەغدا سەفەر دەکا بەیانی دەگاتە ئەوێ، بەڕێکەوت ئەو پیاوە تاوانبارەش دەیەوێ لە بەغداوە بگەڕێتەوە، زەندی لە گەراج دێتە دەرەوە بۆ ئەوەی تاکسیەک بە کرێ بگری، لەو کاتەشدا کابرا لە دەرەوەی گەراج دەیەوێ بڕواتە ناو گەراج، زەندی دەیناسیتەوە، بەیانیەکی زۆر زوو دەبی، خەلکێکی کەم لەو ناوەی دەبن، زەندی بە دەرفەتی دەزانی ناکاتە نامەردی دەیداتە بەر گوللان و هەر لەوێ تەواوی دەکا. کە دڵنیا دەبێ ئەو تەواو بووە دەیەوێ خۆی لە چاوی حکومەت بشاریتەوە، کەچی لە بەختی زەندی مەفرەزەیەکی نەژدە لەو ناوەی دەبی، دەنگی دەدەن بۆ ئەوەی خۆی بداتە دەست، بەڵام ئەو خۆی ناداتە دەستیان و بەرگری دەکا بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکا. لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان بە دوای دەکەون، چەند گوللەیەکی بەر لاق و لەتەرو هەناوی دەکەوی، ناتوانی زیاتر بڕواو فیشەکیشی تەواو دەبی، پۆلیسەکان دەگەنە سەری و هەڵیدەگرنەوە بۆ ئەوەی بیبەنە نەخۆشخانە، کەچی هەر لە ڕێگەی چوونیان بۆ نەخۆشخانە ئەویش تەواو دەبی.

هەرچەندە گێڕانەوەکەی (زەندی) کوڕی کارۆ زۆر درێژ بوو، بەڵام کارۆ نەیبڕی چونکە دەیویست بزانی ئایا ئەو کوڕەی (مامز) خۆشی دەویست لە ژیاندا ماوە یان نا. کە چارەنووسی ئەوی زانی پشیەکی هاتەوە بەرێ، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا بی، لێی پرسی: کێ ئەو هەموو زانیارانەی بە دایکت گەیاند؟

(زەندی)کوڕی پێی گوت: کە شۆڕشی کوردستان دەستیپێکرد، بە تایبەتیش لە ساڵی (١٩٦٣) بەدواوە، ئێران پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش باش بوو، سنووری خۆی بۆ پێشمەرگەو لێپرسراوان کردبووەوە، هاتوچۆ بە ئاسانی دەکرا، من و دایکم هاتینە ئەو دیوی سنووری لای ئێراق، هەر بەتایبەتیش چووینە ئەو گوندەی (زەندی) و دایکی لێ نیشتەجێ ببوون، واتە ئەو گوندەی لەسەر سنوور بوو. دایکی کوڕەکە لە ژیاندا مابوو بەڵام

زۆر پیر ببوو، لە خەفەتی کوڕەکەی چاویشی کز ببوو، کە چاوی بە دایکم کەوت دایکم قسەی بۆ کرد، ئەو لە باوەشی گرت و هەر ماچی دەکرد و دەیگۆ بۆنی کوڕە شیرینەکەمت لێدێ. بەڵێ دایکم ئەو هەموو زانیارانەی لەوی وەرگرت، دیاربوو دایکیشم زۆر خەفەتی خوارد و بە نا ئومێدی گەڕایەوە ئێران.
کارۆ دڵنیا بوو ئەو کوڕە لە ژیانی مامز دا نەماوە، هەروەک دەڵێن دڵی ئاوی خواردەوە، دڵی کوتە کوتیشی نەما، بۆیە تاک لایەنە بڕیاری دا: بە هەر نرخێک بێت دەبێ ئەم کوڕەم بە دەست بهێنمەوە، دەبمە خاوەنی کوڕێک و کچێک، لەبەر خاتری (ئیبتیسام) یش ناوی (زەندی) دەگۆڕم دەیکەمە (پشتیوان).بەڵام نهێنی ئەو گۆڕانکارییە لەلای مامز نادرکێنم.
کارۆ ئوتومبێلەکەی بردە لای لقە شەقامێکی قیرتاو نەکراو، کە زۆر بە کەمی ئوتومبێلی پێدا دەڕۆیشت. خۆی لە جێبەکە دابەزی، بە (زەندی) کوڕی گوت: فەرموو وەرە جێگای من.
_ چی بکەم؟ زەندی پرسی.
_ بازۆ.. کارۆی باوکی گوتی.
_ چۆن بازۆم نازانم !!...زەندی گوتی.
بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو کوڕە و فێرکردنی ئاژوانی ئوتومبێل، ئەو ڕۆژەش ڕۆیشت، لە ڕێگەی گەڕانەوەیاندا کارۆ لە زەندی کوڕی پرسی: دیارە زۆر حەزت لە ئوتومێلە؟
زەندی بە پەرۆشیەوە گوتی: زۆر زۆر، بەس چی بکەم پارەمان نییە.
_ ئەگەر پارەت هەبوو جێبی پێدەکڕی، یان هاوسەرگیری پێدەکەی؟ کارۆ ویستی تاقی بکاتەوە.
_ من جێبەکەم پێ باشترە، وردە وردە کاسبی پێوە دەکەم و پارەی ژنەکی پێپەیدا دەکەم.
کارۆ تێیگەیشت حەزی لەهەردووکیان هەیە، بەڵام کاتەکە درەنگ بوو، ئەو پلانەی دایڕشتبوو بۆ کاتێکی دی هێشتیەوە. ئەو ئێوارەیەش کارۆ خواردنی بۆ بردنەوە وپێکەوە نانەکەیان خوارد، دوای نان خواردن کارۆ بەر لەوەی بەرەو ئوتێلەکە بڕوا تێیگەیاندن کە خواردنی بەیانیان بۆ دەهێنی.
ماوەیەک بەو جۆرە کارۆ (بەهۆی سنگیکی مەلای مەشوور- واتە: خەندە)

خواردنی هەرسێ ژەمی بۆ دەبردن و لەگەڵ (زەندی) کوریشی پێکەوە دەچوونە دەرەوە، هەم فێرە ئاژوانی دەکرد و هەم هەموو نهێنیەکانی ناو گیرفانەکانی مێشکی زەندی بەرە بەرە دەردەهێنا و لە بەرژەوەندی خۆی بەکاری دەهێنان. لە هەمان کاتیشدا (مامز) ئەگەرچی لە گفتوگۆیەکانی نێوان خۆی و کارۆ دا جۆرە لاملیەکی پێوە دیار بوو، بەڵام ژێر بە ژێری بە هەموو هێزیەوە (خەندە) ی دەلاواندەوە و بەسەر خۆیدا دەیباناندەوە، ئەویش هەموو ئەو نهێنیانەی لەو کچە دەردەهێنا کە دەربارەی دایک و باوکی دەیزانی.

زیاتر لە دوو هەفتەی پێچوو بوو، زەندی زانیاریەکانی ئاژوانی ئوتومبێل فێر ببوو، کارۆ ئەو ڕۆژەی بە چارەنووسساز دانا بوو، بە زەندی کوڕی گوت: تۆ حەزت لێیە ئوتومبێلت هەبێ، ئەوەی ئوتومبێل باژوا دەبێ مۆڵەتی لێخوڕینی هەبێ، مۆڵەتی لێخوڕینیش بەبێ ناسنامەی باری شارستانی دەرناهێندرێ، لە هەمان کاتیشدابەبێ ئەو ناسنامەیە هاوسەرگیریش ناکرێ.

زەندی وەک ئەوەی دارێکی لە ڕۆحی درابێت، خەم بەسەریدا باری، هەر بە مەلوولی و خەمباریەوەش پرسی: چۆن وایە؟

_ ئەدی چۆن وانییە؟ لەهەر وڵاتێکی ئەم دنیایە بەم جۆرەیە..کارۆ بە زەندی کوڕی گوت.

یەکجاری خەفەت چۆکی نوشتاندەوە و نائومێدی خواردییەوە: کەواتە بچم گۆڕێک بۆ خۆم هەڵکەنم و بچمە ناوی.

کارۆ کوڕەی خستە باوەشی خۆی ماچی کرد، چیرۆکی ژیانی خۆی- هەر لەسەری هەتا بنی- بۆ گێڕایەوە و لە کۆتاییدا پێی گوت: خەمێ مەخۆ،بۆ گەیشتن بە مرازەکانت خودا بە خۆی ئامرازت بۆ دەڕەخسێنی. هەروەک چۆن بۆ منی ڕەخساند، بە پشتیوانی خودا منیش بۆ تۆ دەبمە ئەو ئامرازە و ئاسانکاریت بۆ دەکەم. مەترسە من هەموو شتێکت بۆ دەکەم.

زەندی کوڕی بە نائومێدی گوتی: تۆ هیچ شتێکت پێناکرێ، چونکە دایکم پێی دەگوتم زۆر زەحمەتە، دەبێ دوو شایەد دەست بە قورئان دا بدەن و بڵێن باوکت مردووە، کەسیش نایێ ئەو جۆرە شایەدییەی بە درۆ بدا، چونکە بە قسەی دایکم بێ، باوکم نەمردووە.

کارۆ ئومێدی پێبەخشی: بەڵێ دایکت ڕاست دەکا، باوکت نەمردووە، من

بۆت دەیدۆزمەوە.
زەندی ڕوخساری گەشایەوە، بە پەرۆشییەوە بە کارۆ ی گوت: چۆن دەیدۆزییەوە، ئەو لە بەندیخانە ڕزگار بووە؟
کارۆ سەری بۆ لەقاندەوە:بەڵێ ڕزگار بووە و لە ژیانیشدا ماوە، دائیرەی نفوسیشی لە شاری هەولێرە.
زەندی لە خۆشییان وەختبوو باڵ بگری و بەرەو هەولێر بفڕێ: مامە گیان چۆن بگەمە هەولێر؟
کارۆ بە زەندی کوڕی گوت: پەلەی مەکە کوڕم، جارێ بڕۆ ئەو زانیاریانەی من پێم دای بە دایکتی بدەو پێی بڵێ: من لەگەڵ مامە کارۆی دەچمە هەولێرێ، لەوێ باوکم دەدۆزمەوە و هاوسەرگیری دەکەم، بزانە دایکت چی دەڵێ؟
(زەندی) لەو بینەو بەردەی نێوان خۆی و کارۆی باوکی، هەندێ لە ئاماژەکان بەرە بەرە لەلای ڕوون دەبوونەوە و دەبوونە جێگەی تێڕامان و پرسیار لە خۆ کردن. ئەو زۆرخۆ نزیک کردنەوەی کارۆ، ئەو هەموو خۆ هیلاک کردنەی، ئەو هەموو خەرجییە و گرنگیدانەی، لەلای (زەندی) نیشانەی سەرسوڕمان بوون، ئەو لە کردەوەکانی کارۆ ڕادەماو لە خۆی دەپرسی: ئەو پیاوە بۆ دەبێ وا بکا؟. ئەو پیاوە ناوی (کارۆ) یە، باوکیشم ناوی (کارۆ)یە، ئەو ناوە زۆر بە کەمی هەیە، لەوانەیە ڕێکەوت بێ و لەوانەشە وانەبێ. دایکم دەیگوت: باوکت خەلکی گوندێکی سەر بە شاری هەولێرە، بەڵام لە منداڵییەوە کەوتۆتە شاری بەغدا. هەروەها دایکم زۆر جار ئەو خەسلەتانەی بۆ باس دەکردم کە لە باوکمدا هەبوون، هەندێکیان سەدا سەد لەو پیاوەیدا هەیە.
(زەندی) ماوەی چەند ڕۆژێک زۆر بیری دەکردەوە، قسەکانی مامۆستا کارۆ زۆر کاریگەرییان لێکردبوو، بەڵام چاک دەیزانی هەرچەندە ئەو قسانە بە دایکی بڵێ سوودی نابێ، بۆیە بیری لەوە کردەوە شانۆگەرییەک ڕێک بخا. زۆر بە خەمباری و مەلوولییەوە گەڕایەوە ماڵەوە، لە ماڵەوەش خۆی لە کەس نەدەگەیاند، ورتەی لە دەوی دەرنەدەهات، خواردنی زۆر کەم کردەوە. دایکی هەرچەندە بانگی دەکرد ئەو وەڵامی نەدەدایەوە، هەرچەندە دەیدواند ئەو گوێی بۆ ڕانەدەگرت.

دایکیشی ژنێکی وردبین بوو، پێشبینی ئەو کارەی دەکرد، بیری لە مەبەستی کارۆ دەکردەوە، دەیزانی ئەوەندە هاتوچۆیەی لە پای چییە و بۆ بەدەوری (زەندی) دا دەگەڕێ و دەسووڕێ، بەڵام نەیدەزانی دەگاتە ئەو ڕادەیەی کوڕەکەی مەلوول و خەمبار بکا.
مامز تۆقرەی نەما، بە دوای سەرە داوی خەمباربوونی کوڕەکەیدا گەڕا، یەکەم جار لە (زەندی)یەوە دەستیپێکرد: زەندی گیان هەرچەندە تۆ گەورە بووی و پێویستیت بە ئامۆژگاری من نەمایە، بەڵام هەست دەکەم چەند ڕۆژێکە گۆڕاوی، ئەگەر هەر گرفتێکت هەیە لە دایکتی مەشارەوە، نەک هەر وەک دایک و کوڕ، بەلکو وەکو دوو هاوڕێ پێکەوە دادەنیشین و چارەی دەکەین.
هەرچەندە مامز کردی و ڕستی و قسەی کرد، کوڕە لێوی نەبزوفت و ئەرقومی نەکرد. مامز ناچار بوو بڕیار بدا خۆی بگەیەنێتە (کارۆ). دوای خواردنی ئێوارەی ئەو ڕۆژە، کارۆ هەروەکو ئێوارەکانی دی کە خواردنی تەواو کرد خواحافیزی خواست، بەڵام مامز ئەو جارە وەکو ئێوارەکانی دی نەبوو، جیاواز لە هەڵسوکەوتەکانی پێشتری هەتا دەرگای دەرەوە بەگەڵ کارۆ کەوت، لەو بەینە پێی گوت: دەمەوێ پێکەوە قسە بکەین.
کارۆ قسەکەی پێخۆش بوو: لە کوێ؟
مامز بە کارۆی گوت: ئەم شەو لێرە بمینێوە.
کارۆ گرانی فرۆشت: سوپاس دەڕۆمەوە ئوتێل.
مامز هەرچەندە بەسەر خۆیدا شکایەوە، بەڵام نەرمی نواند: عەبرەم لەبەر کوڕەکەمان، ئەگەر نا ئەو ئەرکەت ناخەمە سەر.
کارۆ تێگەیشت لە ئامانجەکەی نزیک بووەتەوە، ئەویش نەرمی نواند: باشە لەبەر خاتری کوڕەکەمان دەمێنمەوە.
کارۆ بانگی (زەندی) کرد، سویچی جێبەکەو هەندێ پارەی بۆ ڕاگرت: زەندی گیان ها بگرە (خەندە)ش لەگەڵە خۆت ببە، هەم پیاسەیەکی ناو بازاڕی بکەن و هەمیش کە گەڕانەوە هەندێ میوە و برێشکە بکڕن ئەم شەو خۆمانی پێوە خەریک بکەین، بەڵام ئاگاداری خۆت بە و لە پۆلیسی هاتوچۆش نزیک مەبەوە.
مامزو کارۆ، دوای بیست ساڵ دابڕان، بۆ یەکەم جار بەو شێوەیە پێکەوە

دانیشـتن، عـەرش و قورشـیان باسـکرد، بەتایبەتـی شـەوە خۆشـەکانی نـاو حەسارەکەی بەغدا، ڕۆژو شەوە ناخۆشـەکانی مامـز لـە دوای دابـڕان، ژیـان و گوزەرانـە کوڵەمەرگییەکانـی خـۆی و کوڕەکـەی لـە ئێـران. زۆر قسـەیان کـرد، لـە میانـەی قسـەکانیاندا هەندێ جار نەرمـی و جـار جارەش ڕەقییـان دەنوانـد، هەتـا کار گەیشـتە سـەر ئـەوەی مامـز بـە کارۆی گـوت: کوڕەکـەم لەوەتـی لـە گـەڵ تـۆدا دەگـەڕێ و دەسـووڕێتەوە عەقلـی تێکچـووە، بمزانیبوایـە وادەکـەی نەمدەهێشـت نزیکـی ببیەوە.تـۆ ڕەنـگ و بـۆ و هەڵسـوکەوتیت بینیـوە چـی بەسـەر هاتـووە؟
بـە نیمچـە تووڕەییـەوە کارۆ ش بـە مامـز ی گـوت: بەڵـێ بینیومـە، ئـەو بـە زانیارییـە هەڵەکانی تـۆ عەقلـی تێکچـووە، مـن خـەریکم بـەرە بـەرە دەیهێنمـەوە سـەر ڕێگـەی ڕاسـت. ئەگـەر عەقلیشـی تێکچووبـێ هـۆکاری دیکـەی هەیـە، مـن نیـم. کارۆ پرسـی: عاشـقی هیـچ کچێـک نەبـووە؟
_ بەڵـێ بووە ... مامز گوتی.
_ کەواتـە بـۆی بخـوازە، ئـەو گەورە بووە ژنی دەوێ.. وای بە مامز گوت.
مامـز تێگەیشـت کارۆ تیـخ تیخـەی داوە، بۆیـە بـە تونـدی گوتـی: چـۆن بیخـوازم؟ هیـچ بەڵگەنامەیەکـی نییـە قـازی لەسـەری مـارەی بـکات.
کارۆ بە پێکەنینەوە گوتی: ئاسانە ئەگەر تۆ بڕیار بدەی؟
مامـز زانـی مەبەسـتی کارۆ ی چییـە، بـەڵام پرسـی: بڕیـاری چـی بدەم خۆمـن قـازی نیـم.
کارۆ- هـەروەک گوتویانـە- بـۆی لەبنـی کـودی دا، بـە تـەواوی تێیگەیانـد: مـن نامـەوێ لـە وڵاتێکـدا بژیـم کـە ئێمـەی فرۆشـت، هەتـا لێبـوردن هەیـە دەگەڕێینـەوە هەولێـر، لـەوێ پارێزەرێـک بەکـرێ دەگـرم هەمـوو کاروبارەکانـی دەرهێنانـی ناسـنامە و مارەبڕینـی مـن و تـۆ تـەواو بـکا، ئێسـتا داخـوازی کچـە بـۆ کوڕەکەمـان دەکەیـن، داوای هەرچیمـان لێبکـەن ناڵێیـن نـا، لێـرە مـارەی ناکەیـن، کچـە لەگـەڵ خۆمـان دەبەیـن، دوای تەواوبوونـی کارە یاساییەکان لـە هەولێـر لـە یەکدییـان مـارە دەکەیـن.
مامـز ڕووی لەلایەکـی دی کـرد، هەر بـە تووڕەیی بە کورتی پێی گوت: نابێ.
_ بۆ نابێ کەسـی دی لە ژیانتدا هەیە؟
نەخێـر نییـە، بـەڵام مێـرد بـە یەکێـک ناکـەم منـی خـۆش نـەوێ، تـۆ لەبـەر

خاتری کوڕەکەت دەمکەیە هاوسەری خۆت.
_ کۆنە کایان بە با مەکەوە، با لەبەر خاتری کوڕەکەشمان بێ، بێگومان بۆ دروست بوونی پەیوەندی خۆشەویستی دەبێ هۆکارێک بڕەخسێ. ئەگەر هەر لەسەر لاملیەکەشت بەردەوام دەبی، من هەموو شتێک بۆ کوڕەکەم ئاشکرا دەکەم، دواتریش بەگەڵ خۆمی دەدەم و دەیبەمە هەولێر، لەوێ لەسەر ناوی خۆم تۆماری دەکەم، تۆش هەر یالێلی بانگ بکە.
مامز ئەگەرچی حەزی دەکرد و نازی دەکرد، بەڵام بەو قسەیە ژانی گرت، چونکە زانی کار لە کار ترازاوە و بەو چەند ڕۆژە کارۆ توانیەتی سەرنج وخۆشەویستی زەندی بۆ خۆی ڕابکێشی، ناچار نەرمی نواند: چۆن زەندی تێدەگەیەنی کە تۆ باوکی ئەوی؟
ئەگەرچی ڕازیکردنی (زەندی) و (خەندە) کاتی دەویست، بەڵام هەردووکیان (مامز) و (کارۆ) پێکەوە هەنگاویان هاوێشت، هەنگاوەکانیشیان بۆ یەک مەبەست کرد بە یەک. مامز خەریکی باناندنەوەی (خەندە) بوو، خۆشەویستی بەسەردا باراند، کارۆش لە بزن و مەڕو کارو بەرخان فێرە باناندنەوە ببوو، لە ماوەیەکی کەم دا توانی (زەندی) وا لێبکا پێی بڵێ
- باوکە.
هەرپێنجیان وەکو هەزاران خەلکی دیکە خۆیان گەیاندە مەرزی سەر سنووری نێوان ئێران و ئێراق، خۆیان ڕادەستی حکومەتی ئێراق کردەوە، لەوێ دوای ئەوەی سرەیان گەیشتێ هەندێ لێکۆڵینەوەیان لە گەڵدا کردن، ویستیان گرفتێک بۆ (زەندی)و کچە دەستگیرانەکەی دروست بکەن، بەڵام مامۆستا کارۆ لێپرسراوەکەی ئەوێی بەهەندێ پارە ڕازی کرد و دەرباز بوون. کارۆ ئەو پلانانەی لەزەینی خۆی دا دایڕشتبوون بە هێمنی و یەک لە دوای یەک جێبەجێی دەکردن، سەرەتا کاروباری گەڕانەوەی خۆی بۆ سەر پیشەی جارانی جێبەجێ کرد، دواتر پارێزەرێکی ڕاسپارد بۆ ئەوەی هەموو ئیش و کارەکانیان بۆ جێبەجێ بکات. دوای ماوەیەکی کەم مامزو کارۆ بوونە هاوسەری ڕەسمی و خاوەنی کوڕێک و کچێک. (زەندی) یش لەسەر پێشنیاری (کارۆ) و بەڕەزامەندی (مامز) ناوی گۆڕا بووە (پشتیوان).
(پشتیوان) و کچە کوردە ئێرانیەکەشیان - بە پینە و پەڕۆی پارێزەرەکە - لەلای قازی لە یەکدی مارە کرد.

کارۆ هەرچەندە ببووە خاوەنی ژن و منداڵێکی دیکە بەڵام (ئیبتیسام) لەناو گۆڕیشدا شوێنێکی تایبەتی مەزنی لە ناو دڵی دا هەبوو. دوای جێگیربوونیان بەتەواوی لە هەولێر و سەردانی کردنی گوندەکەی خۆیان و ئاگادارکردنەوەی کەسو کارەکەی لەو ژیانە نوێیەی، جوانە گایەکیشی بۆ ئیبتیسام کردە خێر، هەر لەو ماوەیەشدا هەموویان پێکرا گەشتێکیان بۆ نەجەف و کەربەلا کرد، سەردانی گۆڕی دایکی خەندەیان کرد. لە گەڕانەوەشیاندا لەسەر پێشنیاری مامۆستا کارۆ، شەوێک لە بەغدا مانەوە، کارۆ سەردانی مەلای مزگەوتەکەی کرد، مەلا و کارۆ دوو بە دوو پێکەوە دانیشتن، باسی چەندین بابەتی کۆن و نوێیان کرد، مامۆستا کارۆ بە مەلای گوت:

_ مامۆستا گیان ئەوە خودا لەو مەینەتییانە ڕزگاری کردی، وەکو من لە یادی بکەوژیانێکی نوێ دەست پێبکە.

مەلا ئاخێکی قووڵی بەرەو هەناوی شۆڕکردەوە: برا، ژیانی من هەر ئەو مەینەتییە نییە کە تۆ دەیزانی، زۆر لەوەی گەورەترە، ناخم پڕە. بەر لەوەی ئەو بەدڕەوشتانە بمخەنە بەندیخانە ئاگرێک لە هەناوم بەر ببوو، هەمیشە کەڵلەی دەکردمە مەنجەڵی ساواری و مێشکی دەکوڵاندم، دەوم بۆ هەر کانیاوێک دەبرد ئەو ئاگرەی پێ بکوژێنمەوە وشک دەبوو، دەستم بۆ هەر پنچکێک دەبرد پێوەی سەرکەوم، پنچک لە بن و بۆتکەوە هەڵدەکێشرا. ئاگردانە کوێربووەکەی من کوژاوەتەوە و گەرمایی تێدا نەماوە، تازە زەحمەتە بە پفان داگیرسێتەوە - ئەوەی من پێی بڵێم ماشەللا تەنها چەند ڕۆژێک لە ژیاندا دەمینێتەوە- با شتێکت بۆ باس بکەم هەتا ئێستا لە تۆم شاردبووەوە، بێگومان لە بیرتە ئەوەندەی لەلام بووی من دوو جار سەفەرم کرد و مزگەوتم بە تەمای تۆ بەجێهێشت، هەروەها (حەجییە فەتحییە) شت لە یاد ماوە، سەفەری دووەمم بە پێشنیاری ئەو بوو. من زۆر چاکەی (حەجی کەرەم) ی هاوسەریم لەبەر چاو بوو، دوای کۆچی ئەو پیاوەش چاکەکانی ئەو بێوەژنەش لە ئەندازە دەرچووبوون، دڵیم نەشکاند و پێنیشارەکەیم پەسند کرد، کە بەتۆم گوت دەچم دوعای بۆ دەنووسم، لە جیاتی دوعانووسین هەر ئەو دەمە بۆ زیارەتی (نەجەف) و (کەربەلا) بەڕێکەوتین، دوای چوار شەوو چوار ڕۆژ مانەوەمان لەوێ بڕیاری هاوسەرگیریمان بە یەکدی دا، بە بۆچوونی خۆم ئەو بەدبەختییەی لە

ناوچەوانم نووسراوە خودا دەیسڕێتەوە و بە هۆی جوانی و قەشەنگی و زیرەکی و لێهاتوویی ئەو بێوەژنە و پەرۆشیم بۆ ئەو دوو منداڵە جوانکەڵەیە، لە جیاتی ئەم بەدبەختییەم بەختەوەریم بۆ دەنووسی، کەچی وا دەرنەچوو، ڕەشەبای بەدبەختییەکەی من، چرای بەختەوەرییەکەی (فەتحییە) شی کوژاندەوە.

سەری بۆ کارۆ بەرز کردەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا: دەبڵێ چۆن؟

_ چۆن؟ بە سەرسوڕمانەوە کارۆ پرسی.

_ ئەو کاتەی کە باسم کرد، بە پێی شەرعی خواو سوننەتی پێغەمبەری ئەو بێوەژنەم مارە نەکرد بوو، بەڵام هەردووکمان بە قەناعەت بەڵێنمان بە یەکدی دا، ئەوە کۆتا بڕیاریشمان بوو. ئەوە بوو هەر دوای چەند ڕۆژێک من دەستگیر کرام و ماوەی چەند ساڵێک لە بەندیخانە مامەوە، ماوەی ئەو چەند ساڵەش دەنگ و باسی ئەوم نەدەزانی، کە لە دوای شۆڕشی چواردەی تەممووزیش ئازاد کرام، ماوەی یەک ساڵ لە نەخۆشخانان کەوتم، هەر لە نەخۆشخانە بووم جارێکی دی بە گرتنیان دام، ئەو جاریش ماوەی ساڵێکی دی گیرام، تاکو ئەو کاتەی تۆ منت لە تاقیکردنەوەکە بینی و ئەو ڕۆژەش سەر لە نوێ بەندکرامەوە، بەو جۆرە ڕۆژەکی خۆشم نەدیت، یان لە بەندیخانە یانیش لە نەخۆشخانە بووم.

مەلا پەرداخێک ئاوی خواردەوە، کارۆ ش بۆی تەواو کرد: هەتا ئەو ڕۆژەی لە دەست ئەو چەتانە هەڵاتی و خۆت گەیاندە من.

مەلا بەردەوام بوو: بەڵێ وایە، بەڵام چیرۆکی من و (فەتحییە) تەواو نەبووە. ئەو چیرۆکەش بەشێکە لە ژیانی پڕ کۆڵەمەرگی و مەرگەساتی من، پێم وابوو لەمەو دوا مەینەتییەکانم کۆتاییان پێدێت و لەو بارو دۆخە گونجاوەشدا دەتوانم پڕۆژەی هاوسەرگیری نێوان خۆم و فەتحییەش تەواو دەکەم، بەو ئاواتەوە بۆ هەمان مزگەوتی پێشووم گەڕامەوە، کەچی من لە خەیاڵێک و ناوچەوانیشم ڕووی لەلایەکی دی. هەر ئەو ڕۆژەی گەڕامەوە بەر لە هەموو کارێکم بەرەو ماڵی فەتحییە ڕۆیشتم، ماڵێکی خاڵی کەسی تێدا نەما بوو. پرسیارم کرد، خۆزگە نەمکردبا، بەڵام داری هیوا بە خۆزگان ناڕوێ.

خەفەت ئەوکی مەلای گرت نوتقی بڕا، کارۆ لێی پرسی: مامۆستا لە

شـوێنی خـۆی بـاری کردبـوو؟
مـەلا بـە خەمبارییـەوە، وەڵامـی کارۆی دایـەوە: خۆزگـە هـەر بارکـردن بوایـە. حکومـەت بۆ ئێران نەفـی کردبـوو، هـەر ئـەو نـا دەیـانماڵـی وەکـو ئەویـان بـەرەو ئێـران دەربـەدەر کردبـوو گوایـە ڕەگەزنامـەی ئێراقییـان نییـە.
_ مامۆسـتا متمانەکـردن بـەو حکومەتـە- حاشـا لـە جەنابـت- گەمژەییـە.. کارۆ گوتـی.
مـەلا لـە خەفەتـان پێکەنـی، هـەر بـە پێکەنینیـش بـە کارۆی گـوت: وەڵا بـرا چ حاشـای نـاوێ، ئـەوەی متمانـە بـەو دڕندانـە بـکا نـەک گەمژەیـە، هـەر کەریشـە. ئێسـتا لـە هەمـوو ئـەو بەڵێنانـە پەشـێمان بووینـەوە کـە پێیـان دام، دوو ڕۆژ لـە مەوبـەر فەرمانـی کارگێڕی دامەزراندنـی مەلایەکیـان بـۆ ئـەم مزگەوتـە بـۆ هێنـاوم، دەبـێ لـە مـاوەی چەنـد ڕۆژێکـدا بـۆی بەجـێ بهێڵـم، لەوانەشـە هـەر بـەو دەرکردنـەی وازم لـێ نەهێنـن.
کارۆ خەمـی بـۆ مـەلای خـوارد بـەڵام هیچی لـە دەسـت نەدەهـات، تەنیـا توانـی دڵـی بداتــەوەو ناوونیشـانی خـۆی بـە تــەواوی لـە پارچـە کاغـەزێ بنووسـی و بیداتێ:فەرمـوو مامۆسـتا، ئەگـەر هاتـی بـۆ هەولێـر ئـەوە ناونیشـانی منـە، هەردەبـێ سـەردانم بکـەی.
بـۆ بەیانـی کارۆ و مامـزو کـچ و کـوڕو بووکەکەیـان لـە بەغـداوە بـەرەو هەولێـر گەڕانـەوە.
هەرچەنـدە شۆڕشـی ئەیلـول شکسـتی پێهێنـرا بـوو، بزوتنـەوەی چەکداریـش کۆتایـی هاتبـوو، بـەڵام جموجولـی سیاسـییانە لـە مێشـک و دڵـی خەڵکـی کوردپـەروەرو نیشتمانپەروەربەردەوام بـوو. بـەرە بـەرە ڕێکخستنەکانی ناوشـار دەبووژانـەوە، هەتـا کار گەیشـتە ئـەوەی جولانـەوەی چەکداریـش لـە هەمـوو شـوێنەکانی کوردسـتان دەسـتپێکردەوە.ئەو گۆڕانکارییـەی لـە نـاو دەسـەڵات و حکومەتـی ئێرانیـش لـە سـاڵی ١٩٧٩ ڕوویـدا هۆکارێکـی گرنـگ بـوو بـۆ زیاتـر گەشـەکردنی ئـەو شۆڕشـە سیاسـی و چەکدارییەنوێیـە، چونکـە لـەوێ شـا ڕووخـا و ڕێکەوتننامـەی جەزائیریـش لەلایـەن سـەرکۆماری ئێـراق (سـەدام) ەوە هەڵوەشـێنرایەوە. ئیتـر ڕۆیشـتنە نـاو ئێـران و هاتوچـۆ بـۆ کـوردی ئێـراق لـە پێشـان ئاسـانتر بـوو. (کارۆ)ش ئێراقـی لـێ ببـووە دۆزەخ، ئاگـری شـەڕی نێـوان ئـەو دوو وڵاتـە هەڵگیرسـێندرا بـوو، دارو پەردوەکەشـی خەڵکـی بێچارەی

هەردوولا بوو. لە ئێراق سەرەڕای عەسکەری، خەلکیان بە زۆرەملی بە ناوی (جەیشی شەعبی) دەگرت و بە لۆرییان ڕەوانەی بەرەکانی شەڕیان دەکردن. کارۆ بیری لە ڕزگارکردنی خۆی و ژن و منداڵەکانی دەکردەوە. ئەو جێبەی خۆی کە دابوویە کوڕەکەی فرۆشتی، بە پارەی ئەو جێبە لاندرۆڤەرە و هەندێ لەو پارەیەی لە فرۆشتنی ماڵ و مولکی (ئیبتیسام) بۆی مابووەوە، پێنج پاسەپۆرتی ساختەی پەیدا کرد و لە ڕێگای ئێرانەوە خۆیان گەیاندە ئەورووپا.
دوای ئەو هەموو ڕۆژو شەوە هیلاکییەم دەمویست بڵێم- کراشم دڕا هیچم پێنەبڕا- کەچی هاوڕێکانم، ئەوانەی لە سەرەتای چیرۆکەکە گوێیان بۆ شل کردبووم، پێیان وا بوو چیرۆکە درێژەکە کۆتایی نەهاتووە، یەکێکیان پرسی: تۆ کارۆی بەختەوەرت بە خۆشییەکانی ئەورووپا سپارد، کەچی چارەنووسی (مەلا)ت بە نهێنی هێشتەوە.
زۆر لێیان پاڕامەوە وازم لێبهێنن، سوودی نەبوو، ناچار بووم بەوە ڕازییان بکەم، بەچەند دێڕێک دەربارەی مەلا کۆتایی بە چیرۆکەکە بهێنم. دانیشتمەوە، ئەوانیش دیسان وەکو یەکەم جاری دەستپێکردنم بە چیرۆکەکە، ژیرانە و بە هێمنی بەرامبەرم دانیشتن. سەرەتا پێم گوتن: من لەو چەند ساڵەی دوایی بەرزی و نزمی ئاستی ژیان و گوزەرانی (مەلا) ی بازدەدەم، تەنها ئەوەتان بۆ باس دەکەم کە ئەمڕۆ تێیدا دەژی. ئەوان ورتەیان لێوە نەهات هەر خواخوایان بوو شتێکم لێ هەڵبکرێنن. پێم گوتن: مەلا ئێستاش لە ژیاندا ماوە، بەڵام تەواو پیر بووە، پیرێکی ڕوح سووک نەک ڕەزا قورس، لەبەر ئەو هەموو نەهامەتییانەی لە ژیانیدا چەشتویەتی، نەک هەر لە بەغدا، لە هەموو شارەکانی ئێراق و کوردستان ناسراوە و پێگەو قورسایی و کەسایەتی خۆی ماوە و ڕێزی لێدەگیرێ، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە- زیاتر لە تەمەنی خۆی- چورچ و لۆچی بە ڕوخسارییەوە دیارە، ئەوەی چەورایەتی بێ پێوەی نەمایە، بە هاوکاری خەلکی دیکە ژیانی دەگوزەرێنی، خەلکی ئەم زەمانەش وەفاییەکەی جارانیان نەماوە، هەتا خزم و بەرەبابی خۆشی لێی دوور دەکەونەوە.

خەلك تێکدە قژقژان، شەقامی هاملتۆن پڕ سوارو پیادە بوو، بە پانتایی شەقامەکە و زیاتریش هەر بابایە پەلی منداڵەکانی گرتبوو، بەرەو هات و نەهات، بەرەو چارەنووسێکی نادیار، بەرەو وڵاتێك دەرۆیشتن کە سەرچاوەی مەرگەساتییەکە بوو، کە لە شکست و هەرەسهێنانەکە لایەنی سەرەکی بوو.. باسی رۆژی حەشرو پردی سیرات دەکەن لەو چەشنە بوو، خەلکی برسی، تینوو، بێ سەر، بێ رێنیشاندەر، بێ فەرماندە، بێ سەرکردە، بە بێ هیوا، بە گریان، بە رۆ رۆ، بە لاکە لاك دەرۆیشتن. پێیەك لە پێش دوو لە پاش نەیان دەزانی بۆ کوێ برۆن. راستیان دەبیست، درۆیان دەبیست، باوەرو متمانە لەو دەڤەرە باری کردبوو... چەك فرێدەدرا، چەك دەشکێندرا، چەك لە یەکدی رادەکێشرا، چەك لوولەی لە خۆ دەکرا، چەك باوی نەدەما، برنۆیەك بە یەك جغارە دەفرۆشرا، کلاشینکۆف و سەمینۆف ببوونە پەرۆ بەگوو .....



رۆمان

# زامەکان دەکولێنەوە

بەهرام محەمەد

هەولێر ٢٠١٨





چاپخانەی رۆشنبیری

٤٠٠٠ دینار